

حكومەتی هەرێمی کوردستان
وەزارەتی رۆشنبیری
بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی چاپ و بڵاوکردنەوە
زنجیرە (٨)





# بەسەرهاتی سیاسی کورد

لە ١٩١٤ وە هەتا ١٩٥٨

یاداشتەکانی

میرزا محمد أمین مەنگوری

بەشی دووهەم

سلێمانی ٢٠٠١



حکومەتی هەرێمی کوردستان
وەزارەتی ڕۆشنبیری
بەڕێوەبەرێتیی گشتیی چاپ و بڵاوکردنەوە
زنجیرە (٨)

# بەسەرهاتی سیاسی کورد

## لە ١٩١٤وە هەتا ١٩٥٨

یاداشتەکانی

**میرزا محمد أمین - مەنگوری**

بەشی دووەم

سلێمانی ٢٠٠١

★ بەسەرهاتی سیاسی کورد ١٩١٤ - ١٩٥٨

★ یاداشتەکانی محمد أمین مەنگوری - بەشی دووهەم

★ مونتاژ : سکالا جەمال عەبدوڵا

★ تیراژ : «٥٠٠» دانه

★ چاپ : چاپخانەی ڕاز

★چاپی یەکەم سلێمانی ٢٠٠١

★ ژمارەی سپاردن ( ٢٢٦ ) وەزارەتی ڕۆشنبیری پێدراوە

# پەیڤێك بۆ ئەم بەرگی دووهەمە

مەحمود مەلا عززەت

سلێمانی-شوباتی ۲۰۰۱

دوای ئەوەی بەرگی یەکەمی بیرەوەری‌و یاداشتەکانی میرزا محەمەد ئەمین مەنگوڕی (بەسەرهاتی سیاسیی کورد ۱۹۱٤-۱۹٥۸) کەوتە بەردەست خوێنەر، دوای ئەوەی ئەو بەرهەمە مێژووییە شاردراوەیە رووناکیی کەوتسەر، ئەوسا خوێنەری کوردو عەودالانی نووسینەوەی مێژووی نەتەوەکەمان بەمیتودی زانست‌و بابەتیانە، بەتایبەتی لێکۆڵەرو مێژوونوس‌و نووسەرو هەموو ئەوانەی شەیدای بوژاندنەوەی سامانی مێژوویی‌و کەلتوریی گەلەکەمانن، نرخ‌و سەنگی بەرهەمەکەیان بۆ دەرکەوت.

بایەخی بەرهەمەکە هەرلەوەدا نییە کەچەند لاپەڕەیەکی شاردراوەی مێژووی سەردەمێکی زێڕین لەژیانی سیاسیی کوردو دەسەڵاتی خۆماڵیی جەمهوریەتی کوردستانە کەمیرزا مەنگوڕی تۆماری‌کردو نەیهێشت وەك زۆری‌تر لەو بیرەوەریی‌و زانیارییانە بکەونە ناو بازنەی لەبیرچوونەوەوە، بەڵکو گرنگتر لەوانە ئەوەیە کەوا میرزا هەروا بەراگوزاریی رووداوەکانی تۆمار نەکردووە، هەروا روخساری کۆمەڵگەکەو گۆڕانە روکەشەکانی نەبینیوە، بەڵکو باسە گرنگەکانی ناوەناوی گۆڕان‌و ناکۆکییەکانی کۆمەڵی کوردەواریی‌و دەزگاکانی کۆمارو رەفتاری نائاسایی هەندێ ناوەندی دەسەڵاتی بەسەرکردۆتەوە، ئەو لایەنانەی خستۆتە بەر رووناکیی کەمەگەر هەر لێکۆڵەر بایەخەکانیان بزانێت، چونکە دەتوانرێت باس‌و توێژینەوەی هەمەلایەنەی چین‌و بەشە کۆمەڵایەتییەکانی ئەو سەردەمەی لێهەڵبهێنجێت تا ئەو ئاستەی کەببێتە سەرچاوەیەکی‌تری مێژووی راستەقینەی جەمهوریەتی کوردستان... سەرچاوەیەکی گرنگ بۆ مێژووی سەردەمەکە کەدەرس‌و پەندی باشیشیان لێوەربگیرێت.

وا ئەمڕۆ کەبەرگی دووهەمی (بەسەرهاتی سیاسیی کورد) ئەکەوێتە بەردیدی خوێنەر ئەم بەرگی دووهەمە سەنگی بەرگی یەکەمی بەرهەمەکە بەهاتر دەکات، نەك هەروەك تەواوکەری ئەو بەرگە، بەڵکو وەك بیرەوەریی‌و یاداشتکردنی گەلێ رووداوی‌تری گرنگ کەهەرچەندە دەکەونە سەردەمێکی دوا رووخاندنی جەمهورییەتی کوردستان، بەڵام ئەوانە چەند ئەڵقەیەکی زنجیرەیەکی‌تری رووداوەکانن کەسەرەنجامی رووخاندنی جەمهوریەتەکەی مەهابادن.

جگە لەوە گەلێ نهێنی ناو شەڕوپێکادانەکان دەخاتەڕوو، کەبێ بەڵگەو بێ‌گەیشتنە راستییەکان، بۆچوونی هەڵەیان لەسەر دەخراوە، بەڵام میرزا مەنگوری بەپشت بەستن

بەگەڵێك بەڵگەنامە لەگەڵ هاوژیانی خۆی لەناو رووداوەکاندا کەبەحوکمی کارو جێگەکەی راستەوخۆپێوەنددار بوو بەو رووداوو شەڕوپێکدادانانەوە، قسە دەکاتو بۆچوونەکانی خۆی دەردەخات. کەلەوانەشدا پێدەچێت نووسەر پەنای بردبێتە بەرمانەوەی زانیارییەکان لای بەحوکمی ئەوەی خۆی زوربەی هەرەزۆریانی داڕشتبوو.

لەم بەرگی دووهەمەو لەناو ئەو باسە گرنگانەی کەئاوڕی لێداوەتەوە، مەسەلەی گفتوگۆی نێوان مەهابادو تارانە، چارەنووسی بارزانی رەحمەتیو هێزەکەیو ئەفسەرانی هاوبەش لەکۆمارەکەدا بەسەردەکاتەوە کەچۆن دووچاری هەلومەرجێکی سەخت بوون. چۆن بەرەنگاری کۆسپەکان بوون، لەمەشدا ئەوە لەبیرناکات کەهەڵەو بۆشاییەکان بەسەر بکاتەوە، تا بەناچاریی روو لەیەکێتیی سۆڤیەت بکاتو لەڕێبازێکی سەختدا بگەنە ئەوێ.

یەکێك لەکارەساتەکان کەسەرەنجامی رووخاندنی جەمهورییەتی کوردستان بوو لەسێدارەدانی پێشەوا قازی محەمەدو هاوڕێکانی بوو، نووسەر چەند تیشکێك دەخاتە سەر ئەم لایەنەو هەڵەکانی سەرکردایەتی کۆمار دەستنیشان ئەکات. دیسان رووداوەکانی هاوپێوەند بەلەسێدارەدانی تێکۆشەرانی هاوبەش لەخەباتی پیرۆزی کوردایەتیو جەمهورییەتی کوردستاندا باسدەکاتو لەگەڵ زۆر لەباسوخواسیی تری گرنگدا.

ئەوانە چەند نمونەیەکی گرنگی ناو بیرەوەرییەکانی ئەم بەرگی دووهەمەی (بەسەرهاتی سیاسیی کورد)ە، کەبایەخی مێژوویی بەرهەمەکەو رۆڵی باشی میرزا محەمەد ئەمین مەنگوڕی دەردەخات، چ وەك هاوکارو نووسەر لەفەرماندەییەکەی جەنەراڵ حەمە رەشیدخانو داڕێژەری نووسینو نامەکانی خان، وەچ وەك نووسەرو بەسەرکردنەوەی رووداوەکان لەناو بیرەوەرییو یاداشتەکانیدا، هەرچەندە میتودی نووسینەکانی میرزا محەمەد رێبازو شێوە ئەکادیمییەکەی بەخۆوە نەگرتووە، بەڵام باشو بەسەلیقەیەکی لێزانانە باسەکانی پۆلین کردووەو لەسەریانی نووسیوە، بۆیە ئەم بەرگی دووهەمە وەك تەواوکردنی بەرگی یەکەم جێگەی خۆی لەناو سەرچاوەکانی کۆمارناسیدا ئەگرێتو کەلێنێکی بۆشاییەکانی ناو کتێبخانەی کوردی پڕدەکاتەوە.

## خەتی أیچیو میرحاج

لەعینی وختا ٥٠٠ نفری سربازی مجهزی شاهنشاهی بەیارمەتی دو تانك بو هلگرتنی خەتی حصاری بینی سقزو بانە هجوم ئەکەنە سەر پوستەکانی میرحاج لە ریگاکانی أیچیدا.

بەڵام لەبەرئەوەی کەمیرحاج خندەقی قوڵو پانی لەسەر ریگای تانکەکان هلقندبوو وچند نفراتی کە لەتقاندنی دەمیتی ضدی تانك وەستا بوون خستوینە سەر ئەوچاڵو خندەکانە. هەتا نهایەت تانکەکان نیان توانیبو لەچاڵەکان بپرنەوە. ولەدوای شەریکی زور سخت لگل ئەو ٥٠٠ نفرەدا میرحاج انسحاب اکات بۆ کیوی کرویشکە ومرخذ لەترسی ئەوەی نەوەکو لەمامەشەوە هیزی دوژمن محاصرەی بکات تقریباً سعاتو نیویك لەریگای عام دورکەوتبووە. چونکە لەو وختەدا خبر وەرأگرن کەکیوی مامشاە کەوتوتە دەست ایرانیەکانو هیزی مصطفیخوشناو ئەو (تەپولکە) اهمیتدارانەیان واز لیهیناوە.

## شەری هیجانان احمدخانی خلیل خان

لەعینی روژا هلگرتنی خەتی محاصرە کراوی بینی سقزوبانە ٥٠٠ نفری سەربازی سوارە پەلاماری هیزی فیضاللەبگی ئەدەن لەدەی خیدەر-قشلاخی قاچی-هیجانان بەلام لەبەرئەوەی کە احمدخانی خلیل خان لەسەر طلبی عمرخانی شکاك روژیك پیش حادثە-بەناوی تفاهم وریکی لگل أغایانی سلطان پناە ویحیخان وحمەعلی خان وامینخان کەس نزانی گلباخی واجلال وحمەعلی فیضە لەرؤسای گلباخی وتیلکو-ئچیتەدی (تاویشە) لەمنطقەی سرشیوو گەورە قەلا-درگا سلیمان-تالەجەر وکالەتی فرماندەی جبهە تسلیم بەاحمدخانی شجیعی اکری. کەمعاونی فرماندەی ناوبراو ئەبی. وسرکردەکانی لشکری فیضاللە بگیش لەو وختەدا عبارەت ئەبن لە أغایانی-عبداللەخانی سهام تیکانی تەپە-وحمەخان سهام وحمەخان سرتیپی آخ جیوان-وهمزأغای جهانگیربگی-مجیدخانی باخچە وسعیدخانی دادخواە-حمە رحیم خان دادخوا وسلیم خانی قازلیان وکریم خانی شجیعی وحمەخانی دادخواە. عباس خانی سرتیپ آخ جیوان امیرخانی کوری جیهانگیر بگ، آورحمان خان احمد خان سالارو أغاعباسی مرزبان-ناوان.

أجا له كيوانی پشتی خیدەر وبهنام دوژ سەربازەکانی ایرانی پیش ئەکەون لشکری فیض‌الله بگی زور شەپرزه ئەبن.

بەلام لەکیوی پشتی خیدەره کەمشهوره بەگویزان- احمدخان شەریکی زورمەردانەو قارەمانانه لگل هیزی دەولەتیدا اکات‌و ئەو لشکره زوره رائەگری. هەتا احمدخانی خلیل خان دەفریا ئەکەویتەوه.

## شەری خەتی سنتەو صاحب‌و طاهرخان

لەعینی روژا لشکری شاهنشاهی بەدو تانگ‌و ٥٠٠ نفرەوه لەاطرافی دی (تیزآوا ولکزی‌و کریم آوا-هجومیان کرد بو سەر لشکری طاهرخان ونوری‌بگی عباسی نژاد. وئەوانیش لەوجبهەیەدا بەرنگاری شەریکی زور بسامیان کردبو.

## جنگی میرەدی‌و مجیدخان

لەهەمان روژا ئەو لشکره گەمارودراوەی میرەدیش لەسەر ئەو پروگرامە کەروژی پیش تر بەهوی فروکەوه پی‌یان راگەیشتبو. هەرشەو بەریگایکی چەپك‌و نهینی گریدا دینه دەرەوه. سەربازەکان لەچومی میرەدی بەبی‌خشە ئەپرنەوه دینه سەر دابەزگای اوردوی بانه لەدی تموتەدا هەر بەو شەو لەکیوانی-چراخ ویس وتموتەکون وکنده سوره- لەبرده رشانی‌و پشتی آوای تموتە-خویان دا ئەمزرینن وکەوکوژی بو لشکری أغای مجیدخان دائەنیشن.

لەووختەدا کەئەو سەربازانه گوی‌یان لەتقەی توپەکانی بهنام‌دوژ ئەبی. ئەمانیش هەل ئەکوتنه سەر هیزی تموته ومیرەدی. وشەریکی زور سامداریش لەوناوچەو ملبندەیه دا روئەدات أغای مجیدخانی حمەرشیدخان زاده لەداخی لومەو دل گەرمی‌و سەرنەکەوتنەکەی جاری پیشوی لگل أغایانی حسن خانی بداقی‌و عیمان أغا-کریم أغای کوندەلان ومامندأغا وعبدالله أغا وعلی أغای بلەجر وفارس أغای بلەجر ومینەقارەمان وعلی حاجی عطار ومحمد أغای شقویض ومحمد وحسن جوانمردی. مقاوەمەت وجنگیکی زور مردانه ئەکەن لومەو تانوتی جنگەکەی میرەدی بەخوینی ایرانیەکان ئەشونەوه.

نهايتی ئەو جنگە بەشكانی ايرانيەكان وكوژرانی ٩ نفری سەربازو ٤ نفری اسير وگيرانی ١٥ تفنگی برنەو ٦ هەزار فيشكو يك رەشاشو يك دزگای هليوگراف دوايی هاتبوو گرابوونەوە بو ناو استحكاماتەكانی خويان لە مخفری ناوبراوی پيشويانا. بەلام متأسفانە ئەمانيش قارەمانی ئەو معرەكەيەيان شهيد كردبو كەناوی (محمد أغای شقويض)بو يكيك بو لەخزمانی أغای حسن خانی بداقی.

## موفقيەتی جنگی مامشاو أيچیو هيجانانو ريگای صاحبە

لەنتيجەی جنگی ئەو روژەدا-مصطفی خوشناو مجبور ئەبی بەانسحابی لشكرەكەی لەكيوی مامشاە. وبەكوژرانی-٥٠نفر سەربازی ايرانی وبرينداريكی زور. وشكانی يك تانك وشكانی يەك گيارە وگيرانی ٢٠ صندوق فيشك وگيرانی ٦ رشاشی گەورە وبچوك و١٠ تفنگ وزخائريكی زوری جنگی نهايەتی جنگی مامشاە هينرا. بەلام داخی گرانم كەقارەمان وليدەری لشكری بارزان أغای (كبتان خوشەوی-بەگولەی رشاشی طيارە شهيد اكری و١١ نفری كەش لەلشكری كاك مصطفی بريندار اكرين بەبرينيكی سوك وكاك مصطفی خوشناو خوشی بريندار ئەبی.وبەخساراتی ناوبراو گردی مامشاە كەوتە دەست دەولەتی ايران. بەمسافەی نيوسعات لشكری ديمكرات لەسقز دوركەوتەوە. ولەجبهەی ميرحاج وآيچیشەوە. تانكيك پنچەر اكری وچوار نفری سرباز ئەكوژرين.

ولەجبهەی هيجانانا احمدخانی شجيعی مقاوەمەتيكی زۆر پياوانە لگل ايرانيەكان اكا. لشكرە شكاوەكەی أغايانی مجيدخانی باخچە وحمەرحيم خانی دادخواە ئەگيريتەوە بو دواوە. واحمدخانی خليل خانيش بەتقەی توپەكانەوە ئەگريتەوە بو ناو لشكرەكەی خۆی وبەفريای شەر ئەكەوی وايرانيەكان بەكوژرانی ٦ نفری سەرباز ئەشكينی وفضيحەتيكی زور سخت بەسەر فرماندە سرهنگ مختاریو مظفری دينی. بەلام لەو جبهەيدا ايرانيەكانيش دو اسپی لشكری فيض‌الله بگی وملا محمد ناويكی ریبوار ئەكوژن. ولەجبهەی طاهرخانيشەوە. دونفری سەرباز ئەكوژری بەلام لەلشكری ديموكرات تلفيات نابی.

انكار ناكری ئەو شەرە شەريكی زور عظيم وواسع بو. وديسان هەرئەو شەرە دەری اخا كەعشايرەكانی كورد لەفنونی جنگا دەستيكی زور بالايان هيە. كەئەو لشكرە بی

چکو بی فیشکه لەومدەتە زورەدا برامبر بەو هەموو سەربازە مجهزانەی دەولەتی توانیویانە بەرهلستی بکەن ولەنتیجەشا بەبی کوشتار وخساراتی خویان گرەوبرنەوە.

انکار ناکری کەهیئتی تصلیحی سەربازی ایرانی لەو وختەدا زور نقصان بووە. اگر ضباطی قدیریان لەناو ئەو لشکرە زورەدا ببوایە هەر ئەو روژە ئەیان توانی ریگای محاصرەکراوی بینی سنە وسقز وبوکان وسقز وسقز وبانە لەهەمو لایکەوە پاك بکەنەوە.

بەلام اثبات بو کەرئیسی ستادی أرتشی کلی ایران رزم‌آرا وفرماندەی لشکری (٤) سنە أغای همایونی بقدەر فرماندەکانی بارزانی وفرماندەکانی عشائری عالم نەبوبن بویە ئەو جنگەیان نەبردوتەوە.

أگر هیزی ایران ئەو قوەتەی تنها بو خەتی مامشاه- ملقرەنی- ألتون- سرا- بوکان توجە کردبایە هیزی دیموکرات لەو خەتانەدا دفاعیان بو نەاکرا زوریە أسانی سەرایان بو اگیرا وبەسوکی ئەچونە بوکانەوە.

انجا بەطبیعەت لشکری دیموکرات لەهەمو لایکەوە. اکشایەوە بو جهاتی مهاباد ودیبکری وناوگەورك ولەخگی قیادە بی‌خبر ئەمانەوە بەحالاتی منعزل بلاوەیان پی اکرا.

بەلان خطەی غلطی ایرانیەکان ئەوەبو کەئەو ٣ هەزار نفرە مجهزەی بر بر کرد بو چوار خطی رئیسی گرتبو بەرنظر. وئەو چوار خەتەش بەیك هلمەت نهایەتی پی نەادرا. واگەر هەرواشی اکرد حق وابو هیچ نەبوایە دو ٣سی روژ دەوامی لسر مقاوەمەت وهلمت دان بکردایە بی فیشکی وبی موادی جنگی بەطبعەت لشکرەکانی دیمکرات اشکان. هەر لەجهتی مامشاه اگر مصطفی خوشناو ئەو ٢٠ صندوقە فیشکەی چنگ نکەوتایە. نەیان اتوانی شەربکەن. دمیك بوو دوایی فیشکی دیمکراتی‌یان هاتبو. اگر هیزی تموتە ئەو فیشکانەیان چنگ نەکەوتایە ناچاری تەرکی مقاوەمەت ئەبون. ئەگەر لە بەر بی‌فیشکی نبوایە فیض‌الله بگیەکان هەتا شاری سقز ایرانیەکانیان راوئەنا.

لەنقطەی دوهەما ئەولشکرانە هیچ یان ارتباطیان لگل قیادەدا نەمابو. قیادە وای ئەزانی هیزی دەولەتی دەمیکە گیشتوتە بانە. چونکە لەدوای شەوو روژیك تقریری موفقیەتی هیزەکان لەهەمولایکەوە داباریە مقری فرماندە.

ئەوشەرە لەروی مقدەرەتی عشائرو کفایەتی تجهیزاتو وسائلی جنگی دیمکراتەوە دوایی نەهات. بلکو لەبەربی نظامیوبی روحی افسرانی هیزی شاهنشاهی أزادی خواهەکانی کوردو ئەو سەرکەوتنو ناوبانگەیان چنگ کەوت.

## دسائسی عشائرەکان

لەگەرمەی ئەو شەرە بەهیبتەدا لشکری عمرخانو کاك الله أغای حسین أغاو خضر أغای گلولانو حمەی حسین أغا بەدسائسی أغا صالح سلطان پەنا اقناع کرابون کەلسەر ریگای حرەکات دوریکەونەوە. وعمرخانیش وعدی ۷۰ هەزار تومانی لەسرهنگ همایونی ورگرتبوو لەآیچی ملاقاتی یکتریان کردبو. کەریگای تیپربونی لشکری ایران بداتو کنارەگیر بی. ئەمانیش بەونەهادە مخنّەتانەیانەوە أغای احمدخانی خلیل خانی لاوی سەربەرزو قارەمانی هەمو سەر راستیو دلپاکیك اخفال کردبو کەبەناوی ریك کەوتنی ئەو أغایانەی کەلەموپیش عرچ کرا بچیتە منگقەی سەرشیو وخورخرە. فعلاً لەروویکی دلپاکانەوە قبولی داوەتی عمرخانی کردبو. فلسفەء چونەکەشی تنها ئەوەبو کەئەو روژە حرەکات دەست پیاکری أغای احمدخان لەناو لشکرەکەیا موجود نەبی. چونکە ئەیان زانی احمدخان لەو شخصانە نیە بەرامبر بەم نوعە لشکرانە دابچلەکی ولەوانەش نیە بەپارە اخفال ببی.

عمرخان هەرچندە ئەو روژە شەری نەکرد بەهیوای ئەوەی ۷۰ هەزار تومانەکەی بدریتی. بەلام ایرانیەکان لەپاش یأسی ئەو فکری محاصراتی ریگاکان خیانەتەکەی عمرخانیان أشکرا کرد وهیچ پارەیکی اواشیان نەدابویی کەلایق بی بەو اتفاقە.

## عملیاتی حمە رشیدخان لەو جنگەدا

حمە رشیدخان لەپاش ئەوەی کەچاوی بەهیزی مصطفی خوشناو ئەکەوی کەزور لەژیر ضغطی عدودان- ملاقاتی بکر أغا ونوری احمد طە اکات. کە(۲) صندوق فیشکی احتیاطی خویان لگل ۱۰۰ نفرا بو مصطفی بنیرن بەلام لەترسی سوئی عاقبەتی خویان ئەمانیش ناویرن فیشك ونفراتەکانی خویان لەخویان دوربخەنەوە.

اجا لەسەراوە حمە رشیدخان نوسی بو بوکان بو فیشك،فرماندەی هیزی بوکانیش هەر ۱۵۰۰ فیشکی لاهەبو بوی ناردە سرا. ولەعینی وختا حمەرشیدخان حاکمی

سیاسی جبهه- أغای ژبیحی-زور بەپلە ناردەوە بو سابلاغ بو فیشك. بەلام لـەپاش ٤٨ سعات ٣٠ هەزار فیشك بەهوی مایور خیراللە- ناوی بـارزانی گیشـتە سـراو نـیرەرا بـو لشکر... وغیری ئەوەش حمە رشیدخان ترتیباتی عقبەنشینی دامەزران لەکیوەکانا.

اجا حمە رشیدخان لەنەبونی فیشكو وسائلی جنگی لەجبهەدا سەرزەنشـتیکی دورو دریژی بۆ قاضی محمد نوسی بەژمارە ٦٤٠ وروژی ٣٢٥/٣/٢٥ ولـەوختیکا کـە حمـە رشـیدخان راپوری حرەکـاتی جبهـەکانی گیشـتی. لـە انسـحابی میرحـاج بـو کـەلی کرویشکەر زور متأثر بو. فوراً نوسراویکی بو میرحاج نوسـی. کـەمن هیـچ وام لـەتو رانەئـەدی کەبـەو وینـە شرّە بچکولانانـە خفضـی حمیـت پیـدا بکـەی. بـەبی کوشـتن استحکاماتی آیچی بو دوژمن بجی بیلی- پیویستە هەر ایسـتا بگریتـەوە بـو جیگـای پیشـوت وفعـلاً میرحـاجیش بگیشـتنی نوسـراوەکە اگریتـەوە بۆ آیچی بـلام لـەدوای گرانەوەی حمە رشیدخان بوعیراق میرحـاجیش بـەو قضیـەی انسحابی لشـکرەوە متـهم کرابو. گوایا ئەویش پارەی لەایرانیـەکان وەرگرتـوە بویـە تـەرکی اسـتحکاماتی آیچـی کردوە.

جا لەسەر ئەو موضوعە حکومەتی قاضی محمد ثقەی عسـکرییان لـەمیرحاجی کپ کردبووەوە هەتا نهایەت لەتەوریز کردبویان بەمأموری استلامی زخـائری لشـکری بارزانی.

## نقصانیەتی دیمکرات

ئەگەر لەو وختەدا بارزانیەکان فیشكو تجهیزاتی تـەواویان ببوایـە. ولـەژیر قیـادەی أمریکی خویان بونایە. هەر ئەو روژە سقزیان ئەگرت. چونکە ایرانیەکان شەپرزە بوبون. ولەعین وختیشا أزادی خواهەکانی سقز احضار اتی خویان کردبو بو ثورەو حرەکاتی داخلی- أغایانی دەباخی- وحاجی عبداللە بانـەی ( ودەسـتەی حـاجی مجیـدو جلالیو حجازی- لەدەرگای انتظار راوەستابون.

بـەلام سـەرچاوەی غلطـی ئـەو حرکاتـە هـەموو آمـالو موفقیتیکـی کـوردی دورخستەوە. هەتا وختی کەحمە رشید خان لەجبهەی مامشاه ئەگریتەوە لگل بکر أغـاو نوری احمد طە اتفاق اکات کەهەر ئەو شەوە ئەو دولکە بچنـە سـقزەوە واحتـلالی سـقز

بکەن هەر وختێك کەزانیان لشکری ایران چوتەوە ناوشار. بەلام أغایانی ناوبراو لەبەر تفرەقەی ناوخویان نەیان توانی بو تطبیقی ئەو پروگرامە بکەن.

قاضی محمد لەجهتی تسلیح نکردنی لشکرەکەی ونەناردنی فیشکی احتیاط بو جبهە بەمقصر ازانری لەرغمی ئەوەی کەهەمو نفریکی سابلاغی بەدەمانچەو تفنگو تماتیر تجهیز کرابون. هەتا کچەکانی مکتب بالعموم بەدەمانچەو تماتیر آرایشت کرابون. کەچی ئەو هەمو لشکرو عشائرانە بەبی سلاحی تازە هاتبونە کایەوە. قاضی محمد زور بەغلط چوبو کەوای ئەزانی کچو کورو پیاوانی سابلاغ بو ورگرتنی‌استقلال کافین ولای وابو لەروژی قەومانا ئەمانە لەشاری سابلاغا حربی خندەقی بو ئەکەن وعشائرەکانیش هەڵ دین. قاضی محمد وای ئەزانی کەکچەکانی سابلاغ وکو کچەکان روسەکان لەستالین گراد-ا حتیاری شەری پنجرە وسەرخان وژیرخانی بوئەکەن. کەچی بالعکس لەروژی تسلیم بونی تەوریز، هەرچی کە قاضی محمد پی‌ی ئەنازی‌و بەجیگای روژی قەومانی ازانی تفنگ‌و دەمانچەکانیان لەمزگەوتان فریدا ویا بەسەر قاضی محمدیاندادایەوە. ویا بەپارەیکی زور هەرزان فروشتیان ویا تسلیم یان کردەوە بەحکومەتی ایران. وجبهەی تاخت وتازیش لەبەرفیشکی وبی‌چەکی هیچ مرامیکی چنگ نەئەکەوت.

## رفعی حصاری مرکزەکان

لەسەر موافقەت‌و اشارەتی تاران روژی ٣٢٥/٣/٢٦ قاضی محمدو حاجی بابەشیخ‌و ملا مصطفی ونانەوأزادەو کبتان سعیدزادە ووهابی بلوری وزیر داخلیەو رئیسی ئیستەی مرکزی- هاتنە سەراو لەعینی روژیشا رئیسی ستادی‌ارتشی ایران (رزم‌أرا) واردی سرا کرا لەبینی هەردولا اتفاق واقع بو کەریگاکان أزاد بکەن بو تیپرکردنی نیروی ایران. بەشەرتی افرادی مسلح‌و چەك‌و کرستەی جنگی بەری نکری بەو ریگایانەدا. ولەلاین هیزی دیمکراتەوە لەهەموو مخفریك تفتیشی ئەو ماشینانەی حکومتیە بکری.

حاجی علی رەزم أرا-دەستوری دا بەحمە رشیدخان کەبچی پوسطی میرەدی وەریگری ونفراتەکانی مسلحاً تسلیم بەسقز بکاتەوە. لەسەر ئەو نوسینەی کەرزم‌أرا داویە بەفرماندەی پوسطی میردی حمە رشیدخان لەسەر موافقەتی قاضی محمد

رۆژی ٣٢٥/٤/١ چو بو دی بلەجر- بو تسلیم کرانی ئەو مخفرە. مخابرەی لگل سرهنگ غفاریدا کرد. سرهنگ غفاری وەلامی دابووە لەبەرئەوەی کەمن هیچ امریکم پی نکراوە ناتوانم تسلیم ببم. ورزم‌آراش گەرایەوە بۆ تاران‌و قاضی محمدیش بۆ بنای مۆکرات لگل ایرانیەکانا رۆژی ٣٢٥/٤/٥چو بو تاران. ولەهەموولایکیشەوە خواربار بو سەربازەکانی ایرانی تی‌پەر کرا.

لەهەموو شتیك سیرتر ئەوەبو کە قاضی محمد لەسەر تشبساتی ایرانیەکان لشکری شکاکی اذن دایەوە. کەچی لەعینی روژا کەمصادفی ٣٢٥/٤/٦ أکات. لشکری دەولەتی ایران لەژیر فرماندەی سروان منصور پورا- چو بو جیگای لشکری شکاك لەخرخرەو سرشیو وملەوروستمان انجا لەوزارەتی جنگەوە قەراردرا کەجیگای لشکری شکاك بە لشکری بارزانی‌و بانەی پر بکریتەوە.

هیزی فیض‌الله بگی لەهیجانانەوە نیرەرایە جیگای لشکری طاهرخان ونوری‌بگی عباسی نژاد ومحاصرەی اطرافی بانەشی هلگرت لشکری بانەی هینایە اطرافی سقز.

فرماندانی خوارەوە کەعبارەت بون لەمحمد امین خانی قادرخان زادە ومجیدخانی حمەرشیدخان زادە وقادرخانی ارمردە ونصراللەخانی روستمی‌و عبداللەبگی نیجنە وحمە صدیق‌خانی سلیمان‌خان. واحمدخانی فاروقی ومحمد أغای جوانمردی ورسولی محمودی. وحمە رشیدبگی بلەکی- لەلاین حمە رشیدخانەوە احضاری سەرا کران. انجمنیکی اتحادی یان تشکیل کرد. لەو انجمنەدا فرماندانی ناوبراو سویندیان بو أغای حمەرشیدخان خوارد کەهەتانهایەت خیانەت لگل قاضی محمد ونیووی دیمکراتا نەکەن. منیش بەو مناسبەتەوە لەروژنامەی ٦٨و٦٩ کوردوستان بەتفصیل خطبەی ئەو فرماندانەم نوسیوە. ولەعینی وختا (حمەخانی محمودخانی کانی سانانیش) لەسەر اعتمادو قناعەتی حمە رشیدخان بەدەستەیکی مناسبەوە التحاقی بەحمە رشیدخان کرد بەاحتراماتیکی زورەوە نیرەرایە سابلاغ. و هەتا نهایەت لەسابلاغ لەژیر عطفی قاضی محمدا مایەوە.

## سوتانی نانەوا زادە

لەروژی ١٣٢٥/٤/٢٥ معاونی سیاسی وزارەتی هیزی کوردوستان أغای پیات پولکونیك نانەوا زادە- کەبەصفەتی حاکمی سیاسی لەسقز دائەنیشت. ومسئولی

## سوتانی نانەوا زادە

لەروژی ١٣٢٥/٤/٢٥ معاونی سیاسی وزارەتی هیزی کوردوستان أغای پات پولکونیک نانەوا زادە- کەبەصفەتی حاکمی سیاسی لەسقز دائەنیشت. ومسؤلی مذکراتی بینی دەولەتی ایران و قاضی محمد بو لەعینی وختیشا مفتشی بەری‌کردنی خوارباری ایرانیەکان بو بو سەرپەرشتی جبهەی سەردەشت بەطیارەی دەولەتی ایران لەسقزەوە چوبو بو سەردەشت. لەعودتیا لەکەلی خان-لەأقاری گردنەی دی-سونج- طیارەکە گری ئەگری و لەو أسمانە بەرزەدا ئەولاوە نیشتمان پەرست و فداکارە پر ماریفەتە- أگری تی بەرئەبی و بەبی کومەگی و هاوار هەر لەو أسمانە بەرزە گیانی پاکی تسلیم بەفرشتە رحمت ئەکا.

حقیقتاً نەمانی ئەوگنجە بەحمیت و فداکارە تأثیریکی زوری کردەسەر گیانی دیمکراتیەکان. واسفیکی زور گەورەی بو هاوبیرانی أزادی خواە بەجی‌هیشت. چونکە بەمعنای کلیمە أزادی خواهیکی شازو هلکەوتو بو.

## چول کردنی جبهە

روژی ٣٢٥/٤/٢٧ قاضی محمد لەتارانەوە واردی سابلاغ بووە. وحمە رشیدخانی جلبی سابلاخ کردو دەستووراتی بلاوەپی‌کردنی لشکرەکەی پی ابلاغ کرد لەسەر ئەو قراردادەیەی کە لەوەختی خویا عرض کرابو وبەبلاوبونەوەی ئەو خیرە. أغا صالح سلطان پەناە لگل سروان منصور پوردا. هجوم ئەکەنە سەر حمە صدیق‌خانی سلیمان خانی جاف. وحمە صدیق خان تەوانای مقاوەمەتی نابی- دگاگا- ئەسوتی‌نی وهلدی‌تەوە بو عراق.

حمە رشیدخانیشی لەتأثیری أزادکرانی ریگای ایرانیەکان و لەداخی بلاوە پی‌کردنی لشکرەکەی. وتأسفی بی انتظامی تشکیلاتی ئەو کوردوستانەی کە قاضی محمد پیکی هیناوە لەروژی ٣٢٥/٥/١ استقالەی تقدیم کرد. بەعبارەتی خوارەوە.

## استعفای حمە رشیدخان

بو وزارەتی هیزی بەرزی ملّی کوردوستان

لەحالی حاضرا لەغیراز أشتیو مسالمەت هیچ شتیکی خطر لەکوردوستانی مهابادا مشاهدە ناکەم. لسایەی لطفو مجاهدەتی بەرزی پیشەوای محبوبمان لەهەموو جهتیکەوە کمالی امنیتو أسایش بەرپایە. لەبەرئەوەی کە مدەتیکە بەهوی لشکرکەشی وجبهە پرستی زحمات کیش بووم تقریباً جودم عارضی کسالەتو بیهیزی بووە فعلاً محتاجم بەمدەتیك فراغەتو استراحەت. جابەومناسبتەوە استرحام لەمراحمی بەرزتان داوا ئەکەم. بعجلە فرمانەدیك بو نظارەتی کارو فرمانی رەسمی لەجیگای من تعین بکەن. واعتباراً لەم رووە. بەنظری اعتبار تەماشای استقالەکەم بفرمون. ایتر بژین بەبەرزی کوردوستانی مەزنو پیشەوای محبوب.

١٣٢٥/٥/١ محمد رشید قادرخان زادە

فرماندەی هیزی بوکان ومنطقەی سقز لەسرا

وەزارەتی کوردوستان

ژمارە ١٣٠

روژ ٣٢٥/٥/٣

بوجنابی ژنرال مایور محمد رشیدخان قادرخان زادە

وەرامی برواری ٣٢٥/٥/١ جنابت وادەگەینی لەحسنی نیەت وفداکاریکی کەتا ئەورو بەفەرجت داوە. وزارەتی هیزی کوردوستان معظم بیاندازە سوپاسو تقدیرت لیدەکا. وامید اکری لەسەر غایەی مقدەس زیاتر فداکاری بکەن. وفرموبوت لەکاتی انجامی وضیفەدا وجودم خستە بووە ومحتاجی استراحەتم ئەوا عجالتاً ئەوراد خوازەتان لی قبول کرا. ایتر موفقیتت لەریگای مرامی مقدسدا لەخوا داوا ئەکری.

ژنرال سیفی قاضی

سەرپەرشتی نگهبانی کوردوستان

انجا حمە رشیدخان لەهەموولایکەوە دەرگای اتهام وفرحەتی رقیبەکانی لەرودا کرایەوە. هینتی کەعبارەت بون لە أغایانی (حسین فروهر وعلی ریحانی-بو بازجویی هیندی تحقیقات وتفتیشی راپواری مفسدان هاتنە سرا. لەپاش تەواوکردنی تحقیقاتیان معصومیتی حمە رشیدخانیان بەچند شکل بو دەرکەوت. انجا حکومەتی قاضی محمد کەوتە سەر تلطیفی حمە رشیدخان بو مانەوەی لەایرانا.

بەلام لەبەر اوضاعی هەرج و مەرج و میرەج حمە رشیدخان نظریەی دەرحق بەم حکومەتە گوڕابو واعتباری بەقاضی محمد وهیئتی کاربەدەستان نەمابو. جابەو مناسبەتەوە ئەی ویست لەخارجی نفوذی قاضی محمد لەایرانا مەرکەزیك بو خوی دروست بکات. بەومناسبەتەوە لگەل ایرانیەکانا لەژێرەوە درگای مخابراتی بواسطەی شیخ جلالی نقشبندی خانقا کردەوە.-دونوسراوی رزم‌آرا-تان لەم خصوصەوە بعرض اگا

أغای محمد رشیدی قادرخان زادە

هەتا پیش ملاقات لەسەرا فکری من برامبر بەتو نوعیکی تربو. بەلام لەپاش چاوپی‌کەوتن تان. لەسرّی احساسات وافکاری تو گیشتم کە بەکلّی مخالفی ئەوە نیە کەمن فکرم لی ئەکردەوە. حمیمیتی تو بحدّیکی زور تقدیر اکری. لەبەرئەوەی کەمن لەتاران بواسطەی مذکراتی قاضی محمد تأخیربوم بەلازمم زانی نظریەی خوم بەتو رابگەینم.

زور مائلم کەایشم لگەدا بکەی وبو هەمکاری من نزیك ببیەوە. ایران امرو ضرورتیکی زوری بە هەمکاری تو هیە ومن شخصاً بو ئەو جهتە لە تلاشام. لەملاقاتی دوجاری تودا زور زور خوشوقت بوم. بو خذمتی ایران حمیمتی قلبی تو بەلازم ازانری.

ئەوا لسر تشبپ ورجای تو (علی جوانمردی) لەکوردوستان مرخص کرا. راجع بەقضیەی پوسطی میرەدی لگەل قاضی محمدا مذاکرە کراوە کەهیچ مداخلەیکی نکری. وبو قسمی اختلاط وهاوکاری لگەل سەرتیپ همایونیدا. یا خوت یا کوریکی خوت ئەبی ملاقاتتان ببی. درگای ارتباط ولیك نزیکی بەیکەوە بکەنەوە. ولەغیراز چاکە ومحبت لەشخصی من انتظاریکی ترتان نەبی.

۳۲۵/٤/۱۱ رئیس ستادی أرتش-سرلشکر رزم‌آرا

لەبەرئەوەی کەحمە رشیدخان لەو رودی ئەو نوسراوی رزم‌آرایەدا فرماندەی جبهە بو. بەخیانەتی ازانی کەهیچ گونە اهمیتك بەو وینە تلطیف ودلنوازیە بدات بو شخصی خوی جوابی ئەو نوسراوەی بەعبارەتی خوارەوە بو رزم‌آرا نوسیوە بەشیوەیکی امسال رەسمی.

جنابی رئیسی ستادی أرتشی ایران سرلشکر رزم‌آرا

مقابل بەنوسـراوی ٣٢٥/٤/١١تـان جـدأ تشـكری احساسـاتی بـەرزو بـیری أموژگاریو یك گیانی هاوجنسیو هاومیهنیتان ئەكەم لەبەرئـەوەی كەخانـەوادەی مـن پدراً بر پدر. ئەو مرحلەی نیشتمان پەرستیو أزادی خواهیەتەیان تعقیب كردوە. منیش بەواجباتیكی ارثی پدری ازانم كەهـەتا نهایـەت طـەی ئـەو مسـافەیە بكـەم. وطلبـی هاوكاریو هاومیهنی من لـە تـو تنـها ئەوەیـە كـە بـو هدەفیكـی أزادیخواهـی ابـدی ونهائی ایمە اشتراك وكومـەگی بكەن. وبەو نـاوەوە مـن حـاضـری هامگیـانی وبرایـەتی ایوە ابم.

ژنرال محمد رشید قادر خانەزادە

فرماندەی هیزی بوكان وسقز لەسرا ٣٢٥/٤/١٦

بەلام لەدوای ئەوەی كە لەوظیفەی جنرالی استقالەی قبول كرا بواسـطە احمدخانـی خلیلخانەوە بـو اتصـال لگـل ایرانیـەكانا. شـیخ جـلالی نقشـبندی وادار وأگـادار كـرا. كەاتصال لگل سرهنگ همایونی ورزمأرادا پیدا بكا بـو تنفیـژی ئـەو قراردادانـەی كـە لەوختی خویا بعرضم گیاندن.

ئەوا نوسراوی دوهەمی رزمأرا لەخوارەوە ئەخوینەوە.

أغای محمد رشیدی قادریخان زادە

نظر بە موضوعی تخلیەی بانە لەقواتی دەولەتی شاهنشاهی دەستوراتی كامل بە سەرتیپ همایونی دراوە. وجنابی شیخ جلالی نقشـبندی بـەم وەسـیلەوە عـازمی ئـەو طرەفە أبی. لەمنطقەی بانە انتظاربكەن تاكاری ناوبراو قریباً خاتمە وەراگری.

رزمأرا

رئیسی ستادی أرتش- سرلشكر ٣٢٥/٥/١٥

بەلام لەبەرئـەوەی كەحمـە رشـیدخان بـەصورەتی قطعـی اعتمـادو بـاوەری بـەقولو استنادی ایرانیەكان نەبو. ئەو وینـە مخابراتو توعیدانـەی بەشـتیكی مزەخـرەف تلقـی اكرد مجبوراً بەتأریخ ١٠ أبی ١٩٤٦\٣٢٥/٥/٢٠ لەدی سیران بن ملاقاتی سید علـی حجازی-مدیری پولیسی قوەی سـیاری بافسـتیانی-كـردو بەشـروطـی شـفەوی نهینی اتفاقیـان كـرد كـەرسماً ئـەو شـروطـانەی خـوارەوە بـو حمـە رشـیدخان بـەانجام بگینـدری وبەرەسمی ئەومادانەی تبلیغ بكری اىجا حمەرشیدخان بچیتەوە بو عراق

١-لەپیاوانی حمە رشیدخان ٦٠ نفر معاشی پولیسی هەبی.

٢-مقرەراتیکی لایقە مانگانەی خوی بی.
٣-مخفری داروخان هلبگری.
٤-حمە رشیدخان بو زیارەتی وصی ورئیس الـوزا بچیـت بـو بغـدا بـەلام لـە ٧ روژ زیاتر لەبغدا نەمی‌نی‌تەوە کەخوی مائلی مانەوە نەبی.
٥-اتباعی حمە رشیدخان بەاجتیازی حدود مسئول نکرین.
٦-حکومەتی عراق وەلاغ بنیری بو نقلی خانەی حمە رشیدخان بو ایران.
٧-بو املاکاتی حمە رشیدخان واتبـاعی. حکومـەتی عـراق لگـل دەولـەتی ایرانـا بابی مذکرات بکاتەوە. وحکومەتی ایران موافقی مصلحتی حمە رشیدخان وقراریك بو تصرفی املاکەکانیان اصدار بکات کەخویان مأذونی تصرفیان بن.
٨-لـەظرفی یـك هفتـەدا بقـراری مجلسی وزرا رسمـاً ئـەو شـروطانە تبلیـغ بەحمـە رشیدخان بکرین لەمرکزی سرادا.
اجا حمـە رشـیدخان بـەامیدی گرانـەوەی بـو عـراق سرای بـەجی هیشـت بـەخویو تبعەکەیەوە چو بو دی (بغدەکندی). لـەپاش ٧ روژ لـەجیاتی ئـەو قراردادەیـەی سـرەوە قاقەزیکی شبهی رەسمی سیدعلی حجازی بە مضمونی خوارەوە بو حمەرشیدخان لگـل ٦٠ ولاغی باری (وجنابی شـیخ عبدالقـادری چویسـە) کەواسـطـەی پیکهینـانی ئـەو اتفاق وقراردادەیە بو واردی دی بغدەکندی بون.

محترەم جنابی محمد رشیدخان

مفصلاً لگل رئیس الوزا و وزیری داخلیە بەتلسز قصەمان کرد. بـو ئـەو جهتانـەی کەباس‌مان لی‌کردبون. زور موافقن. فوراً ئەگری‌تەوە بو عـراق. کەگیشـتیەوە داروخـان. برقیاً خبرم بدەری. شخصاً دیم بو داروخان متفقـاً ئـەچین بـۆ بغدا بـو زیـارەتی وصـی معظم ورئیس الوزرا. بەاول گیشتنی بغدات نـائلی عطفیکـی گـەورەی رئیـس الـوزرا ارشد العمری ئەبی.

سیدعلی
مدیری شرطـەی قوەی سیار لە

بافستیان

اجا کەقاضـی محمد بـوی معلـوم بـو حمـە رشیدخان ئەگەریتـەوە. وگەڕانەوەکەشـی باعثی تفرەقەی عشائرەکانە. بـەناچاری دوسیارەی لگـل میرحـاج (ووهـابی بلوریـدا)

نارد بولای حمه رشیدخان. کەلگل ئەو هیئتەدا بچیت بو سابلاغ وتفاهم لگل قاضی محمدا. بلام حمه رشیدخان رفضی ئەو مضمونەی کرد. انجا قاضی محمد بەعبارەتی خوارەوه نوسراویکی بو حمه رشیدخان نوسی.

ژمارە ١٣٥٧ — أغای ژنرال مایور محمد رشیدخانی قادرخان زادە

روژ ٣٢٥/٦/١

لپاش دوعا وسلاویکی زور. نازانم تو چه رقیکت لەوبارزانیه فقیرانەیه. کەهەموو نسبتیکی دل عاجزیت لیمان حس اکری . تو سویندت خوارد بو خیانەت نەکەی. کەچی خەریکی خیانتیش بکەی. پیاوی چابە هستە ورە بو سابلاغ گوی بو قصەی فسادان رامگرە. هیندی تفاهم لەبینا هیە رفعی بکە. هەرچی تو آرەزوت بی‌نی من وات بو ئەکەم.

قاضی محمد

بەلام حمه رشیدخان جوابی قاضی محمدی نەدایەوه. ولەسەر مخابرەی چند روژی لەوبەری ٥٠٠ سواری بانەی لەبانەوه بوگیشتە بغدە کندی. ولەروژی ٣٢٥/٦/٢ حمه رشیدخان گرایەوه بەرەو عراق. وانتظاری ئەو مقاوەلە وقراردادەیەی نکرد کەلەگەل رزم‌آراو سرتیپ همایونی بستبوی.

هەتا سرهنگ أیروم (فرماندەی پادەگانی بانە لەشوی) خبری گەیاندە حمه رشیدخان کەسرتیپ همایونی بو تنفیذی قراردادەکانی باس‌کرا وبەیانی بەطیارە دیت بو بانە نابی بگریتەوه بو عیرا لەپیش ملاقاتی ئەوا. بەلام حمەرشیدخان سەراپا ئەو پیمان‌و بریارانەی بە مباهنەوه وخت لەدەست دان تلقّی اکرد. لەرغمی ئەوەی کەلەلاین زور دوستوهاوریکانی بسەریا ئەهاتن بو ئەوەی کەمەدەیك لەایران بمی‌نی‌تەوه هەتا مصیری اتفاقی ایرانیەکان رەوشەن ئەبی وهەم عراقیەکانیش سلفاً ایضا بەگوازتنەوەی مخفری داروخان وهیندی شروط ئەکەن.

بەلام أغای مشار الیە لەرغمی ئەو هەمو پی گوتن‌و بسەر هاتنیا روژی ٢٦/أبی ٩٤٦ واردی داروخان بووه. حمه رشیدخان لەو أخرەدا موازنەی ایشی لەخو تیك دابو. هەرچی‌کی کەایکرد بەشکلیکی بی‌موازەنە و حساب هەلی ئەکوتایسەر. اولاً حقوابو جیابونەوەی لەقاضی محمد لەسەر اصولیکی شیرین بوایە. کەهیچ نەبوایە هیئتیکی بو خواحافظی بناردایە بو لای قاضی محمد. ویا مفصلاً قاقەزیکی اعتذاری معقولی بو قاضی محمد بناردایە ودیسان حقوابو لەحدود انتظاری بکردایە. چونکە لەو

انتظارەدا لە٣سی نقطەی مهم حالی ئەبو. أیا ایرانیەکان لەو ادعایەیانا راست ئەکەن یادرو. کەئەلین بانەتان بو بەجی‌دیلین دوهم عراقیەکان ایفا بە وعدەکانیان ئەکەن یا نا.

وقاضی محمد خطەیکی کەبو تلطیف وأشت‌کردنەوەی حمە رشیدخان تعقیب اکات یانە نا. کەهیچ نبوایە بواسطەی ئەتیك انتظار حکومەتی عیراق مجبور ئەبو رسماً اعترافی بو بەهیندیك لەو مسئلانە بکات کە لەمەوبەر بەزمانی سیدعلی حجازیەوە نوسرابونەوە.

بەلام داخەکەم انتظارکردنەکەی بو بەسببی ئەوەی کەبەبی قیدو شەرت خوی تسلیم بەحکومەتی عراق بکاتەوە وهەتا امرو لەژیر اسارەتی پولیسی عراقا بمی‌نی‌تەوە.

لە ٢ ایلولی ٩٤٦ سید علی حجازی لەبافستیانەوە بواسطەی قوەی شرطەی سیاری داروخان بەموضوعی خوارەوە برقیەیك ادات بەأغای حمە رشیدخان.

محترەم حمە رشیدخان

لەبەرئەوەی کە حضرەتی وصی معظم روژی ٥/ایلولی ٩٤٦ تشریف ئەبات بو سرسنگ. ئەیەوی پیش تشریف بردنی چاوی پی‌تان بکەوی. ئەوا فائق علی مدیری شرطەی سلیمانی هات بو پینجوین. لەخذمەتتانا دیت بو بغدا ولەروژی معیندا زیارەتی وصی معظم اکەی وهەموو أرەزو ومطالبیکت بەئەوەل زیارەت‌یان پیك دی.

مدیری شرطەی قوەی سیاری بافستیان

لەسەر ئەو برقیە حمە رشیدخان چو بو بغدا فعلاً زیارەتی وەصی معظم ورئیس الوزرای افخمی کرد. وبناءً لەسەر طلبی مقاماتی علیا وسیاسەتی ناهموار. لەجیاتی ایفا بەأجر وچاکە وپیك‌هینانی شروطەکانی. کە نسبتاً هاتنەوەی حمەرشیدخان لەو وختەدا. موفقیتیکی گەورەبو. بو عراقو سویندخورەکانی. چونکە گەرانەوەی حمە رشیدخان لەو وختەدا تأثیریکی زورگەورە وشکستیکی زور فاحشی بەسەر شانی حکومەتی قاضی محمد داهینا.

ومقابل بەو خذمتە گەورەی کەلەو وختەدا أغای حمە رشیدخان بو قومی عرب وملەتی انگلیسی بجی‌هینا. کەچی بەسواری سیارە، مصفحە روانەی شاری (رمادیە) کرا هەتا نهایەتی ایلولی ١٩٥١ هەر لەژیر سیطرتی پولیسی رمادیەدا مایەوە. ولەمانگی ایلولی ١٩٥١دا لە تشددی قضیەی نەوتی ایرانو انگلیسا بو تهدیدی

نفوذی ایرانیەکان واعادەی حرەکات وغزوی بو ایران لەحالاتی پیویستا حمە رشیدخان جلبی کرکوك کرایەوە وحصاری پولیسیشی لسر لابرا.

حمەأمینخانی قادرخان زادە

انجا حمەأمین خانی برای حمە رشیدخان لەبانەدا مایەوە. نەویرا عودەت بکاتەوە بو عراق نەوەکو مصیری ئەویش وەکو هی حمە رشیدخان حپسی و نفی بی. بەلام هەروەکو نەگەڕایەوە بو عراق ئەویش ئەی ویست وەکو حمە رشیدخانی کاکەی لەسەر ۳سی تناف بازی بکا. لگل قاضی محمد وایران وعراق کەوتە مخابرە. بواسطەی علی جوانمردیەوە بەتأریخ ۱۵/۶/۳۲۵ بەعبارەتی خوارەوە قاقەزیکی نوسی بو قاضی محمد.

بو پیشەوای بەرزی کوردو کوردوستانی معظم

۱-اصلاً أغای حمە رشیدخان لەهیچ ریگایکەوە مخالف بەپیشکەوت و مصالحی دیمکرات نەبووەو نابی. بلکو هەتا مردن عاملیکی اساسی یە لەریگای سەرکەوتنی کوردوستانا. غایە لەچونەوەی بو عراق تنها ئەوەبووە. کەزورکەس بەهوی وجودی ئەمەوە بهانەیان بەخذمت وکنارەگیری دیمکرات ئەگرت.

خانیش بوی نەاکرا لەوەزیاتر برامبر بە مغرضان چاوپوشی بکات بلکو لەوە زیاتر مانەوەی خان ئەبو بەهوی هیندی کردەوەی ناشیرینی ناحەزان. وبەهوی ئەوەکردەوانەش مشکلات زور لەپیشکەوتنی پیشەوای بەرزمان ئەهاتە وجود.

۲-لەبەرئەوەی کە أغایانی بانەی بەتأثیرەوە جبهەیان پیچولکرا ولەخذمتی کوردوستانی أزاد محروم کران. ئەگەر خان لە وظیفەکەی استعفای نکردایە معنای ئەوەبو کەقیمتی عشیرەتی وخزمایەتی خزمەکانی بەلاوەنیە. لناو عشائریشدا رعایەتی طائفەگەری شتیکی ضروریە.

۳-لەبەر مغرضانی زور خان بوی نەاکرا بەبی لشکر وتبعە لەولاتیکی غربەتیدا ولناوچەی حکومەتیکی وەکو ایران اقامەت بکا.

لەبەرئەوەی کەلشکرەکەشی الآن درابووە وخوی تنها مابووە مجبور بو یابیتە سابلاغ دابنیشی ویابچیتەوە بو عراق. لەبەرئەوەی کەهاتنە سابلاغی بەتکلیفیکی زور تەواو ئەبو وبلکو هاتنە سابلاغەکەی لەنظر خزمەکانیا هیچ فرقیکی نەئەبو لگل اختیاری وظیفەکەیا. بویە مجبور مابو کەبچیتەوە بو عراق.

٤-بو ئەوەی کەخذمەتی اجدادی ایمە بەووتەی ناحەزان پایەمال نکری ولەسازمانی خذمەتگزاری ونیشتمان پەرستیدا بی موقع ونشان نەمی‌نی‌تەوە. بەخوم وخزمانی فامیلی بەهرامی حاضرین هەتا أخر تنوکی خوین‌مان لەژیری پی ألای بەرزی کوردوستانا فداکاری بکەین. وچە تجرەبە وحرەکاتیکیشم پی‌ئەسپیەری امادەم بو امتحانی پاکی.

محمد أمین

قادرخان زادە

بو جنابی محمد امین‌خانی قادرخان زادە

ایمە زور لەعملیات واقداماتیکی انگو رازین. بەلام ئەبی ئەو تالآنە اعادە بکەنەوە کەلەلاین أغایانی بانەی درحق بەدی بناویلەو بانەزیر کراوە ئەو وختە حاضر ابین بو برایەتی تان چونکە وعدم بەصاحب تالآنەکە داوە کەبویان استرداد بکەمەوە.

۳۲۵/٦/۲۰ قاضی محمد

حقیقتاً لیرەدا قاضی محمد بەچاویکی بی لطفانە وەرامی حمەأمین خانی دابووە چونکە لەو وختەدا حمە امین‌خان تمثیلیکی هەموو بانەی اکرد. وئەو نوسراوەش بە مطابقی رئی زور بگزادەی بانە نوسرابو. حقوانەبو اوا کتوپر قاضی محمد منطقەی بانە لەخوی بتەکی‌نی‌تەوە ولەاختلاتی کوردایەتی سلبیان بکات. حقوابو نوسینەکەی نختیك شیرین تر وسیاسیانەتر بوایە. چونکە عشائرەکان جنیویان پی بدەی بلایانەوە خوشترە نەوەکو داوای شتیك‌یان لی‌بکەی کەتا اندازەیك بەحقی وعادەتی بزانن.

ئەو سلبی اعتمادەی قاضی محمدە بو بەهوی ئەوە کەعشیرەتی بانە هەتا نهایەت لەضدی قاضی محمد بدوین ومتفقاً لگل حکومەتی ایرانا اشتراکی هەموو وینە حرەکاتیك بکەن لەضدی تشکیلاتی مهابادا. اصلی موضوعی تالانی ئەو دو دی‌یە ئەوەیە کەلە وختی خویا بعرض‌گیانرا کەفرماندەی هیزی سردشت زیرو ناو-لەدی بناویلە وبانەزیر محمدبگی کوری احمدبگی حاجی نائب ئەکوژی.. بانەیەکان مسببی ئەو حرەکاتەیان بە (رسولی محمد أغای) کلّوی زانی.

چونکە بانەیەکان ئەو دو دی‌یەیان بەهی خویان ازانی وئەو أغایەش لەفرصەتی کومەلە و قاضی محمدا ئەو دو دی‌یەی خستبو ژیر تصرّفی خویەوە. اجا لەدوای ئەوەی کەلشکری بانەی لەجبهە اذن ادریتەوە. بانەیکان قسمیکی ئەو لشکرە انین مالی

رسول أغا- ناو وخزمەكانی لەتولەی خوینی حەمبگ وتصرفی ئەو دی‌یانە تالان ئەكەن. وتالانەكە بەسەر هەمو مشتەرەكیكی لشكرچیدا دابەش ئەكەن. حقیقتاً حمە امین‌خان شخصاً خوی نەچوبو بو ئەو حرەكاتە. بەلام حمە عزت بگ وعبداللەبگی برای چوبون واشتراكی خیر وشەری ئەو تالانەیان كردبو اگر قاضی محمد ناوی ئەو تالانەی نەهینابایە. بانەیەكان حاضر نەبون كەدوبارە بچنەوە ژیر نفوذی قاضی محمد. بەلام بختی زورداری دەولەتی ایران لەشانصی قاضی محمد بەقوەتتر بو. كەقاضی محمدی اجبار كردبو بو بهانە وبلگەیكی أوا سخت.

## مذكرات لگل ایرانا

اجا محمد امین‌خان لەوكالەتی بانیەكانەوە لگل حكومەتی ایرانا كەوتە مخابرە. داوای تنفیذی ئەو قراردادەی لەحكومەتی ایران اكرد كەلگل أغای حمە رشیدخانا بستبویان. وئەی ویست درحق بەهمو بانیەكان تطبیق بكری.

لەروژی ٢٦/٦/٣٢٥ تەواوی بگزادەی بانە لەدی-شوی- ملاقاتی سرهنگ (أیرم) فرماندەی هنگی ٢٢ بانەیان كرد اتفاق لەبینی هەردولادا واقع بو كەمحافظەی امنیتی منطقەی بانە وپوسطەكانی حدودی بانە بە أغواتی بانە بسپیرەرین. ولە هەرچوار تائفەی بانە نگهبانی محلی- بەپی نسبەت تعین بكری كەمجموعی نفراتەكانیان اعتبار اكران بە ٣٦٠ نفر وهەرنفری لەقراری ١٠٥ تومان موچە هەبی وافسرانی ئەو نفراتەش لەأغواتی بانەی بی. مأموری گمرگو اغصارو بلدیەو مدیری ناحیە-لە اغواتی بانە تعین بكری. هیئتیكی چوار نفری كەعبارەت بون لە(حمە سلیم بگی بهرامی وقادرخانی أرمردە ومحمودخانی روستمی وعبداللەبگی سرحدی بەوكالەتی هەر چوار طائفە چون بو بانە بو اشتراكیان بەاندامی هیئتی ادارەی حكومەتی بانە. كەقرار وابو هیچ فرمانیكی‌حكومەتی بەبی رئی ئەو هیئتە نافذ نەبی. وهەمو فرمانیكی عشائری بەهوی ئەو چوار اندامە بگاتە دەست حكومەت وبەتوافقی نظری ئەو چوار اندامە همو فرمانیكی فردی وعمومی عشیرەتی بانە پیك بی.

بەلام فلسفەی گەورەی ئەو هیئتە تنها ئەوەبو كەلەو وختەدا ایرانیەكان نمایشیكی‌دعایە بەو هیئتە بی‌نەموجود. وبلاوی بكەنەوە كەعشیرەتی بانە قطعی ارتباط واتصالیان لگل كومەلەدا هاتوە ومشتركًا لگل حكومەتی مركزیدا خریكی

عملیات واقداماتن بو ئەوەی سمعەی تشکیلاتەکەی قاضی محمد لەخارج پی بشکینن. وعشائرە کوردەکانیش تشجیع بکەن بو اعادەی ثقەت واعتمادیان بەحکومەتی ایران. جا لەسەر ئەو قراردادەی سەرەوە بەناو وامضای محمد امینخانی قادرخان زادە وقادرخانی أرمردە. حمە رشیدبگی بلکی-عبدالله بگی سرحدی- نصراللهخانی روستمی- عبداللەخانی شهیدی- احمدبگی حاجی نائب- عزتخانی حسنخانی نمشیر- سعیدبگی بهرامی- قادرخانی فرجخان- حمە کریمبگی نجنە- کریمبگی کانی ناو- محمودخانی روستمی- تلگرافیك بەموضوعی خوارەوە بو شاە نوسرا. رونوسی درا بەوزارەتی جنگ وستادی أرتش ورئیس الوزرا ومجلسی پرلمانی ایرانی.

اعلیحضرتی امپراطوریەتی شاهنشاهی همایونی جوان بختی ایران

بەکمالی صداقەت وخوش بەختی بەپیشوازی خذمەتی دەولەتی شاهنشاهی حمیمیەتی میهنپەرستی خومان وعشیرەتی بانە تقدیم دەرباری شاهنشاهی ئەکەین. هەتا أخر نفس لەریگای میهنپرستی وخذمتی نیروی غرامی شاهنشاهیدا حاضری خذمت وجان نشارین.

بژی شاهی جوان بختی ایران. زەندەباد ألای ایران پایندە بی نیروی غرامی شاهنشاهی. هەمان أغایانی کە سویندەکانیان لەروژنامەی ژمارە ٦٩و ٦٨ کوردوستانا چاپ کرابو. وسویندیان بو حمە رشیدخان وقاضی محمد خواردبو کەهەتا أخر تنوکی خوینیان لەریگای قومیەت وکوردوستانی أزادا کوششی پیشکەوتنی أمانجی ملی بکەن. هەرهەمان أغایان بون کەلەمدەیکی زور نزیکا سویندەکانی خویان فراموش کرد. دوبارە بەمضمونی سەرەوە تلگرافی زندەبادی پەرچەم وشاهی جوان بختی ایرانیان- بەایستگای تاران رائەگەیاند.

جالەعینی روژا ئەو أغایانەی سەرەوە بەاستثنای أغای حمە أمین خان هەمویان چون بو بانە. ولەباشگای افسران- پزیرایی کران وئەو غائلەیە کە لەحرەکاتی شهریورا لەکلەی هیزی أغایانی متهم وخاون سابقە موجود بو بەتەواوی رفع کرا. بەژمارە ٣٢٥/٦/٣١\\١١٠٠٠و ٣٢٥/٧/٧\\١١٥٠٠ لەلاین رزمأرای رئیسی ستادی أرتش وەبرقیاً وەلامی تشکرات‌و احساساتی بەرزی أغایانی دایەوە. نظر بەروحی یك جهتی‌و دەولەت پەرستی ٢٧ تەن قندی حکومەتی بو ئەو أغایانە هاتەسەر تقسیم کردن.

بەلام ئەو قندە بەتەواوی حیاوناموسی أغایانی بانەی پایەمال کرد بگزادەکانی بانە وەکو (پشیلەی) برسی بەدیار ئەو قندەوە کەوتنە میاومیاو- سرهنگ أیرومیش- ئەوقندەی کردبو بەچکی دەستی هەر روژە ممانعەتیکی بوتوزیع ئەهینا پیشەوە. چونکە ئەیزانی هەتا ئەوقندە موجودبی هەمو وینە دنائتیك بەو أغایانە اختیار اکات بەلام کەقندەکە نەما جوابی نادەنەوە.

هەتا سرهنگ أیروم بەژمارە ١٢٦٢٩و روژی ٣٢٥/٧/١٨ بو سعید بگی بهرامی أغای نەنور-پهلوی دوژ. قاقەزیکی نوسیبو اگر ١٠ دە گهن کا تحویلی دەولەت نەدەی لەتجهیزی قند بیبەش اکریت.

هەرلەو وختەشا ایرانیەکان بیری انتقامیان هەبو کەروژیك ئەبی ئەو أغایانەی قند پەرستانە داخ بکەن.. انجا أغای (سرهنگ أیروم) بلاویکردەوە کەئەو قندە ادری بەقواتی مسلح، لازمە هەرأغایەی تعدادی اسلحەی خویان بکەن. هەتاوەکو بەپی تفنگ چی شکرەکە دابەش بکری. بەوناوەوە اسلحەیکی زوری لەسەر بگزادەکانی بانە تسجیل کرد، أغای واهەبو چوار تفنگی نەبو کەچی بالعکس بو طماعی جیرەی قند ٤٠ تفنگی نوسیبو ولگەل ئەوحالەشا هەتا نهایەت ئەوشکرە ندرا بەأغایان وبو حکومەتی ایران مایەوە. لەوختیکیشا کەتشکیلاتی ایران کرایەوەو عشائرەکان لەسلاح تجرید کران. بەپی ئەو قائمەیەی کەلەوەختی خویا أغایان بو قند دابویان بەسرهنگ أیروم-اسلحەچنی کران. وئەوەی ئەو مقدارە تفنگەی نەبوایە بەاجباری پییان اکریەوە.

## کومەگی بانە بەحکومەتی ایران

لەوختیکا کەسەردەشت و ربط لەلاین لشکری بکری حویضی بارزانی لەمحاصرەدا بو. وعشاتری ککوی ودەشتەتال- ریگای بینی بانە وسەردەشتیان قگع کردبو. بو ئەوەی کەعشیرەتی بانەو بارزانو کلوو دەشتەتالو هەرکی بەبن بەدوژمنیکی خوینین وهەتا نهایەت بانە نتوانی لەحکومەتی ایران جیا ببیتەوە. ولەنقطەی دوهەما بو بەرهەلستی حکومەتی قاچی محمد وسمعە شکانی مدەنی ئەو کوردوستانە أزادە جنگیکی اهلی بنیتەوە. وبەهوی ئەوجنگە سیطرەت بەسەر ریگای بینی سەردەشتو بانەدا پیابکاتەوە.

بەژمارە ١٤١٢٦و ١٤١٦٨\٧و١٣٢٥/٨/٨ ستادی بانە ابلاغی أغایانی بانـەکرا.
کە بو سەر کوبی عشائری کلوی لەمقابل خوینی حەمەبگی احمدبگ بچـن بـو منطقـەی سەردشت وعشیرەتی کلوی بخەنە ژیر تصرف هەتا نهایـەت لـەعینی وەختـا لەهـەرچوار طائفەی بانـەی لشـکر کوکرایـەوە. بـو امـدادی حکومـەتی ایـران چـون بـو منطقـەی سردەشت. ولەناوچەی (هورازە وبناویلە ونمشیر-لشکر بەزیان کرد. لەعینی وەختـا مـام عزیـزی کـوری قرنیأغـای مامـەش بـە ٦٠٠ سـوارەوە لـەقاضی محمـد هـەلگرابووە وعبداللە خانی رئیسی منگوریش لەسەر تأثیراتی ملاخلیلی گورەمەر لەقاضی محمد هلگرابووە رئیسی عشیرەتی وجاغ سلیم أغای بایز- ئەویش کلکـی عصیـانی خستبو سەرشان.

لـەعینی وەختـا پروگرامـی دەولـەتی وهـابو کەئـەو عشـائرانە بـەهوی حرەکـاتی سەربازی دەولەتی بەیك روژ پەلاماربدەن. وختەتی کورتەك) هـەلبگرن لـەشمال وجنـوب وغربەوە پەلاماری سابلاغ بـدەن. بـەلام خـوش بـەختی قـاضی محمد ئـەو پروگرامـەی تارومار کرد. أغای مام عزیـز وعبداللەخـان وسـلیمأغا- بـەرۆی زەردەوە رویـان کـردە عـراق وپنـاهیدەی عشـیرەتی میـراودەلی بـون و(ملاخلیلیـش)-لـەلاین مصطفـی خوشناوەوە بلاقید وشەرت هینرایە سابلاغ. بەلام لشکری بانە هەتا نهایەتی حرەکـات، هەر لەو ناوەدا ١-مـلاخلیلی گورەمەر-یکیکبو لەملاباشەکانی ایـران. زور متعصبـی دینی بو لە ٩٢٩دا لەسەر قضیـەی شیعە شش مـانگ لگـل حکومـەتی ایـران بەشـەر هات. عشیرەتی مـنگور ومامـەش وسویسـان وگـەورك کومـەگیان پیکـرد. ئـەو ملایـە لەناو ئەو عشائرانەدا مرکزیکی بەرزی دینی هەمو زیـاتر سـەری ئـەو لـەجیاتی خـواو پیغمبر استعمال اکرا بو سویند. لەنتیجەدا بەچنگ ایرانیـەکان شکسـتی هینـا. پنـای بەحکومەتی عراق برد. هەتا ٩٣١ لەعراق بو. حکومەتی ایران لسر تشبسـاتی عـراق عفوی کردو چووە بو ایران بەلام لەو قضیـەی دیمکراتەدا ضدی قاضـی محمد بو. لگل ایرانیەکان دوست بوە خەریکی محافظـەی ریگاوبانی ایرانیـەکان بـون. ولەتسـلیم بونـی دیمکرات لشکری بانە هەتا (کەلی کورتەك) تعقیبی لشکری قاضـی محمدیان کرد. ولەدی (کاولان وکوران-مـلاقاتی سرتیپ همایونییان کـرد واجـازەی گەرانـەوەی دانـی کەبچنەوە بو بانە ولـزوم بـەچونی سـابلاغیان نکـری. بـەلام هـەتا نهایـەت أغـای حمـە أمینخان شخصی خوی اشتراکی ئەو لشکرکشیە نکردبو. بەلام حمە عزتبگ وعبـداللە

بگی برای هەتا نهایەت لگل ئەو لشکرەدا بون. لەهەموو شتیك سیرتر ئەوەبو لەئەوّل روژی تسلیم بونی سابلاغ.أغای حەمامین خانی قادرخان زادە لەرغمی ئەو خذمەت گزاریەی کەبو أغای سرتیپ أیرم- بەخەرجی دابو. کیچی کەوتە کەولەوە-ئەویرا یك ساعەتی‌کە بەدیار قندەکەی أغای سەرتیپ أیرمەوە- بی‌نی‌تەوە. بەپلە پەل خوی فریدایەوە شیوەگویزانی- عراق.

## تشکیلاتی دوای روخانی کومەلە لەبانەدا

لەدوای انقراضی حکومەتی دیموکرات أغای عبداللەبگی سەرحدی کرا بەسەرپەرستی نگهبانی حدود. ومأموری اسلحەچنی عشائری بانە بەلام لەدوای چند روژیك لەترسی گرتنی ایرانیەکان ئەویش فراراً هاتە عراق وچو بو دی گرمکی ناحیەی پینجوین هەتا نهایەتی سالی ۱۹۵۰ ئەویرا بچیتەوە بو سیوان‌بەندی ایران.
وعبداللەخانی شهیدیش کرا بەسەرپرستی نگهبانی پاسگای ریگای بینی بانە وسیوان‌بەن وکانی ملا احمد وحدودی دەشتی کانی دزان و۳۰سی نفریك امنیەی محلّی بەمقرەراتی مخصوص بو یقینی کرا. بەلام لەتشکیلاتی اخیرا ئەو نفراتانەیان بو هینایە سەر (٥) امنیەی فخری.
ولەدەستەی أغای روستمی وقادرخانی أرمردە وحەمە رشیدبگی بلەکیش تا اندازەیك ئەو اصولە رعایەت کرا وچند نفریکی امنیەی محلی‌یان بو تعین‌کردن. بەلام حقوق وموچەکانیان لەلاین افسرانی مخصوصی ایرانی خراو بەنفراتەکان نەئەگیشت.
وبەناوی سوابقی شهریوری ۳۲۰ تنها حەمبگە رەقە-یان گرت لەپاش مدەتیك فشار وروتانەوەی پولوپارەیکی کەپی‌یانەوە شك ابرد برەلایان کردەوە وبە ۹ هەزار تومان مشمولی عفوی شاهانە کرا بەتأییری فشاری أغای حەمە بگە رەقە-أغایانی حەمە سعیدبگی بهرامی وحەمە سلیم‌بگ وحەمە أمین‌بگی بهرامی ناوان هاتنە عراق. حکومەتی عراق هەتا نهایتی سالی ۹٤۸ لەکرکوك خانەشاری کردن ومانگی ۷,٥۰۰ دیناری بو بریبونەوە. بلام اخیراً لەلاین عراقەوە أزاد کران وتسلیم نفسیان بەایران کردەوە بەاستنادی امری عفوی شاهانەی ژمارە ۱۷۱٦\۱۸/۲/۳۲٦و ۱۷٦۷۲\۲٤/أبان ۳۲٦ وسابقەدارانی ایرانی استناد بەو امری عفوی شاهانە لەهەمولایکەوە خویان بەحکومەتی ایرانی معرەفی کردەوە. بەوپی‌یە نهایەت بەقچای

ایرانی درا. هەموو عطفی حکومەتی ایـران برامـبر بـەو هـەمو خیـانت وگردن‌کەشـی وهلگرانەوەی بانەی لەدیمکرات تنها ئەو ٢٧طــەن شکرە بـو کـە ئـەویش هـەتا ایسـتا بەأغایان نگیشتوە. وبلکو بەسایەی ئەوقندە شومەوە نزیکی ٧٠٠ تفنگیك‌یان خـارجی حقـائق- بـەناوی سـرهنگ سـلامتانەوە تسـلیم بـەأغای سـرهنگ أیـروم-کـردەوە. بەاضافەی تفنگە حقیقیەکانی خویان.

## فصلی (٦)

## ناصرخانی قشقا لەناوچەی شیراز خراسانا

لەپیش‌و رگیرانی جلەوی وظیفە لەلاین قوام السلطنەوە. دەولەتی ایـران تـەرزیکی هەرج ومەرەجی ورگرتبو ولەلاین قوام السلطنەوە بەنمایش وتفننی خوارەوە بەربەست و چارەکرا.

لە ٢٨ مردادی ٣٢٤ (٢٠نفر لە افسرانی ایـران کـەعبارەت بـون لـە دو سـرهنگ و١٨ چابگی مختلف الدرجـە. دوکـامیون دولتیـان بـە١٠٠ تفنگـەوە ومقـداری فیشـك وچەند دستگای تلفـون وهینـدی اسلحەی اوتومـاتیکی تریـان هلگـرت وفـراراً سمتـی مجهول وتمردیـان اختیـار کـرد. ودسـتیان کـرد بەتوسـعی عصیـان دیسـان بـەناوی أزادی‌خواهیەوە لەمرکزی (مراوتەپە) ١٢٠ نفر امنیەی دەولەتی‌یان کرد بەأوالی خویان ولەهەمو لایکەوە پـەلاماری خراپـەیاندا. لـە ٣٠/مـردادی ٣٢٤ لـە(گنبـدی کـاوس) لەبینی ئەو هیزە ونیروی دەولتیدا بو بەشـەر. لـەو أفسـرانە ٧أفسـر کـوژران ودو افسـر بریندارکـران ودو نفـری ژاندارمـری کـوژران ودو نفـری پاسـەوان بریندارکـران. ولەشهریوەری ٣٢٥ لەشاری (شاهی وساری) لەبینی افرادی تودە ودەولەتیدا بو بەشەر لەهـەردولا کـوژرا وبرینـدار زوربـو. لـەعینی وەختـا لـەمازندران لـەبینی أزادی‌خـواە ومرتجع‌خواهەکان بو بەشەر بەکوشتاریکی زور دوایی هات. ولە ٣ مانگی مـهری ٣٢٥ لەلاین دەستەی أزادی‌خواهی قزوین٦٠٠ دوکـانی ایرانی‌پرەسـت سـوتاندرا. لـە٥مـانگی مهری٣٢٥ لەزنگان لەلاین افرادی حزبـی تـودە بـەر درگـا بەنویژکـەرەکان گـیرا. هـەر لەمزگەوتا کوشتاریکی زور لەبینی نویژکەرانا واقع بو.

هەرلەمـانگی مهری ٣٢٥ لەمازندران لەبینی افرادی تـودە و مـأمورینی دەولـەتی بو بەشەر. مأمورینی دەولەتی لەوظیفە درکران. وافرادی تـودە چونـە جیگـای ئـەمان.

لەناوەراستی مانگی شەهریوەری ٣٢٥ لەاصفهان وشیراز ومشهد وخراسان. دسائس وتمرد لەلاین عشائری بختیاریەوە دەست پی‌کرا. تأثیری ئەو حرەکاتە حمل کرایەسەر بی نظامی وبی وجدانی فرمانداری (چوارمحال) حمصام). وأغای مظفر فیروز-وزیری کاروتبلیغات ایران بەطیارە بو تحقیقی ئەو پیش أمریە چو بو اصفهان. لەئەوەل دابەزینیا دەستوری دا بەگیرانی فرماندار حمصام- وامیر بهمنی بختیاری ومرتض قلی وسرهنگ حجازی فرماندەی لشکری خوزستان وأغای شیروان مدیری روژنامەی میهن-وحالاً تقدیمی‌کردن بەدیوانی عرفی. ودیوانی عرفیش لەوناوچەیەدا اعلان کرا.

## تلگرافی ناصرخانی قشقا بو تبدلی شکلی حکومەتی حاضرە

لە ٣٠ شهریوەری ٣٢٥ لەلاین عشائری أزادی‌خواهی جنوبی ایران حملە کرایە سەر مرکزەکانی اصفهان وشیراز وخوزستان واهواز. لەژیر قیادەی ناصرخانی قشقادا تمرد وأزادی‌خواهی اعلان کرا. لە ٣١ شهریورا تلگرافیک بەموضوعی خوارەوە بو قوام السلطنة نوسرا.

جنابی اشرف أغای قوام السلطنە سەرەك وزیری دەولەتی شاهنشاهی

هەروکو بخاطری مبارکتان گیشتوە وچندجاریش تکرار کراوەتەوە. کە لەدەورەی ٢٠ سالانی رابوردودا لەمنگقهی فارس انواع کاری نالایق رویداوە. مکرر عشائری ئەو منطقەیە بو چارەی ئەو باسە هاتوون بو لام. ومن نصیحتم کردون. ومیدانی خراپەم نەداون. ئەگەر تماشای دوسیەی شارەبان ونگهبانی ئەو شارانە بکەی بوت معلوم ئەبی ئەو دەورەی بەسەر مناطقی فارسی هاتوە هیچ هوزی نەی‌دیوە.

امرو وضعیەت گیشتوتە رادەیك کەتەواوی دانیشتوانی ئەوناوچەیە. بوهەقی پایەمال کراوی خویان. امادەی اقدامات وتی‌کوشینن ئەو بەسەرهاتە نالەبارە لەوەزیاتر بەمن محافظە ناکری. اگرهتا ایوارەی دووشمبە کەریکەوتی اولی مهرماه ٣٢٥ اکات. تکلیفی قطعی معلوم نکری. هەر بەسەرهاتیکی ناشیرین رویدا. لەمقابل تأریخ و ووجدان بەمسئول نەزانەریم. چونکە تەواوی عیلات وعشائری فارس بەو حرەکات وقضیەوە علاقەدارە.

١-فوراً تیكدانی كابینه وتعینی پیاوانی ایش كەر وباش.
٢-گورانی سەركردەی ادارەجاتی. أرتش-و گورینەوەیان بەسەركردەی باش ونیشتمانپەرست.
٣-محاكمه وتجزیەكردنی ایش كەرانی ٢٠ ساله دەوری دكتاتوری رضا شاه.
٤-ورگرتنەوەی ادارەی كاری منطقەی فارس لەلشكر وتودیعی بەكشوەری لەلاین اهالی وهلبژاردراوی منطقەی فارس كار وپیشه وفرمان سەرپەرشت بكری.
٥-تشكیلی انجمنی ایالەتی وولایەتی لەمركز وشارانی جنوب وفارسا.
٦-اعادەی نظر بكرێتەوه بو زیادكردنی نمایندەی مجلسی پەرلەمان بەپی نسبەت.
٧-بخشینی مبلغیك پارەی كافی بو صرفكردنی بهداری وفرهنگ وریگاوبان وریكخستنی پاشكەوتنی ناوچەكانی فارس.
٨-تازەكردنەوەی بیر لەبطالكردنەوەی قانونی مضره ومفسده كه منافی قانونی اساسی ورفاهیتی ملته.
٩-پیك گیاندنی ریگای أسن مركزی بەشیراز وبوشهر وقیرتاوكردنی ریگاكان.

محمد حسن قشقائی خسرو قشقائی ملك منصور قشقائی محمد ناصر قشقائی

لەروژی ٣ مهرماه هئیتیك كەعبارەت بون لەأغای نیكپور معاونی ادارەی رئیس الوزا وأغای سردار حكمت أستانداری كرمان وعلی هیئەت دادستانی كشور وسرپاس صفایی رئیسی تشكیلاتی شهربانی- بەطیارە واردی شیرازبون وئەو تلگرافەی خوارەوەش لەلاین قوام السلطنەوه بو ناصرخانی قشقائی لەوەرامی تلگرافەكەیانا تقدیم كرا.

أغای محمد ناصر قشقائی

متأسفانه مفادی تلگرافی تو وعملیاتی كه لەفارس شروعی پیكراوه خارجی امیدەواری من بو. چونكه تو لگل ایلی قشقادا پیشكەوتوترینی ملّەت بون لەمیژوی ایرانا بەهیچ رەنگیك نابی بو أرەزوی اشخاصی فساد لەضدی دەولەت تشكیلی مخالفات بكەن. بو ئەوەی كه لەأخرا ندامەتتان متوجه نەبی. ئەوا فوراً هینتیكم بو حصولی تفاهم ومذاكره روانه كرد كەروحی میهنپەرستی بەانجام بی نی.

احمد قوام

لەلاین علماو اشرافی بوشهرو عشائر ئەو تلگرافە بو قوام السلطنة نوسرا.

جنابی اشرف قوام السلطنة

هەرچندە معلومە کەمدەتیکە روحی دیمکراتی لـەلاین ایـوەوە اعـلان کـراوە بـەلام تالان کران وغارت گرانی دکتاتوری رضا شاه هەتا ایستا وازیان لەافسادات وگیانی مرتجعی زورداری نـهیناوە. لـەاصولی گمـرگ وعمـران واقتصادیـات وتجـارەت وآزادی حقوق وزندەگانی خلکی وەلاتی ایمە بی بەش کـراون. جا عملیـاتی زور بیـژە مـاموره ناپسندەکانی دکتاتوری رضـا شـاهی تـأثیری کردوتـه سـەر گیـانی هـەمومـان. پـی ویسـته لـەمودای ٤٨ سـاعەتی اخیرا هـەمو اولادەکانمـان لـەنظام وظیفـه-عسـکری اجباری أزاد بکەن. والاّ ناچـارین بـو أزادی منالـەکانمان اسلحەتان بدەیـنی. بوئـەوەی لەنظر قانون و وجدان مسئول نەبین. ئەوا أزادیخواهی خومان بەجهان رائەگینین.

محمدیان      علی تنگستانی      فتح‌الله حیات      امام جمعه      هاشم

عدنان

لەپاش ٤٨سعات (بوشهر وگازەرون) بو بەجیگای تاخت وتازی چتەکاری. لـەبینی عشائر وسەربازا بو بەشەر. قوەی مرکزی گازرون کـەعبارەت بـون لـه ٧٠٠ نفر هـەتا روژی ١٠/٧/٣٢٥ ئەو هیزە لەمحاصرەدا مایەوە. بەواسطەی طوپ وطیارە مدافعەی سختیان اکرد. بـەلام لـەروژی نـاوبراوا لـەژیر فرمـاندەی سـرهنگ سیمین- تسـلیمی نفسیان بەعشائرەکان کرد.

لەشەوی یك شمبەی ٣١ مهرماه ٣٢٥ لەمجلسی وزیرانا موافقەت کرا بـو تسـکینی بەسەرهاتی فارس أغای سرلشکر زاهدی) بچیتە فـارس. لـەپاش گرانـەوەی سەرلشکر زاهدی لەلاین ناصرخانی قشقاوە ئەو تلگرافە تقدیمی قوام السلطنه کرا.

جنابی اشرف قوام السلطنة

لەتعقیبی عرائض ومطالبی کەتقدیم کرابو. دوینی بـەهوی تیمسـار سەرلشکر زاهدی وأغای ایرهمایونی- اوامری جنابی اشرف ابلاغ کرا. فدوی باکمالی اخلاصیەت امری پەراگندەی بەعشائرەکاندا.

لـەحالی حـاضرا لەسرانسـری ناوچـەی (بنـادری کوردنشـین وفـارس) أسـایش واستقرار بەردەوامە. زور خوشوقتم کەدەولەتی شاهنشاهی بەو اندازەیـە دارای عطـف ودلنوازیە برامـبر بەملـەتی میـهن پەرسـتی خـوی. وسـەربەرزم بەمەی کەدەولـەت فساد

ونیشتمان‌فروشانی ایرانی ریشه‌کیش کردوه دوباره اخلاصیه‌تی خومو برایانم بعرچی پیشگای بەرزی جنابی اشرف ئەگەینم. امادەم بوجان نشاری انظمه وقانونی اساسی ایران.

محمد ناصر قشقائی

وضعی ناهمواری قشقا بەمندرجاتی خوارەوە تسکین کرا

١-تعینی مأمورانی کشوەری وعسکری بەنظریەی ناصرخانی قشقائی بی.

٢-چاوپوشی لەحرەکات وبەسەرهاتی رابوردو.

٣-تعینی دوبرای ناصرخان بەنائبی مجلسی پرلمانی مقبل.

٤-شریکه وبانکی تجاری سلفه بدات بەزراع واهالی ئەو ناوچەیە.

٥-لەژیر ترتیباتی ناصرخانا حکومت اقدام بکات بەتوسعی عمران وبەهداری وفرهنگ ولوازماتی مدەنی.

بەلام وادەرکەوت کەحرەکاتی ناصرخان وقشقا وکوردەکانی بختیاری بەپنجەی انگلیس هاتبیتە وجود. ومتلەیەك ومعمایکی‌سیاسیانە بوبی لەأغای قوام السلطنەیان داهینابی. وفسلفەی ئەو حرەکاتی ناصرخانە تنها ئەوە بوبی اگر حکومەت سەربە انجمنی ایالەتی وولایەتی أزربایجان بگری.جنوبی ایرانیش مستعدە بو داواکردنی عینی امتیاز وجیابوونەوە. جابو ئەوەی کەدەولەتی ایران بو لناوبردنی فکری أزربایجان تی بکوشیی انگلیس ئەو متلەیەی لەایران داهینا. ولەپاش پیك هاتنی مرامیکی سیاسیانەی لەجنوبی ایرانا ئەو موضوعەء لەناو هلگرتەوە وتوجّهی حکومەت وقوام انجا بەتەواوی خرایە سەر غائلەی أزربایجان وبەسەرهاتی جنوبی ایرانیش بەوپی‌یە دوایی هینرا.

## فصلی (٧)

## اسراری ملا مصطفی بارزانی هەتا ١٩٥٢

عشیرەتی بارزان هەرلەقدیمەوە گردن‌کەشی وسەر بەخویەتی‌یان اعلان کردوە. فامیلی ایستای شیخانی بارزان. روحی تمرد وعصیان‌یان برامبر بەحکومەتی تورك‌و عەرەب کردوە بەصنعەت. هەتا لەزەمانی تورکا چند شەری زور گەورەیان لگل حکومەتی تورکا کردوە. وچند سوتان ودەربەدەری‌یان لەزەمانی تورك بەسەرهاتوە.

شیخ عبدالسلام شیخی گەورەی بارزان لەریگای قومی ونیشتمانپەرستی لەلاین تورکەکانەوە شهید کراوە.

جائەو روحی نیشتمانپەرستیە لەدوای شهیدکرانی شیخی گەورەی بارزان بەارپ بو کورەکانی بەجیما. بەلام سەرچل وزیرکترین کورانی شیخی گەورەی مرحوم (ملا مصطفی)یان ئەو شجاعەت ونیشتمانپرستیەی بو خوی کرد بەضرب المثل وبەناوی حقوقی مغصوبەی کورد خوی نشانی هەمووعالەم دا. وزعامەتی خوی برامبر بەو قومە حق فەوتاوە لەنظر ملتانی بەدەسەلات اشکرا کرد.وبو پاراستنی حقوقی کورد وتشکیلاتی کوردوستانیکی أزاد لەسالی ۱۹۳۲ لەمانگی نیسانا لەسەر هیندی قضایای اداری وسیاسی کەبەرهلستی مبادی سەربەخویی کوردوستانی أزادی اکرد. ولەلاین کبتان لاین-مفتشی اداری هەولیر وکرکوک ولەلاین متصرف جلال بابان-بەوکالەتی انگلیس وعرب هاتبو وجودەوە ولەسەر قبول نکردنی- ئەو أسوریانەی کە لەتورکیا در کرابون-کەبو ضعفی نفوذی مبدئی سەربەخویەتی کوردوستان ئەیانەویست لەبارزان اقامەتیان پی بکری. بەو تأریخە لەبینی عشیرەتی بارزان وحکومەتی عراق بو بەشەر تقریباً ئەو شەرە ۳ مانگ دریژەی بەست وبەکوشتار وخساراتیکی زوری حکومەتی عراق دوایی ئەو شەرە هات

شیخ احمد وشیخ صدیق وشیخ بابو وملا مصطفی کەفرماندەی ئەو أژاوە وحرەکاتەبون لگل چند عائلەیکی گوناەباری ئەو حرەکاتە تسلیم نفسیان بەحکومەتی تورك کرد. وبرانە (انقرە) مدەتیك لە انقرە مانەوە. لەسەر داخوازی شیخ احمد حکومەتی تورك شیخ احمد وتەواوی عائلەی پناهندەی بارزانی تسلیم بەحکومەتی عراق کردەوە بەتأمیناتی حیاتیان. نیرەرانە ناصریە. حلە. دیوانیە. کرکوك. سلیمانیە. هەتا ۱۱ مانگی ژوین ۹٤۲ ملا مصطفی بە۸٦ نفری بارزانی لەسلیمانیە بو ولەلاین حکومەتی عراقەوە بەمقرراتیکی نەمرد ونەژی یارمەتی ادران.

بەهوی گومەگی شیخ لطیفی شیخ محمود بەتأریخ سەرەوە بەریگای بانە وپنجوین وسەردشت وسابلاغ ولاجانا- ملا مصطفی فراراً چو بو دی سمولیچ لگل کاك مامند ومیزا أغای رشو وساکو چو بو حدودی بارزان وعائلەکانیان لگل شیخ احمد وبرایەکانیا لەلاین حکومەتەوە روانەی جنوب کران. ملا مصطفی لەحدودی بارزان ملاقاتی عشائری بارزانی کرد وسەرکومارەکانی هەمو هاندان. ملا مصطفی لگل

عشیرەتەکەیا ئەو مخفرانەیان خستنە ژێر تهدیدوحرەکاتەوە کەلەو ناوچەیەدا تنصیب کرابون ملا مصطفی بە٣سی تفنگ توانی مخفری شاندریك بگری کە١٣ پولیسی تیدابو. ومخفری خیزوکیش کە١٣ نفری تیابو گرتی. و٥٠٠ نفری پولیس بو تعقیبی ملا مصطفی هاتبونە مخفری خیرەزوك ملا مصطفی هەموویانی أسیرکرد وخوی کرد بەخاونی اسلحەیکی زور ولگل حکومتا کەوتە مخابرە و لەبەر نامساعدی ظروف لەحکومتی عراق داوای چاوپوشی کردو حکومەتی عراق رفضی عفوەکەی کرد. وداوای لی‌کرد کەبی قید وشەرت بگریتەوە وتسلیمی نفس بکاتەوە. لەنتیجەدا عفوکرا وعائلەکانیشیان أزادکردن وکومەگی خواردنیش یان پی کرا. ئجا حزبی - هیوا- امید- لەفکری ملا مصطفی نزیك بونەوە. وفعالیەتیکی وختیان أشکرا کرد. وانگلیس لەترسی بلاوەی مبادی شیوعی عراقی هەل پیچا کەاعادەی نظر بکاتەوە بو قضیەی کوردەکان.

سفیری انگلیس نوسراویکی تایبەتی بو ملا مصطفی نوسی کەپی‌ویستە واز لەو کردەوانە بی‌ینی والا بەچاوی دوژمن تەماشای اکریت. ئجا ملا مصطفی مجبور بو بەراگرتنی اژاوەکەی. نوری سعیدیش بو بەرئیس الوزا وماجد مصطفی لەو قابنەیەدا بو بەوزیر الدولة.

هەروکو لەمەوپیش بەعرضم‌گیاندن کەحکومەتی عراق ناوی لامرکزیەتی لە ١٩٤٤دا بلاوکردبووە. بوئەوەی کەلەنەوایای روس بگەن. جا بەو مناسبتەوە لەلاین ماجد مصطفی وەرئیس اول عزت عزیز ورئیس سیدعبدالله وأمر فوج امین رواندزی کەئەمانە عضوی حزبی هیوا بون. بو مذکرات نیەران بۆ لای ملا مصطفی وئەو مذکراتەی خوارەوەیان ترتیب وبەزمانی ملا مصطفی وعشائری ئەو ناوەوە دایان بەحکومەت انگلیس.

١-تشکیلی امارەتیك لەکوردوستان بکری کەعبارەت بی لەکرکوك. سلیمانی. هەولیر. دهوك. خانقین.

٢-یك وزیری کورد لەقابینەدا بی بەناوی وزیری کوردوستان مسئول بی برامبر بەحکومت.

٣-هەمو وزارەت خانەی معاونیکی کوردی تیابی.

٤-تأمين استقلالی مدرسه واقتصادی وزراعی وهەموو اموراتیکی داخلی ئەبی بغیراز استقلالی جیش وپولیس نەبی.

اجا بەناوی ضابطی ارتباطیەوە ئەو شخصانەی خوارەوە لەسەر حسابی حکومەت بون بەعضوی حزبی هیوا ومعتمدی مخابراتی نهینی لەگل ملا مصطفیدا. ١-امین رواندزی -٢-عزت عزیز أمیدی-٣-مصطفی خوشناو-٤-میرحاج -٥-مجید علی-٦-سید عزیز سید عبدالله- ٧- فؤاد عارف -ئەمانە کرابون بەمأموری ریک خستنی ملا مصطفی وحکومەت. بەلام لەعینی وختا هەریەلای باری أشوبا ئەرویشتن وملا مصطفیيان هان ئەدا. وفلسفەی أشکرای ئەو باسی لامرکزیەتە دوشت بو. بو ئەوەی کەتورکەکان نتوانن داخلی اتحادی المانیا بن وخویان لەباوەشی انگلیس دورنەخنەوە. دوهەم أیا روسەکان برامبر بەو حالەتە ئەوانیش کوردوستانیك لەایرانا پیکدینن یا نا. اجا لەپاش گوڕانی باری سیاسەت بەپنجەی ماجد مصطفی أژاوە خرایە ناو اندامەکانی حزبی هیوا. میرحاج ومصطفی خوشنا ودو مانگ اجازەيان ورگرت چون بو لای مصطفی ولەوێوە لەگل حزبی (ژك) ژیانی کوردی ایران کەوتنە مخابرەوە. میرحاج لەجیش حپس کرا. ومصطفی خوشناو فراراً چو بو لای ملا مصطفی.

عزت عزیزیش دومانگ اجازەی هەبو اویش لەعینی وختا متهم کرابو کەگوایا بو اتصالی حزبی (خویبون) چووە بو سوریا. روین فراراً چو بو بارزان. و بکری عبدالکریم- ناویش فراراً خوی گیاندە بارزان. بارزان بو بەهیلانەی سیاسەت وخانەی بیری سەرگەردانی لەهەمولایکەوە. ثورە وحرکات دەستی پیکرد. ضابطان اگریان بەباروتی أژاوەوە نا.

## حرکاتی سیاسیانەی احزاب لەبارزانا

بیان نامەيكيان رسماً بەسفارەتی انگلیس وحکومەتی عراق دا کەغایە لەحرکاتی ایمە هیچ شتیك نیە الاّ أزادی وسەربەخویی کورد نەبی. ئەو بیانیە تأثیریکی زوری کردە سەرحزبی هیوا. لەروژی ١٠/٢/١٩٤٥دا کونگریس حزبی هیوا لەبغدا گیرا. ونوسراویك بەزمانی حزبی هیوا بو جمعیتی بارزان نوسرا ومحمد محمود ضابط ئەو نوسراوی گیاندە بارزان. لە ١٢/٢/١٩٤٥دا لەژیر ریاسەتی ملا مصطفیدا مجلسی

بارزان کوکرایەوە وبەترتیباتی خوارەوە تشکیلی حزبی أزادیيان کرد ومنهج يان عبارەت بو لەو پروگرامە:

١-اتحادي عشائری کورد.

٢-رزگارکردنی کوردوستان.

٣-تیکل بون بەاحزابەکانی أزادی خواه.

٤-ناردنی داخواز بۆ نمایندەکانی دەولەتی خارجە.

٥-نشریات گیاندن.

٦-بربەرەکانی سیاسەتی استعماری دەولەتی عراق.

٧-تنظیمی قوای مسلّح.

بەکاغذی ژمارە ٩/٣٠/١/٩٤٥

حزبی هیوا تقەی‌دا بەملا مصطفی کەرئیسی ئەو حزبە بی. و ملا مصطفی‌ش بەژمارە ١ و روژی ٩٤٥/٢/١٥ ورامی حزبی هیوای دایەوە کە-هەولیر-شقلاوە-رواندز-قرنە-شیتنە-بارزان-موصل-عقرە- زیبار-دهوك-عمادیە-خلیفان-سریشمە-ایران-ئەمانە جیگای حزبی أزادین.

### یادداشتی حزبی هیوا بەدەولەتانی بیگانە

جنابی أغای لوی هندرسن سفیری گەورەی ولایاتی متحدەی امریکا لەبغدا موقع بەغنیمەت ازانری. بەاحتراماتی مخلصانە عرض اکری لەنوامبری ١٩٤٣دا یاداشتیك مان تقدیم کردبون. وداخوازی ضروری ملەتی کوردتان بەعرض گیاندرا بو. وعاطفەی دیمکراسی امریکایی برامبر بەکوردەکان زور تأثیری گەورەی کردبو. جائەو موضوعە ایمەی آزا کرد کەئەو مذکراتەمان پیشکەشی وزیری خاریجەی امریکا بکری.

لەبیرتان ماوە پار لەژیر ریاسەتی ملا مصطفی بارزانی لەشمالی عراق لەمنطقەی بارزانا بەناوی شکایەتی سوئی ادارەی مملکەت شورشیك هلگیرسا. بەلام لەبەر تداخل‌کردنی حکومەتی بریطانیا ئەوهرایە وقفەی پی‌درا. وبریاردرا کەبەاتفاقی دوستانە هەموو ضروریاتیکی کورد پیك بی‌حسب بەاعترافی رئیس الوزرا لەمجلسی پرلمانی عراقا. استناد بەو وعدە ایمەش حرەکاتی بارزان مان راگرت. بەلام لەرغمی

پیكهینانی مطالبی وعد پی‌دراومان. بەقطعی وسیلەی خواردن وپوشاك ومـوادی ژیانیان لی‌قطع كردوین.

غـیری ئـەوەش دەولـەتی انگلیـس بـەهاوكاری عـراق بـو لـەناوبردنی ایمـە لشـكری كوكردوتەوە. لەغیری ئەوەش دعایەی خراپمان لـەضد ئەكـەن. ئـەوا ایمـە ایـوە تـأمین ئەكەین كەهەر شورشیك لەلاین كوردەكانەوە بكری تنها بـو أزادبونـی كـوردەو بـەهیچ بویـەیكی سیاسـی‌كە رنـگ نكـراوە. ملّـەتی كـورد چاوەری‌یـە كەلـەلاین حكومـەتی امریكاوە مغدوریەتی تماشا بكری وئەو باسەی بخریتە ناوندی گفتوگووە.

مربوطـاتی یاداشـتەكەمان-١-یـك نخشـەی سیاسـی كوردوسـتان-٢-نخشـەی كوردوستان لە وجهەی عشـائریەوە-٣-منطقـەی شورشـی بـارزان-٤-نظریـاتی چنـد نوسەریكی خاریجە لەبابەت كوردەوە.

رونوس بو سفارەتی حكومەتی فرانسا وشورەوی وچین لەبغدا.

## توزیعی قوات لەلاین ملا مصطفی‌وە

روژی ا مارس ٩٤٥ لەحزبی هیواوە خبر وەرگـیرا كەلـە ٤ مـانگی مـارسـدا جیشـی عـراق هجوم اكاتە سـەر بـارزان. مـلا مصطفـی‌ش بەتـەرتیباتی خـوارەوە توزیعـاتی قطعات وهیزی بارزانی كرد.

| جبهــە | ناوچــەی حرەكــات | فرمــاندەی مسئول |
|---|---|---|
| ١-شـەرق | شـیتنە-میرگەسـور | مصطفـی خوشناو |
| ٢-روژآوا | أمیدی-برادوست | عـزت عزیـز، عبدالحمیـد بـاقر رئیسـی سـتاد محمـد محمود |
| ٣-جنوب | منطقەی أكری-ریكانی | شیخ سلیمان شیخ عبدالسلام |

ملا مصطفی اخبـاری عشـائری منطقـەی میرگەسور ودولـەمری وشیروان-كـرد كەبچن بو شیتنە. ولـە هـەمولایك اسـتحكاماتی جبهـەكان كـرا. وبەدەسـتوری خـوارە لەلاین مصطفـی خوشـناوەوە بـەتأریخ ٤ مـارس ٩٤٥ ئـەو نوسـراوە درا بەسـرهـنگ رفیق عـارف فرماندەی قشونی دەولەتی عراق.

أغاى سرهنگ رفيق عارف

لپاش تقديم احترام وامان خبر ورگرتووه كەخيالتان هيە لە ٥ مارس بەناوى مانورەوە تقدم بكەن. بەو ناوەوە هەرحادثەيكى خطر بەايوەبگات خوتان مسئولن.

مصطفى خوشناو

فرماندەى شيتنه

## نوسراويكى سفيرى بريطانيا بو ملامصطفى

## لگل هيندى ملاقاتى سياسيانەىكە

روژى ٢٥ مارس ٩٤٥ ستوكس معاونى مشاورى سياسى سفيرى بريطانيا چو بو (هوديان) بو ملاقاتى ملا مصطفى ونوسراويكى سفيرى بريطانياى بەموضوع خوارەوەدا بەملا مصطفى.

جيشى انگليس وعراق بەيكەوە لەو ناوە مناورە ئەكەن. وهيچ فكريكى تجاوزاتيان نيە نابى منع بكرين. ونصيحەتى سفير بو ملا مصطفى زعيم ئەوەيە كەلەدەستوراتى دەولەتى عراق دەرنەچى. وئەو افسرانەى كەلەجبهەدان فوراً بگرينەوە بو بارزان. و ئەو أفسرانەى هەتا ايستا لەبارزان خارج نەبوون فوراً بچنەوە سەر وظيفەى خويان لەقشونى عراقا ويا كوى بو سكونەتى خويان اختيار ئەكەن مجازن بەشەرتى خارجى منطقەى بارزان بى.

جوابى ملا مصطفى بەستوكس ئەوەبو كەقضيەى ايمە قطعيە يامردن يا أزادى-

روژى ٣٠ مارس ٩٤٥ متصرفى هەولير حمسعيد قزاز ومديرى شرطه جميل رشيد ملاقاتى ملا مصطفىيان كرد لە دى (مازنه) بو عينى موضوعى ستوكس ناو ملا مصطفى وەرامى ئەوانيشى هەروا بەرفچ دايەوە. لەعينى روژا گرايەوە بو شيتنه وملاقاتى عشائرەكانى كرد واتحادى لگلا بەستن. قائيمقامى رواندز روژى ٢ أوريل ٩٤٥ مخابرەى لگل ملا مصطفىدا كرد كەروژى ٥ أوريل معاونى مشاورى سياسى موصل ماژور مور- بو ملاقات ديتە (بلە) ئەبى جنابت وشيخ رحمت وافسرەكان هەموتان لەوى حاضرى ملاقات بن. ملا مصطفى لەعينى روژا لەوى حاضر بو بەلام ماژورى ناوبراو نەچوبو.

ڕوژی ۲۲ أوریل مدیری ناحیەی باتاس خبریدا کەجنرال اسماعیل نامق لەبیلاقی صلاح‌الدین-ملاقاتی عزت عزیز ئەکا؟. لگل محمد محمودا چون بو دیدەنی بەلام هەتا ئەوان گیشتنە ئەوی اسماعیل نامیق گەرابووە.

دیسان ماژور مور هاتە بارزان ملاقاتی شیخ احمدی کرد گوتی امری سفیر وایە کەاطاعەی اوامری دەولەت بکەی ولەبارزان دابنیشی مشغولی زراعەت بی. شیخ احمد متأثر بو وماژوریش گەراوە.

اجا لەنتیجەی ئەو هەمو ملاقات وقراردادانە هاتنە سەرئەوەی کەضابطەکان تسلیمی نفس بکەنەوە وهیچیان پی نگوتری. اجا حزبی هیوا وأزادی لە ۳۰ أوریل ۹٤٥دا کونگریسیان گرت وقراریاندا کەضابطەکان تسلیمی نفس بکەنەوە. عزت عزیز واحمد اسماعیل ومحمد محمود لگل (ماژور ونس) هاتنە کرکوك وچون بو بغدا. لەغیراز مصطفی خوشناو ومیرحاج نەبی ضابطەکان هەمویان تسلیمی نفسیان کردەوە.

کەلەو وختەدا ئەو ضابطانە لەبارزان بون عبارەت بون لە:

۱-عزت عزیز عمادیە-۲-مصطفی خوشناو بی‌تواتە -۳-عبدالحمید باقر خانقین ٤-محمد محمود سلیمانی-٥-احمد اسماعیل هولیر-٦-شوکت نعمان عمادیە-۷-حفظ‌الله اسماعیل عقرە-

لەپاش ۲۰ روژ لەبغدا ضابطەکان حپس اکرین ومحمد محمود فراراً لگل جلالی امین بگا هاتەوە بارزان. متصرفی هولیر حەسعید قزاز کەاصلی مسببی ئەو حرەکاتەبو لە ۱۷ ژوییە ۹٤٥ لگل معاونی مشاوری سیاسی کرکوك کبتان چاکسن-لەمیرگسور ملاقاتی ملا مصطفی‌یان کرد. بەلام دیسان بەدلگیری لەیك جیابونەوە. واجا لەهولیرەوە بەشەرحی خوارەوە متصرفی ناوبراو قاقەزیکی لەملا مصطفی نوسی.

ملا مصطفی بارزانی

لازمە تو خوتو روءسای بارزان هەتا ۳ روژی‌تر تسلیمی نفس بەحکومت بکەن والاّ هەر بەسەرهاتیك رویدات گوناهی ئەکەویتە سەرشانی تو.

حەسعید قزاز

متصرفی هولیر

لەعینی روژا نوسراویکی کە لەلاین مشاوری سیاسی داخلی موصل ( کلنل میر بەموضوعی خوارەوە بو ملا مصطفی هات نوسرابو

ئەگەر تسلیمی نفس بەعراق نکەی لەهەموو مرحمتیکی ایمە ناامید ئەبی. لەعینی ایوارەدا لشکری ملا مصطفی وپولیسی عراق دایان بەیکاو امیدی أشتی و تفاهم لەبینی بارزان وحکومەت هەل گیرا.

حقیقتاً لیرەدا انسان اتوانی کەبلی حکومەتی عراق بە منتهای بی عطفی لگل ئەو ملّەتەدا جولاوەتەوە. لەلایکەوە رسماً انجمنی ایالتی اعلان کردوە وبەزوری خلکی خستوتە سەر کلکلەی ئەوەی کەبو ئەو فکرە دادخوازی بکری. لەپاش ئەوەی کەئەو فکرە لەکلّەی گنجان وأزادی خواهانی کوردا ترسبی کردوە انجا تعقیبی ئەو شخصانە اکات کەئەوّل جار بەدەنگی حکومەتەوە هاتوون وگوییان بو رئیس الوزرای عراق ووزیر الدولە راگرتوە.

لەدرجەی دوهەما اگر حکومەتی عراق منظوری خوین ریژی نەبوایە یعنی نەی‌اتوانی فکریکی مسالمەت کارانەی تر لگل عیلی بارزانی اتخاذ بکات. ومتصرفی هولیر حمە سعید قزّاز لەوناوچەیە دوریخاتەوە. کەطریقەیکی فتاك وجبّارانەی بو فنای ئەوعشیرەتە بکار اهینا.

أیا هەر مطالبی کەملا مصطفی لەحکومتی عراق داوای کردوە. ئەو ضرەر وخسارات وخوین ریژیەی هیناوە کە بەسەر حکومەت هاتوە. وأیا بو سمعەی حکومەتی عراق ئەمە شتیکی باش بووە. کەچند هەزار مالیك لەملەتی خوی لەسەر نظریەی شخصیك کەتنها بونان وژیانی خوی أمانجی لەو قضیەدا گرتوە والاّ هیچ مقاصدیکی تری نەبووە بو پیشکەوتنی حکومەت. بەنظریەی ئەو موظفە ئەو ملتە اوا دەربەدەری ولاتان بکات ولەزندەگانی ناو نیشتمانی خوی دوریخریتەوە وبەخوین رژانی خوارەوە بدناو بکری.

## تقەی تفنگی اسعد خوشەوی لەبارزانا

لە ۱۰ مانگی اوت ۱۹٤٥دا اوامری حکومەت صادر بو کەهەر بارزانیك تصادف بکری تقەی لی بکەن یا بیکوژن ویا بیگرن. لەو وختەشا رئیسی عشیرەتی مزوری

اسعد خوشەوی ئەچیت بو زیبار. پولیسی مخفری زیبار دەورەی ادەن کەبیگرن اسعد ایکا بەتقە خوی رزگار اکا ومخفرەکەش اگری.

لەمیرگەسور الویگ لگەل ۳سی نفرا خەریکی اموری خوی ئەبی پولیسی میرگەسور تقەی لی‌ئەکەن وایکوژن، ئەویش لگەل ۳سی نفرەکەی رفیقیا أمر مخفر وچوار پولیس اکوژن. ومخفرەکەش اگرن. لەسەر ئەو موضوعە وبەناوی ئەو فرمانە هەل بستراوە حرەکات اکریتە سەر بارزان. ملا مصطفی لەو وختەدا بو سەرکەشی عشائرەکان لەتجوالاتا ئەبی. لەلاین شیخ احمدی برایەوە بەترتیباتی خوارەوە توزیعی قطعات وبەرهەلستی لشکری عراق اکات.

۱-بو جهتی شەرقی بارزان شیخ محمد صدیقی برای اکا بەفرماندە وعزت عزیزیش بەمعاون.

۲-بو جبهەی جنوبی أکرە مصطفی خوشناو اکا بەفرماندە معاونیش جلالی امین بگ ئەبی.

۳-بو جبهەی روژأوا صالح برای عزت ئەکری بەفرماندە.

و بەوپی‌یە لەعینی روژا استحکاماتی جبهات لەهەمو لایکەوە دەست پی کرا وبەموضوعی خوارەوە یادداشتیك یان بو سفارەتی انگلیس. امریکا. چین وفرانسە ورئیس الوزرای عراق حمدی پاچەچی نوسی.

جنابی أغای سفیری گەورەی ( ....) ۲۰ اوت ۹٤٥

لەمدەتی دوسالا کەبارزان شورشی اولی خوی لەسەر وعدی اصلاحاتی کوردوستان نوری سعید راگرت وحمدی پاچەچی رئیس الوزراش وعدی نوری سعیدی تأید کردەوە بەلام تا ایستا حکومەتی عراق وعدی خوی نەبردوتە سەر. وغیری ئەمەش قواتی لە بارزان زیاد کردوە بەناوی مانورەوە حرەکاتی بارزان اکات وەهەتا ایستا ئەو نقاطانەی خوارەوەی دەست داوەتی.

۱-من ویستم گەشتیك بکەم لەناوچەی کوردوستانی عراقا بو ملاقات وزیارەتی عشائرەکان موصل. دەولەتی عراق رسماً منعی کردوم لەو گردوشەدا کەگەشت لداخلی مملکتا ممنوع وقدەغە نیە

۲-لەمنطقەی زیبار. بارزان. میرگەسور. مراجعەتی بارزانیان بو ادارەجاتی حکومەتی منع کراوە.

٣-تلگرافی رسمی لەمتصرفی هولیرەوە دراوە بەادارەکانی حکومەتی کەهەر بارزانیك تان دی بیگرن. هەتا اسعد خوشەوی ویستویەتی بچیتە مخفری بارزان پولیس پەلاماری داوە. مجبوربووە بەگرتنی مخفرەکە.

٤-الویگ- کەیکیك بو لەروسای عشائری بارزان چووە بو میرگەسور پولیس کوشتویانە. ٣سی نفری لگلا بووە مجبوربوون بەگرتنی مخفرەکە واسیری پولیسەکان.

٥-حکومەتی عراق قوەی عسکری هیناوەتە أکرە وباپشتیان-و هیزی پولیسیشی هیناوەتە (ریکانی-بەبی مقدّمە أگری شەریان ناوەتەوە کەایمەی هەژاری پی بسوتینن. جنابی أغای سفیری گەورە لەم وەختەدا کەئەو حقائقانەتان عرض اکری. ئەوا طیارە دیهاتی ایمە بردومان ئەکات ومنالی بی گوناە وپیاوانی بیچارە لەناو ئەبەن. بەپیویست مان زانی کەلەوختیکا مقابل بەوعدی بیاناتی (اتلانطیك) کەگوایا هەمو هوزیکی هەژار هەقی خوی ادریتی لەوکاتەدا ئەوکردەوەی وحشیانەی کەدرحق بە ایمە بەانجام اگا. استرحام ئەکەین کەمنع ئەو ظلمە وحشیانەمان لی بکەن کەلەلاین حکومەتی دکتاتوری عراق درحق مان اکری. لەخاتمەدا هیواداریـن کەئەو حکومتانەی پشتیوانی لەهەژاران ئەکەن روژیان پیروزبی

مصطفی بارزانی

فرماندەی شورشی کوردوستان

روژی ٢١اوت ٩٤٥ ملا مصطفی لگل ٦٠ نفر بو جبهەی أکرە حرەکەتی کرد روژی ٢٢ مانگی باسکراو لەدوای پەرینەوەی چەمی مەزنی- لەدی (سفتە-لەلاین طیارەی عراقەوە بشدەت بردومان کرا.

روز ٢٤ محمود أغای زیباری بە ٤٠ نفرەوە گیشتە ملا مصطفی وچون بو کیوی پیرس- کەقوەتەکیان عبارەت بو لە ١٠٠ نفر.

روژی ٢٥ اوت چونە دی (گوبیش) کە ٨ سعات لەبارزان دورە. ولەعینی روژا قرار درا کەمقری لشکری بارزان برنە (أشکەوتە) هەرلەو روژەدا خبر ورگیرا کەهەنگی (٥) دەولەتی کەعقرەیە وهنگی ٤ کە لەرواندزە روژی (٥) سبتامبر ٩٤٥ هلمەت ئەبەن بو سەربارزان.

## ترتیباتی فنی ملا مصطفی برامبر بەو لشکرە

بو تیك دانی نخشەی مقرەری حکومەتی ملا مصطفی چوار تاقمی جیا کردەوە کەهر تاقمەی عبارەت بون لە ١٠ نفر شەوی ٢٧ اوت ناردنی بو کیوی عقرە کەبرامبر بەلشکری حکومەتی لەچوارقولەوە هەرنفرەی چوار فیشك بتقینن وبگرینەوە بو دواوە. فعلاً ئەو چوار تاقمە لسر امری ملا مصطفی دەورەی أکرەیاندا دەستەی اول بسەرکردەی محمدی امیرخان-٢ عزیز أغای زواری-٣- رشید زیباری -٤- قرکاسی زیباری-تقەیان لەأکرە هلساند وبەبی مقاوەمەت گرانەوە.

غایەی ملا مصطفی لەو فنە ئەوەبو. اگر هنگی ٤ لەرواندز وهنگی ٥ لەأکرەوە بەیك روژ هجوم بکەنە سەر بارزان. بارزانیەکان ناتوانن بەرهلستی دوجبهە بکەن فعلاً ئەو تقانە بون بەسببی ئەوەی کەهنگی ٥ نتوانی لەروژی مقرەرا هلمەت بری بەلام هنگی ٤ لەژیر فرماندەی سرهنگ قیصر هرمز-دا حرەکەتی کرد بو سەر بارزان. لەبەرئەوەی کەبارزانیەکان ریگای لشکرەکەیان باش بەستبو ئەو هنگەیان زور بەناشیرینی شکاند نهایەتی ئەو جنگەیان بەخساراتی خوارەوە هینا-صورەتی بلاغ

جنابی مصطفی بارزانی

روژی ٢٥ اوت ٩٤٥ هنگی ٤ دەولەتی باپشتیان لەری دیانە وبادلیان ئەیەویست لە (کونە گوند) بەپشتی شیتنە-دا بی پشتی هیزی ایمە بگری. فرماندەی دستەی کونە گوند) نوری شیروانی- بە دە نفرەوە لگل هنگی ناوبراوا کەوتە مقاوەمەتەوە. وایمە چوار هەزار یارده عقب نشینیمان کرد ٦ سعات شر دەوامی بەست. بەلام لەپیش روژأوادا هنگی ناوبراو بە ٢٠٨ نفر کوژراو و٣٠٠ نفر بریندار وکوژرانی سرهنگ قیصر وگرتنی ٥٠ تفنگ و٢٠ صندوق جبخانە ویك دستگای تلگرافی سیم ودوتوپ وهیندی بومبای دستی و یك شصتیری گەورەی فیکرس و٣سی مسلسلی بچوك تلفیات شکستی هینا. بەلام ایمە تنها دو نفرمان بریندار بووە. وەهتا یك نفرمان بمینی ناهیلین دوژمن پی بنیتە خاکی أزادی خواهان.

شیخ محمد صدیق

فرماندەی جبهەی خاوەر

بەلام من شخصاً بەو بلاغە باوەرناکەم راست بی چونکە تلفیاتیکی وازور بە موجودیکی واکەم ناهیتە رو. لام وابی نسبتیکی زور فاحش وافراط لەبلاغەکانیانا هیە. هیچ معقول نیە کەفوجیك بەتەواوی بکوژری وبریندار بکری. ضابطەکان وفرماندەکانی بارزانی هەروا لەتقاریرا خوهلکیشانیان هەبو. هەتا لەشەری مامەشای سقزا. مصطفی خوشناو تقریریکی نوسیبو کەتەلی کوژراوی دوژمن ٥٠٠ نفرەو بەونسبەتەش برینداریان هیە. ورسماً بەروژنامەی کوردوستان ئەو تلفیاتە اعلان کرا. کەچی ایرانیەکان هیچ ناوی ئەو تلفیاتەیان نەهینا چونکە ئەیان زانی درویە. و بەو درویە قاضی محمد مسئول اکەن. جامن لەو قناعەتەدا نیم کەقطعیاً تقریرەکانی بارزانی بو تلفیاتی کوژرانی عسکر وپولیسی عراق بەو اندازەیە راست بی. بلکو مبالغەیکی زوری تیا هیە.

چنگی نهلە جبهەی جنوب

دەشتی نهلە-کەجیگایکی أودار وسختە قسمیکی عشائری سورچی وزیباری تیا دائەنیشن. لەروی عقرەوە ٣سی ریگا لەو شاخە پیدا ئەبی یکیك یان قابلی حرەکاتی عسکری ودو ریگایەکەیتر بو پیادە رەوی نەبی بکار ناهین. ملا مصطفی بەتەرتیباتی خوارەوە ئەو ریگایانەی لەهنگی ٥ گرت

شەوی ٨ سبتامبر ٩٤٥ (٢٠) نفری لەژیر فرماندەی محمد امین امیرخان وعزیز أغا-ناوان ناردە دامینی کیوی أقرە وئەو ٢٠ نفرەش لەوی کران بەدوقولی ١٠ نفری ولەراستو چەپی ئەو ریگایە دامەزران. وەدەستوریان درایی هەتا ملا مصطفی تقە نکات ئەمانیش تقە نکەن. ملا مصطفی خوشی لگل ٢٠ نفری ترا چو بو کناری کیوی پیرس بە انتظاری هاتنی قوای دەولەتی خوریان لەکمیندا. روژی ٨ سبتامبر لگل روناکی بەری بەیانا هنگی ناوبراو بەهوی طیارە وطوپ جبهەی ملا مصطفی یان دایە بەر گوللە وبومبای بی رحمانە. بەلام ملا مصطفی نەیهیشت لەهیچ لایکەوە جوابی تقەکانی دوژمنی بدریتەوە. اجا لشکری دەولەتی بەتەمابری ئەوەی کەدوژمن لەوناوچەیەدا نەماوە دەست یان کرد بەتقدم ورویشتن. هەتا پاش ماوەی لشکر گیشتە بەردەمی محمد امین امیرخان.

اجا ملا مصطفی برنگاری هنگی (٥) بو لەهەمو ٣سی لاوە لی کرا بەتقە. چە تقەیك تقەیکی کەو کوژی تقەیکی خوین گری وتول ئەستینی. تقەیکی حقوق پایەمال

كرادى تقەی شەرەف تقەی سەربەخویەتی تقەی سرومالی ونیشتمان بەرزکردنەوە وتقەی انتقام تقەی استقلال.

اجا لشکری حکومەتی شەپرزەبون. رویان ئەکردە هەر ریگایك لەو ۳سی ریگایانە ئەدرانە بەرگولە بەهیچ تەرزی ریگای دەربازبونیان نەمابو. لەچەپەوە دەستەی ولوبگ لەپاشەوە دەستەی محمد امین امیرخان. لەراستەوە دەستەی عزیز أغا. لەپیشەوە ملا مصطفی. هەتا روژاوا بەوپی‌یە اگری شەر سوتا. نتیجەی ئەو شەرە بەکوژرانی ۱۵۰ نفر و۳ افسر و٤۰۰ نفری بریندار وگیرانی توپیکی جبلی ودو مسلسل سوك و۲۸ تفنگ و۱٦۸ گوللەی توپ ودە صندوق فیشك ٤۰۰ بار مهماتی خواردن دوایی هات. ولە لشکری بارزانی کوژراو وبریندار نەبو قشونی دەولەتی ۳ روژ بەمحاصرەکراوی لەودولوشیوەدا مایەوە. بەلام کومەگی عشائری بون بەهوی نجات دانی ئەو لشکرە گمارو دراوەیە لەشەوی ۱۲ سبتامبری ۹٤٥ و ملا مصطفی ناچاربو هلگرایەوە بو کیوی پیرس) کسعاتو نیویك لەمحلّی حادثە دور بو لەوی استحکاماتی‌و عقب نشینی کرد عشائرەکان اعتبار اکرن بە ٥۰۰ نفر کەلە ملا مصطفی هەل گرابونەوە وتبعەتی حکومەتی‌یان کردبو وپنجەی خویناویان خستبو ناو جگری ئەو برایانەیان کەلەسەر حقو أزادی ئەوان اختیاری ئەو مرحلە خوی‌نی‌نەیان کردبو. وبو روشەنی کردەوەی بی شەرمانە وپند ولومەی هاتوانی لەمەولای کورد ئەوا ناوی ئەو بی مروەتانە لەخوارەوە عرض ئەکەین.

۱-احمد بگی زیباری ۲-شوکەت زیباری ۳-مجیدی حسین أغا ٤-عبدالله شرفانی ٥-شیخ جلالی بریفکانی ٦-محمودی زیباری ۷-شیخ رشید ۸-شیخ رقیب-لشکری ملا مصطفی لەمسافەی ئەو (٥) روژەدا ۷ دفعە مصادمەیان لگل نیروی دەولەتیدا بو. مجموعی کوژراوی حکومەتی لەو روژەدا گیشتە ۳۸۰ نفر وبریندار بە ٤٥۰ نفر ولەهیزی بارزانیشا (٥) نفر کوژراو وچوار نفر بریندار رویدا. وهەر

لەوجنگە تأريخيە سامدارە فرماندەی دەستەی راستی حرەکاتی نهلە-أغای عزيز أغای زراری- شهيد كرا.

## جنگی هوديان ومزنە- جيهەی خاوەر

رۆژی ٢ سبتامبر ٩٤٥ بقايای هنگی ٤ لەلای راستەوە وهنگی ٣ لەلای چەپەوە لە (باپشتيانەوە بـو (مزنـە-كەوتنـە تعـرضّو پـەلاماردان. بەشـيكی لشـكری مـلا مصطفی لەوكاتەدا لەاشكەوتی (هوديان) خويان پنهان دابـو. ئـەو قوەتـە بچكولانـە بەمەردانەی پشتی هەردو هنگەكانيان گرت. لەرغمی ئەو هەمو بومبا وتـوپ بارانـە. محمد أغـای ميرگسـووری خـالی مـلا مصـطفـی-بـە ٥٠ نفـرەوە خـوی بەنـاو ئـەو دو لشكرەدادا وقارەمانی ئەو جنگە خوينينە (نـورووی شيروانی- بەپشـتيوانی حما أغـای ميرگسـور خـوی خسـتە نـاو ئـەو كـارزارەوە. هـەرچندە لەبـەر تـأثيری هجومـی چنـد زرەپوشيك لشكری حمـا أغـا ونـورو-اختيـاری عقـب نشـينیيان كـرد. بـەلام ٢ توپـی كوهستانی و ٣ شصتيری برن و٢٠ صندوق فيشك و٤٨ گوللەی تـوپ يـان هـەرچنگ كـەوت. وبـەو حالـەش ٣٠٠ نفريـان سـرباز كوشـت و٤٥٠ نفريشـيان برينـدار كـرد. ولەهيزی بارزانی دو نفر بريندار كران.

## جنگی هەرن-ناوچەی باختر-رۆژأوا

عشائری بادينان وزيبـاری لـەژير رياسـەتی دو افسـری عـراق ٥٠٠ نفـری مسـلح لـەدی-هـەرن- أمادەیيـان كردبـو. وبـەهوی تلسـز ارتبـاطـی تـەواويان لگـل نـيروی دەولەتيدا هەبو. وقەرار وابو كە لەكيوی (پيرسا مەلا مصطفی اسير بكەن. بـەلام مـلا مصطفی دەركی بەو راويژگەيە كرد كيوی پرسی بەجی هيشت بە ٣٠سی نفـرەوە چـو دی (هرنی) گماورودا. هـەر لـەو كاتـەدا لـەلايكی‌ترەوە. شيخ سليمان-نـاويش بـە ٢٨ نفرەوە تقويەی ملا مصطفی كرد. وعزت عزيزيش لـە (هرفتـە)وە كـە٦ هـەزار يـارد لەهرن- دوربو دی هرنی دايـە بـەر تـوپ. بـەلام توپـەكان هيچ اصابـاتی ئەودیيـەيان نەاكرد هەرچندە كەتوپەكان لەومسافەيە بەحكم تـر بـون. مـلا مصـطفـی ٦ سـاعەت هيزی عشائرەكانی بەوعدّە كەمـەوە محاصرە كردبـو بـەانتظاری ئـەوەی كەتوپـەكانی

عزت عزیز مجبوری تسلیم بونیان بکات. مع الّسف توپ هەرنگیشتە ناودی هەتا لەناکاو تقەی توپەکانی کاك عزت وقفەی کرد. سببی وقفەی توپ تقاندنەکشی ئەوە بو. گوایا چند شخصیك خبریان داوەتی کەهیزی (هەرن) تسلیمی نفسیان بەملا مصطفی کردوە وئەویش تقاندنی طوپەکانی بەبی لزوم زانیوە کەچی بالعکس ملا مصطفی بەانتظاری تقەی توپی کاك عزت هەتا مدەیکی زور ئەو ٥٠٠ نفرە اخاتە محاصرەوە. هیزی حکومەتی کەخبری ئەو محاصرەیە ئەزانن لشکریکی زور ئەنین بو کیوی پیرس) بو ئەوەی کە ملا مصطفی مجبوری عودت ببی وضغط لەسەر ئەو هیزە گمارودراوە هلبگری. فعلاً ملا مصطفی بەهاواری قرارگای پیرس-وازی لەمحاصرەی (هەرن) هینا. هەر ئەو غلط واهمالەی عزت عزیز-ناوە بو بەسببی دوراندنی موفقیەتی ملا مصطفی لەهەمور ناوچەیکی بارزانا.

جالەبەرئەوەی کەمن شخصاً لەو ناوچەیدا نەبووم ناتوانم هیچ تعلیقاتیك لەسەر موضوعی توپەکانی عزت عزیز بکەم. أخوا ئەو حرەکاتەی غلطاویە بەحسنی نییەت وتجاهلی موقف هاتوتە وجودەوە. یاخو شتیك بووە عمدی وبەپنجەیکی غیرە حقیقەت هاتوتەرۆوە... بەلام هیچ امید ناکری کەکاك عزت لەوگنجانە بو بی لەغیراز بەرزی ملا مصطفی هیچ غایەیکی کەی لەورۆژەدا بو بی شهید کرانەکەی صداقەتەکەیان دەرئەخا کەچند مطلوبی حکومت بووە.

## جنگی کیوی پرس-و کشانەوەی بارزانی

روژی ٢٥ سبتامبری ٩٤٥ ملا مصطفی بەدەستەیکی ٦٠ نفری لەکیوی پیرس سنگربندی کردبو وخوی بو شەر گیف دا بو. ئەوکیوە لەهەمو لایکەوە لەلاین عشائر وحکومەتەوە محاصرە کرابو. عشیرەتی سورچی- بە ٣٠٠ نفرەوە پەلاماری ملا علی ژاژوکی-ئەدەن مجبوری کشانەوەی ئەکەن.

هنگی (٥) بەیارمەتی ٨ توپ وپنج طیارە لەجنوبەوە هجومی کرد بو سەر ئەو کیوە لەجبهەی راستیشەوە عشیرەتی (بروراری- وشرفانی ودوسکی- بە ٥٠٠ نفرەوە وعشیرەتی زیباری بە ٤٠٠ نفرەوە هجومیان کرد بو سەر ئەو کیوە.

بەو تەرزە ئەو روژە هەتا شەو جنگ أخاندنی- ملا مصطفی استفادەی لەتاریکی شەوکرد لەچەمی (مزنە) پەرییووە خوی گیاندبو (هرفتە) ولەوی خطی دفاع

دائەمزرینی. اجا شیخ احمدی برای مـلا مصطفـی بـو محافظـەی عیلـو أژالی بـارزان دیهاتی بارزان چول ئەکا ئەچیتە پشتی کیوی شیرین وعشـیرەتی شیروانی وشـەوی ٣٠ سبتامبر ٩٤٥ لەسەر مخابرەی کە لەمەوبەر لگل قاچی محمد وروسەکانا کردبویـان سید عزیزی سید عبدالله لگل سید مصلح وچند تفنـگ چیـك واردی کـانی رەش سرحدی عراق بون.

لەروژی ٦ اکتوبری ٩٤٥ ملا مصطفی بەدەم شەرەوە عیلی بـارزانی بـەرەو ایـران خستە حرەکـەت. ولـەروژی ١١ اکتوبـری نـاوبراوا اخـر نفـری عیلـی بـارزان بـەریگای کیلەشین وکانیرەشا داخلی أراضـی ایران بون. بەلام لەئەوەلی حرەکـاتی بارزانـا مـلا مصطفی مصطفی خوشناو وخیرالدین- ناوانی نارد بـو تـەوریز) بـو چاوپیکـەوتنی فرماندەی نیروی شورەوی لەتەوریزا روسەکان ورامیان دابونەوە. هەتا روژنامە ومجلەیکی سیاسی اعتراف بەو حرەکاتەی ایوە نکات کەبەپنجەی اسـتعمار نهاتوتـە وجـودەوە ایمـە ناتوانین هیچ کومگیك بەایوە بکەین.

اجا ملا مصطفی توسطی کرد کەمجلەی نیشتمان وهاوار وأزادی ئەو حرەکاتـەی بارزانە بلاوبکەنەوە کەبو داواکردنی حقوقی کورد هاتوتـە روو لەهـەموو دەسائسـیکی بیگانە بەدورە. اجا دوبارە نمایندەی مـلا مصطفـی نیرەرایـەوە بـو لای روس وقـاضـی محمد واجازەی هاتنـە ایرانـی بـارزان درا. وبـەترتیباتی خـوارەوە اسـکانی ٢٥٠٠ مـالی بارزانی لەایرانا کرا.

### ژیانی بارزانی لە ایرانا

لەئەوەل گیشتنی ٢٥٠٠ مـالی بـارزانی بـە ایـران قـاضـی محمـد لەسـەر توصیـەی روسەکان خواردن وزخائریکی زوری بو بارزانیەکان نارده حـدود. لـەدوای چنـد روژیـك استراحەت لەو ناوچەیەدا. عشائری بارزان توزیع کرا بە بەسـەردیهاتی عشـائری پیـان. مامەش. لاجـان. شـنو. زرزە. دیبکـری. نغـدە. سـندوس. فیض‌الله بگـی- هەردیـەی دومـال و٣سی مـالی بەسەرا درا. باخصوص ناوچەی دولـی تەرگـەوەڕ ومەرگـەوەڕ- کـرا بەمەرکزی دانیشتنی عمومـی رئیسـەکانی بـارزانی. هـەمو أغواتـی دیـهاتیك مسـئول کرابون لە بەخیوکردنی ئەو چند مـالەی کەبەسەر دییەکەیانا دراوە.

بەلام معاوەنەتی ئەو بگوخانو أغواتانە هەرتاسەریك بەباشی وگەرمو گوڕی رویی. دوایی معاوەنەتی ئەو أغا وسەردارانە ساردبووە. وای لی‌هاتبو کە بەزوریش کولـە (تەپالەیك) یان لی نەسندری.

بەو مناسبتەوە هەرمڕو مالآتی کەپی‌یان بو. یا لەبەرسان قڕی کرد ویا بو نانو بەرگ فروشتیان. لەبەر سەرما وجیگای ناهموار ئەو عشیرەتە لی‌قەوماوە هەژارە دوچاری نەخوشی زحیری وگرانەتا بون. اسپی لەهەمو لایکەوە اندامی دابیژتن. چلکن وبی‌خزمتی أرامی لەونازدارانە هەل گرت وئەو ضابطانەی فراراً اشتراکی عیلی بارزانیان کردبو کەعبارت بون لە-میرحاج. مصطفی خوشناو. همزەی کونە حاکم کەمشهور بو بەهمزە عبدالله. وبکرأغا ونوری أحمد طه. جلالی امین‌بگ-محمد محمود-خیرالله کەمشهور بو بەحفظ‌الله-و حمە صالح ژاژەلەی ومحمود احمد معلم-و وهاب أغای حاجی علی أغای رواندزی- وعبدالرحمن طیب- عریف محمد عبدالله- نورالدین-شوکت-صالح عزیز- زورپەریشان بون فیری ئەو ذلەتو حقارەتە نەبوبون. هەتا محمود احمد نەی‌توانی لەوە زیاتر لەناو ئەو رزالەتەدا بمی‌نی‌تەوە. بواسطەی شیخ لطیفەوە لە ١٢ مارتی ٩٤٦ گرایەوە بو عراق و تقدیمی نظری سعید صالح وزیری داخلیە کرا لەسەر تشبساتی شیخ لطیف هەم عفو وهەم لەدائرەی معارفا توظیف کرایەوە.

بەلام دوبارە لگل حزبی پارتا کەوتەوە فعالیەت ولگل ئەو فعالیەتەشیا جنبەی ضدی شیخ لطیفی گرتبو وزور لەضدی شیخان غروریەتی گەنجیەتی بکارئەهینا. لەنتیجەدا حکومەت بەاتهامی شیوعی گرتی بەلام لەدوای افراج بونەکەی استغنا لەخدماتی کرا. انجا بایدایەوە لای شیخان. چونکە شیخان لەدوستەکانی باشتر حاضری کومەگی بون وهەتا ئەو تأریخە لەلای شیخ محمود مایەوە. لەرغمی ئەوەی کەداخلی حزبی صالح جبریش بوبو بەلام روحیەی قومی کوردی هەر محافظە اکرد وەوازی لەگیانی نیشتمان پەرستی نەهینابو.

انجا سەرەرای ئەو هەمو رەزالەت وجفایەی کەافسەرەکانی عراقی لەریگای کوردوستانانا چیشتبویان وەترکی مواجب ودرجە وأسایشی خویان کردبو. کەچی روسەکان گومانیکی زوریان لەوأفسرانە هەبو وبەجاسوس ومفتش یان لەقلەم ادان. وبەشدەت خستبویانە ژیر مراقبەوە. وهەتا اعتمادی تەواویان بەشخصی ملا مصطفی وشیخ احمد وباقی بارزانیش نەبو. هەتا زورشکیان لە ملا مصطفی پیا کردبو کەئەو

هـەمو حرەكـات وخويـن ريـژی ودەربەدەری‌يـەی بـەپيلانی انگليـس هاتبيتی‌تـە وجـود وهاتنه ايرانـی شـتيكی مدەبربـی. ئـەو موضـوعـەش ديسـان وەكـو مسـئلەكەی حمـە رشيدخان بەپنجەی مفسدان وخائنانی كورد هاتبو وجـودەوە. هـەتا شـيخ احمـدی بـرای ملا مصطفی كه لەسـابلاغ اقامـەتی پی‌كرابـو. بەروژيك لەسـابلاغی دەركـرا وبـو منطقەی دولّ ی شيطان آوا) دورخرايـەوە. كـەبفر وبـاران بەشـدەت ئەهاتـه خـوارەوە. كڕيوەی بفر نەی‌ئەهيشت هيچ پەلـەور وجانـەوەريك سـەر لـەكون دەربی‌نـی. نـازانم ئـەو هـەژارەيان بـەو خـيزانو منالـه ووردانـەوە چـون بـەروژيكی‌أوا توفـو سـخت لەسـابلاغ دورخستەوە. بەاتهامی ئەوەی كەجاسوسی انگليسه هەتا جاريك جلالی امين بگ لـەلای باوكيەوە نختيك پارەی بو نـيرەرابو بـو سـابلاغ. مدەيكـی زور ئـەو هـەژارەيان اژيـهتدا كـەتو ئـەو پارەيـەت لـەكوی چنـگ كـەوتووە. وايـان اعتقـاد كردبو كەئەوە معاشـی جاسوسيەو لەعراقەوە بوی نيرەراوەتە ئەوناوە.

جاهـەر روژە بەتـەرزيك مـلا مصطفـی وافسـرەكان بـراوورد اكـران لەبەرئـەوەی كەلەايرانا حرەكاتيكی فوق العـاده لەبارزانيـەكان مشـاهده نكرابـو بـەچاويكی سـوك تەمـاشا اكرن وبەوحشی ناويان بلاوكريـووە روحمـو عاطفـەی كوردايـەتی ئـەو ناوچەيـه دەرحقيان سارد بوبووە.

هەتا ئەو تأريخەی كەروسـەكان اجباركران كـەايران بـەجی بيلـن بـەم تـەرزە عيلـی بارزان بەكسـيفی وهـەژاری تـەژيان وەميـانی ئەوەشيان نەتـەدان كەافسـرەكان وپيـاوە ناودارەكانيان هاتوچوی شارەكان بكەن لەهەمولايكەوە بشدەت خرابونە ژير مراقبەوە.

## لشكركەشی بارزان لەايرانا

لـەمارتی ١٩٤٦دا بـەكمالی احترامـەوە مـلا مصطفـی جلبـی سـابلاغ كـرا. وزور اهميتی محترەمانەی پی‌درا. اجا ملا مصطفی وافسـرەكان لـەژير كـابوس وديوەزمـەی نگبەت هاتنه دەرەوە. طبلـی بـارزانی ديسـان لەايرانيشـا لەهـەموو لايكـەوە دەنگـی دايەوە.

لشكری بارزان دەسته دەسته جلبی سابلاغ اكران. لـەدوای تجـهيزكرانيان ئـەنيرەران بو جبهەی سقز. ملا مصطفی خوی شخصاً لەسابلاغ دائەنيشت مسئولی سەرپەرشتی وتنظيمـی عشـيرەتەكەی بـو. هـەر تاقمـەی كـه سـاز اكرا بـەفرماندەی دەسـته ولـك

وگروهبان وأدابی سربازیەوە اجـا تسـلیم بەحمـە رشـیدخان اکـرا. بـو تنظیم حرەکـات وپاسەوانی جبهەیان اجـا کەشـەری قـارەوای سقز کـرا. بارزانیـەکان بەتـەواوی لـەنظر عشائرەکانی ایرانا خویان دەرخست کەزور آزاد وهـەل کـەوتون. ئـەو تعریفـو ناوبانگـە هەل ئەگرن کەهەتا ایستا درحقیان گوتراوە.

اجا وەکو وەلاخی چاك لەهەمو لایکەوە ألیك یان بو خو زیادکرد وکانگا وشـوینی ملا مصطفی لەنظر قاضی محمد وأزربایجانی وروسەکانا زور بەرزبووە. واکثری اموری عشائرەکانی ایرانی خستە ژیر دەستی خویەوە. روژ بەروژ خوی زل ئەکرد ولگـل عشائرەکانا ریك ئەکەوت بو ئەوبیرەی کەلەروژیکا بتوانی دفاع لەحقی کوردانـا بکـات اگر قـاضـی محمد بەرهلستی بکـا. ویـا مـهاباد تسلیم بەایرانیـەکان بکاتـەوە. جـا هدەفیکی اتحادی عشائری گرتبو بەرنظر.

## ملامصطفی لەزەمانی فرماندەییدا

لەپاش گەرانەوەی حمە رشیدخان بو عـراق. مـلا مصطفـی بویـەفرماندەی جبهـە. واموراتی لشکرکەشی تسلیم بەو کـرا. بـەلام لەبەرئـەوەی کـەامری شـەر ولشکرکەشی توقیف کرابو واستفادەی زیـاتر لی اکـرا کـە لەسـابلاغ لگـل قـاضـی محمدا خـەریکی امـوری دەولـەتی بی. بەومناسـبتەوە فرمـاندەی جبهـەی سـقزی بەوکالـەت تسلیم بـە مصطفی خوشناو کردبو.

مـلا مصطفـی زیاتر بو مسائلی اموراتی لشکری بارزان ئەیەویست مستقلاً بژی. وهیـچ اموراتیکـی بـارزانی لەسـابلاغیەکان مسـئول نکـری. بەومناسـبتەوە لگـل مأمورینی ادارەجاتی سابلاغیدا. مناسبتی باش نەبو. هەردولا یکتریان اکرهان. هـەتا ئەو موضوعە تأثیری کردبو سەر شخصی قاضی محمد وحمـە حسین خـانیش. بـەلام لەبەر ظروفی ناهەموار ئەو موضوعە لەلاین قاضی محمدەوە أشکرا نکرا بـو لەبـەر عدەمی اعتماد مـلا مصطفـی زخیرەی بـارزانی لـەژیر ادارەی مـأمورانی سـابلاغی درهینـابو (تقـی أبـادی) کردبـو بـەمرکزی نقـل وحملـی زخـائری بـارزانی. میرحـاج وعبدالرحمـن مفتـی کردبـو بـەمأموری مسـئولی صـرف وقبضـی ئـەو زخائرانـە. ومباشرەتاً زخائری بـارزانی لـەتوریز وراگـیراو لـەتقی أبـادی-میـاندوواوا توزیـع اکـرا بەسەر بارزانیەکانا.

بارزانیەکان لەدەوری توسعی نفوذ واحترامیانا. زور تحقیری کوردەکانی ایرانیان اکرد. وهمیشە لەبینی ملا مصطفی وافسرەکانی لگل أغوات ومأمورەکانی قاضی محمد دەمەقالی وقرەی خود پسندی عشائرەکان وسابلاغیەکان بەپیشکەوتنی بارزانی زور متأثربون چونکە ملا مصطفی گیشتبو مرحلەیك قیمت وسامانی بو هیچ عشیرەتیك نەهیشتبووە وبلکو مائلی ئەوەش نەبو کەلەغیر از بارزانی زیاتر هیچ کەس لەایرانا خاوەنی مرکزیك بی عشائرەکان بو حمە رشیدخان پشیمان بوبونەوە. چونکە حمە رشیدخان برامبر بەعشائرەکان وافرادی سابلاغی زور مکرم واحتراماتی بەرزی نشان ئەدا بەلام ملا مصطفی بەگیانی بی مبالاتانە لگل ئەو أغوات وفرمان بەرانە ئەبزوتەوە. لەسەر مسئلەی زەخیرە ولباس وموچە واسلحە بەدایمی لگل سابلاغیەکان قرەی ئەهینا پیشەوە. هەرچی ملا مصطفی بو داوای اکرد وایگوت مادام لشکری بارزان لەجبهەدایە وخیلیکی غریبن دارای هیچ وینە کسابەت وژیانیکی لاحدەنین ئەبی وەکو نفراتی سابلاغی معاش یان بدریتی وتأمینی رفاهیەت یان بکری.

سابلاغیەکانیش ئەیان گوت ئەو تشکیلاتە خومان هیناومانەتەوە وجود بەتأثیراتی هیچ بارزانی وخاریجەیك پیك نەهاتوە. هەتا لەبەرخومان نەمی‌نی‌تەوە ولەخومان زیاد نەبی نای دەین بەهیچ خاریجەیك. هەتا سابلاغیەکان زور بەهاتنی عراقیەکان متأثر ئەبون حزبیان نەاکرد هیچ عراقیك پناهیدەی سابلاغ بېن. چونکە ایان گوت وضعی سابلاغ ئەوندە مستقر نیە کەبتوانین هەم خومان وهەم عراقیەکانیش بژینین ولەحقیقتیشا راست یان اکرد. لەغیراز خواردن زیاتر نەیان اتوانی مواجب وموچە بدەن بەلشکری بارزانی. ویا ئەو مجاهدانەی کەلعراقەوە اشتراکی ئەو حرەکاتەیان اکرد. چونکە وضعیت استقراری نگرتبو ومصیر معلوم نەبو. هەرچی کەچنگ بکەوتایە بەقەرز وقولە لە أزربایجانیەکان وراگیرا. و ملا مصطفی دیسان هەر حقی بو. ئەو بیچارەیەش ئەو هەموو رەشوروتەی لەگلا دەربەدەر بو بو. بەبی صنعەت وکسابەت لەوناوەدا ئەسورانەوە اگر لەلاین قاضی محمدەوە سەرپەرشت وبەخیو نکرابان ئەی بەچی ژیابان. حقیقتاً چە ملا مصطفیو چە سابلاغیەکان هەردولایان راست یان اکرد وهیچ لایك یان لەروی خیانەتەوە قصەی خویان سەرنەئەخست. بلام ظروف مساعد نەبو. بو ئەو رفاهیەت وداوایەی کە ملا مصطفی ئەیویست بکری.

هەتا مصطفى خوشناو ومەلا مصطفى لەسەر مسئلەی استلامی زخائر تیك چون. مەلا مصطفى ئەیەویست لەاستحقاقی نفراتی جبهە زیاتر بەقلەمی مصطفى خوشناو زەخیرە وەربگری. بو ئەوەی کە فضلەی زخیرەکە بەنسبتیکی عادلانە بەسەر عائلەی سەربازەکانا دابەش بکری بەحجّەتی ئەوەی کەمادام موجەیان نیە. ئەبی ئەو پیشمرگەی بارزانیانە بەو فضلەی زخیرەیە قنیات بکەن وپی بژین مصطفى خوشناویش ایگوت مادام رسماً مقرّەر نیە کەلەموجودی نفراتی جبهە زیاتر خواربار وەربگری. هەر پیشمرگەیك لەوە زیاتر وربگری ئەبی بەخیانەت لگەل حکومەتی کوردوستان لسر ئەو موضوعە قاضی محمد اعتمادیکی زوری خستە سەر مصطفى خوشناو وبردیەوە بو سابلاغ. هەتا نهایەت کردبوی بەفرماندەی پولی ۳ ناونفری عزت عزیزیش-لەجیگای مصطفى خوشناو لسەر ثقەتی مەلا مصطفى کرا بەفرماندەی جیهەی سقز هەتا نهایەتی حرەکات.

مەلا مصطفى بو شخصی خوی مانگی چوار هزار تومانی لەقاضی محمد وراگرت وکریخانوشی بەلاش بو. ونفرات وعوائلی بارزانیش نسبەت بەپیش لشکرکشیەکەیان تا اندازەیك تەرزی ژیان یان باش بوبو کمیك بزەڵە-بوبونەوە چونکە لەلاین أزربایجانیەکانەوە غتی قند وچا ولباسیان بو حوالە کرابو. خوراکی فضلەی جبهەش یان لی بەش اکرا. و دەغلو دانیشریان لەلاین أغواتەکانەوە بو قرار دادە کرابو. خوشیان کەم کەمە فیری ملوموش بوبون.

حکومەتی أزربایجان- تقی أبادی- میاندوواوی لەو ارمنیانە بو کریبون کەترکی تبعەتی ایرانیان کردبو وچوبونەوە بو روسیا. تقریباً ۵۰۰ مالیکی بارزانی لەو جیگا خوش و پر باغاتو میوەی تقی أبادا دانیشتبون ولەوشوینە سازگارەدا حەوابونەوە.

ئەگەر وضعیت تیك نچوایە قرار وابو دیهاتی قرەنی أغای مامەش وعبداللە خانی حسامی داشکستان و امینی لشکر وحما أغای سەر بارزانیەکانا دابەش بکەن و لەوشوینانەدا مل بدەنە کشتوکال وأژال داری. وغیری ئەوەش مەلا مصطفى تأثیراتی زوری کردبو سەر ئەو أغواتانەی کەمالە بارزانی لەدیهاتەکانیانا هیە. زور باش چاوەدیری اکران. تقریباً خریکی استراحەت و ژیانەوەبون کەلی یان قومایەوە.

## کشانەوەی لشکری ملا مصطفی لەجبهە

ملا مصطفی بەهیوای ئەوەنەبو کەجاریکی‌تر مشکلەی دەربەدەری ولی‌قەومان ببی‌نی‌تەوە. کەچی بەپیچەوانەوەی مرام لەسعات ٤ شەوی ۱۳۲٥/۹/۲۰ لەین فرماندەی هیزی أزربایجان بەهیزەکەی راگەیندرا کەحالاً تەرکی جبهە بکەن وبگەرینەوە بو میاندواو وتەوریز. چونکە دەولەتی أزربایجان تسلیمی نفسی بەدەولەتی شاهنشاهی کردوتەوە.

انجا ئەو هیزەی کەلەتەوریزەوە بەکومەگی لشکری قاضی محمدەوە هاتبو بو جبهەی سقز ولەدیهاتی (تموتە- قشلاغ- مازوودارە- چراغ- ویس- میتو- مرخص- اخ کند- أیچی- اقامەت یان کردبو لەورگرتنی ئەو خبرە شەپرزە بون. وأژاوەیکی زور عظیم کەوتە ناو لشکری أزربایجان ولشکری بارزانی. لشکری أزربایجانی بە تەواوی معنویات یان لدەست دابو. وەکو کەوی بالو پسی شکاویان لی‌هاتبو. لەبینی بوکان وکولتەپە ونالشکینە وناچیت ووشتەپە وحمامیان- عشائری دیبکری داخداریان برینگاربو. ئەو لشکرەیان هەموو چك کرد وبەروتو قوتی بەرەو میاندوواو کەوتنە حرەکەت بەلام هیزی بارزانی معنویات‌یان ضعیف نەبوبو. انضباطی سەربازیان لەچنگ خویان نەدابو.

بارزانیەکانیش فرصت یان لەولشکرە بی‌گیانەی أزربایجانی دیبو هەر لەجبهەدا هەر زخیرە وحیواناتی نقل واسلحەی فچلە وەکو رشاش تفنگ وفیشك وتوپ وماشین ودەنەمیتی کەبەو لشکرە گلاوە هەبو لی‌یان ورگرتبون هەوەکو میشیش یان بەلادا نەچوبی وابون. زور بە أرامی وەلاخی باری وسواری ئەو دیهاتانەشیان کوکردبووە. هەرچیکی کەبعملی بارزانیەکان هاتبی لشکری ملا مصطفی بەکمالی انتظام وارامی هلیان گرتبو. لەسەر دەستوراتی ملا مصطفی بەرەو ریگا- بصری. برهان- تازە قەلا- شەرف کند کەوتنە ری. متجهاً بو سابلاغ ریگایان گرتەبەر. وعلی اکبر غفاری وبیگلری سرتیپ معاونی لشکر دورونیزیك تعقیبیان ئەکردن. و هەردی‌یکی کەئەهاتە سەر ریگایان وسەربەایرانیەکان بایە. هەر اسلحە وحیوانیکی باری وسواری کەتیابوایە وریان ئەگرت وبەتالان کراوی بو أغا خائنەکەیان بەجی ئەهیشت.

## کردەوەی خائنانەی دیبکری لگل بارزانیدا

دیبکریەکان لەلشکرە خویرییەکەی قزلباشی تورکمانی أزربایجان چیشتە بوبون. کەخبری گەرانەوەی لشکری بارزانی ئەبیسن لەهەمو لایکەوە خویان لی‌گیڤ ئەکەن کەدایان پلوسن. بەلام کەتی ئەگەن بارزانیەکان لەوانە نین کەببنە نەچیری ئەمان. لەترسان ریگایان بو چول ئەکەن.

هەتا لەدی (گول و ملالر) قارەمان أغای دیبکری لگل چەند پیاویکیا پەلاماری چند نفریکی پەراگندەی بارزانی ئەدەن. بلام بارزانیەکان شیواوەکان بەمەردانەی لی‌یان رائەپەرن ودونوکەری أغاکە ئەکوژن وأغای ناوبراویش بەکلك شورێ میان یان بو چول ئەکات.

لەدی- تازە قلاش- حاجی بایز أغای ایلخانی زادە دو نفری پیشرەوی شکستەی بارزانی روت ئەکاتەوە. هەر لەو روژەدا زوربەی لشکری گەراوەی بارزانی ئەگاتە ئەودی‌یە. لەجیاتی ئەو دو تفنگە ٧ تفنگ‌و ١٥ اسپ وایستری حاجی بایز أغا لگل خویان ئەبەن. وحاجی بایزأغاش ئەگرن کەلەداری سیاسەتی بدەن. خوش بەختی حاجی بایز أغا- من لگل علی جوانمردی وکریمی محمدی لەسابلاغ ئەگەرای‌نەوە. ئەچوین بو دولی میرەدی. لەوکاتەدا ایمەش گیشتینە دی تازە قەلا وبەحادثە رائەگیشتین. بنا بەصداقەت ودوستایەتی منو أغای جوانمردی. بەهەر تەرزی کەبو أغای حاجی بایز أغامان لەسگ بحصاری رزگار کرد بەلام تفنگ وە ولاغەکان هەر رویشتن.

لەدی-شیخلر- چند پیاویکی احمد أغای ایلخانی زادە. پەلاماری مالیکی بارزانی ئەدەن کەلەودی‌یە تحت الحمایە ئەبی. بەلام مالەکە پیاوی لەمال نابی تنها هەرژنەکە ئەبی. ژنە بارزانیەکە زور بەاهمیتەوە تقە لەپیاوەکانی ئەو أغا بی‌مروەتە ئەکا دو نفر لەنوکەرەکانی أغا ئەکوژی. وهلدی لشکری کشاوەی بارزانی اگادار ئەکات. ئەمانیش دین مالی ژنەکە لەودی‌یە بار ئەکەن. أغاش بەنوکرەکانیەوە زەق زەق تماشایان اکات ناویری هیچ بلی.

جائەو دیبکریانەی کەأغای ملا مصطفی لەضدی حمە رشیدخان اتحادی لگل ئەکردن ولەسابلاغیدا ئەی‌خستنە ناو وظائفی گەورە وباشەوە پاداشتەکەیان ئەوەبو کەلەجیات ارکی پزیرایی وهاوخویشایەتی کوردایەتی. لەپیش هەمو عشایریکا پەلاماری شکستەی بارزانیەکانیان ئەداو ئەیانەویست بەدەردی أزربایجانیەکانیان بەرن

کەبو محافظەی ناموسی ئەوان هاتبونە ئەو ناوە. بەلام هەتا نهایەت عشیرەتەکان نەیان توانی هیچ وینە سوکیك بەسەر شانی عیلی بارزانی بی‌نن.

## شەپرزەی مالومنالی بارزانی لەکوچ و رەوی سابلاغا

ئەو روژەی لشکری بارزانی لەجبهەی سقزەوە بەرەو سابلاغ کەوتەری بفریکی زور باری بو. ولشکری ایرانیەکانیش دورو نزیك تعقیبی لشکری بارزانیان اکرد. عائلەی بارزانی بەدوای کوچوبارا کەتبونە ری. زورتری ژنومنالی بارزانی بەبی پیلاو بناو بفرا ئەرویشتن، لەهیندی جیدا ژنەکانیان بیشکەیان بەکولەوە بو منالیش یان لەسەر قلاندوشکان چسپ کردبو. لەهیندی جیگادا منالی ٧-٨-سالانەیان بەپی ئەرویشتن وئەوپی‌وپلە ناسکانەیان لەناو بفرا نقوم ئەبو.

لەهیندی شوینا پیریژنەکانیان بەپشتی چماوە بەدارە دەست بەپی روت بعضاً بەکالەو پی‌تاو خویان دابستبو وورد وورد بەدوای کوچوباری بارزانیدا ئەیان خاوت.

مەرومال وژنو منال وکوچ وباری بارزانی لەپیش لشکرەکشاوەکەی بارزانیدا ری داگرتبو. بەرەو سابلاخ. بەرەو خذمتی زعیمی بارزان بەرەو فرماندەی هەمولایکیان. برەو جنابی جنرال ملا مصطفی کەوتبونە ری. چە ری‌یك وچە رویشتنیك) ریگای نهایەت. ریگای قرێ ومال ویرانی رویشتنی بی‌هیوا. رویشتنی بی‌منزلو شوینی. رویشتنی کەس نەزانی کەبو کوی ئەچن ولەکوی اسکان ئەبن وچە ناوچەیکیان بەنصیب ئەبی. جابەوتەرز ئەو ریگا دورو دریژەی بینی سابلاغ وسقزیان ئەبری. چە برێنیك (ریگا برێنی بفر ورهیلە. کریوە وبستەلەك- ملا مصطفی بیچارەش لەشاری سابلاغا سەری لی‌شیوابو نەی ئەزانی چی بکا وئەو هەمو عائلە زورەی بارزانیە هەژارانە چون دەرباز کا. وەبو کوی‌یان بنیری کەنەکەونە دەست لشکری ایرانی وبەدیل نەبرین بو وەلاتانی فارسو ترکمانی. بەهەمو معنویات وشعوریکیەوە. خەریکی راگوازتنی عائلەکانی بارزانی بو بو دیهاتی منطقەی شنو. لاجان. نغدە. سندوس.

لەهەمو لایکەوە عوائلی بارزانی دائەبارینە سابلاغ. واکپری کوچوباری بارزانی لەجهتی تقیە آباد ومیاندوواو وساینقلا- بەر هیزی دوژمن برابو. خطی رجعت یان بو سابلاغ لی‌قطع کرابو. ملا مصطفی زیاتر بو ئەو قکعی خەتی رجعت واسیری مالە بارزانیەکان شەپرزە بو بو ئەو عائلانەی کەئەگیشتنە سابلاغ بەگورجی تأمینی نانو خوراکی ریگایان اکرا وبەماشین وبەهوی ولاغ لەسابلاغ دور ئەخرانەوە بۆ ئەو ناوچانەی

کەلەسەرەوە باسکراون. بەلام خوراك چنگ کەوتن لەسابلاغ زور زحمت بوبو. کەس اگای لەکەس نەمابو. نظامی شئون لەناو شار هەل گیرابو. لشکری ایران لەسابلاغ نزیك بوبووە. ایرانی خواهەکانی سابلاغی بو استقبالی نیروی ایرانی خویان أمادە ولەسان دابو. چە جای ئەوەی کەبەزەیی‌یان بەو عیلە لی قەوماوەی بارزانیەدا بی. بلکو تحقیریان اکردن‌و کینەیان لی ئەکیشان. لەکاتیکی أوا بەتاسوساما ۲۵۰۰ مالی بارزانی بەبی خوراك وجیگا ومنزل بسەر ملا مصطفی بیچارەدا کەوتبووە.

باخصوص ئەو عائلە بەریزوانەی بارزانی شتیکی زور ستم بو لەنظری ملا مصطفی وهەمو غیرتداریکی کورد. هەتا لەناوشاری میاندوواوا قزلباشیە بی‌ناموسەکانی ایرانی پەرست دو نفری بارزانیان شهید کردبو. وخەریکی خنکاندنی ژنیکی بارزانی بوبون لەناوەراستی شاری میاندوواوا. بەلام خوشبەختانە- شیخ جلالی کاکە لاوی نودی‌یی ومینە قارەمانی پیاوی حمە رشیدخان ورشید أغای معروفی ورسول‌أغای بلجری- کەلەو وختەدا لەوناوە لشکری قاضی محمد ئەبن. ئەگەنە هاواری ئەو ژنە بارزانیە. تقە لەقزلباشیەکان ئەکەن ژنەکە نجات ئەدەن.

جابەو وضعیەتی ناهەموارە ئەو هەمو عائلانە لەو مسافەیە کەمەدا لەلاین ملا مصطفی‌وە روانەی شوینە باسکراوەکان کران. انجا لەکوتاهی هاتنی عیلی بارزانیدا. ملا مصطفی دەرگای اسلحەخانە وانباری زخیرەی دیمکراتی قاضی محمدی شکاند. هەر اسلحە وزەخیرەیکی کەلە امبارەکانا مابووە بەری کرد بو ناو خیلی بارزانی. وخزینەی دەولەتی کوردوستانیشی شکاند بەلام خزینەکە شتیکی وەهای تیانەبو کەشایانی باس بی. لەو وختەدا کەئەو عیلاتی بارزانیانە بو اطرافی شنو لاجان بەری‌کرابون ۳ شەو و۳ روژ ئەو هەمو عیلاتە لناو بفرا مابونەوە. ریگایان ندرابو بچنە نغدە وسندوسەوە. چونکە ئەو شارانە لەلاین حکومەتی ایران احتلال کرابونەوە. هەتا حکومەتی مرکزی لەتارانەوە دەستوراتی دا بو بەفرماندەی لشکری رضائیە کەئەو دو شارە چول بکەن بو عوائلی بارزانی. انجا ریگایان درابویی کەبچنە ناوشاری سندوس ونغدەوە وشنو. انجا ملا مصطفی لەپاش راگوازتنی مالە بارزانیەکان سابلاغی بەسەر قاضی محمد بەجی هیشت‌و لەروژی ۲۷ أزرماە سرهنگ انصاری بەهنگی سواری لورستانەوە وسرهنگ غفاریش بە ۱۵۰۰ نفری عشائرەوە بو تعقیبی ملا مصطفی چو بو طرفی کاریزە ونغدە وأق طویلە

## کشانەوەی زیرۆ لەجبهەی سردەشتا

لەمنطقەی سەردەشتیش بەعینی دەستور لشکری زیروی هەرکی وبکر أغای حولیض وبارزانی. دەورەی سەردەشت یان چول کردبو و بەسمتی-جلدیان و صوفیان. وناو عشیرەتی منگور وپیران-خویان گیاندبووە ملا مصطفی بەلام عشیرەتی منگور لەسەر دەستوراتی- همز أغای اصلان- کەیکەلیدەری منگور ئەبی. لەبەری میرگان-و بەری نەلێن- ریگا بەلشکری زیرۆ وبکر أغا اگری. بەلام زیرو زور بەباشی لگیان ئەکەویتە شەر. انجا منگورەکان کلك هەل ئەکەن و ریگایان بوچول ئەکەن. بەلام زیرۆ بەوە واز ناهینی. هەردیهاتیکی منگوری کەئەکەویتە سەر ری. تفنگ وەلاخی سواری ئەودیە ئەچنیتەوە. باخصوص دیهاتی- قلاتاسیان موسالان (چەکو-پردانان- کونە مشکە-قبادبگیان- ترکەش-کەوپەریان هەربەتەواوی روتان بووە.

انجا ئەو هەمو عیلاتی بارزانی وغوارە لەوناوچەیەدا بەسەر ئەو عشائرانەدا مانەوە. هیچ نفریك وهیچ عشیرەت وأغایك دارای حریەت وسەرومال نەبو ئەو دیسهاتو عشائرانە مکلف کرابون بەبخیوکردنی عائلاتی بارزانی. هەرکسیك کەلوت چەرچیکی برامبر بەامری بارزاتی لیمشاهدە کرابایە. هەرخوا ئەیزانی چی پی اکرا. بەاندازەیکی بی شمار دانیشتوانی ئەوناوچەیە بەدەست بخیوکردنی بارزانیەکان هەراس بوبون. وهەرچی زەخیرەیکی کەهەیان بو درخواردی بارزانیەکانیان دابو. خویان وکو بارزانیەکان دەستەوستان مابونەوە. عشائرەکان چە لەترس وچە بەخوشی هەموسەری اطاعەتیان بو بارزانی دانوان بو ئەو ملتە هناسە ساردەش لەغیراز مردن ریگایکیتریان نەمابووە بی خوراك وسامان وەکو بارزانیەکانیان لیهاتبو. بفریش روژ بەروژ گزیکی کەی ئەخرایە سەر. سالیکی بەموداو پر لەشورشو دل تنگی بو.

## چونی ملا مصطفی بو تاران

انجا ملا مصطفی بو ئەو ریگایانە خوارەوە درگای مخابرات وگفتوگوی لگل حکومەتی شاهنشاهیدا کردەوە. پاشان امیر فلاح رئیسی عشیرەتی قرەپاخ ومیرحاجی بو ملاقاتی سرهنگ غفاری ناردە کوسە کاریز وسرهنگ غفاری وئەو هینئتە لە نغدە ملاقاتی ملا مصطفییان کرد.

١-بلكو هەتا تعديل موسم ايرانيەكان راويان نەنين.

٢-بلكو عشائرەكان بەأسانى كومەگى سوختو خوراكيان پى بكەن.

٣-بلكو بتوانن خواردەمنيك لەايران وەربگرن هەتا رىو بانيان بو اكريتەوە.

٤-بلكو بتوانن لەومدەتەدا عطفى دەولەتى عراق جلب بكەنەوە.

ايرانيەكانيش بو نظرى دقّەت وباوەر پى‌كردنى بارزانيەكان چند اوتومبيليك كەپڕبو لەبقاياى خواردەمنى قاضى محمد كە لەساباڵغ مابووە وبو ملا مصطفى دەرنەچوبو. بويان نيرەرايە ناوچەى كانگاى بارزانى. ومالّە بەربڕاوەكانى بارزانيش يان لەهەمو قوليكەوە بو ملا مصطفى گياندەوە ئەو ناوچەيە. نظر بەمخابراتى كەلەلاين ملا مصطفىو سرلشكر همايونى بو تاران جرەيانى كردبو. لەروژى ٣٢٥/٩/٣٠دا ملا مصطفى لگل ميرحاج وعزالدين ونورى احمد طە-بەمرافقى سرهنگ غفارى چو بو تاران. لەباشگاهى افسران باغشاه ميواندارى كرا. واحترامىكى زورى لەلاين حكومەتى ايرانى لى گيرا. و چەند روژيك لەتاران مايەوە. وزيارەتى شاى ايران ونخست وزير ورزم أراو اكثرى كاربەدەستانى ايرانى كردز وشاه لەدواى نصايح ودلنوازيكى زور ئەو شروتانەى خوارەوەى بو ملا مصطفى دانا

١-قبولى تبعەتى ايران وناردنيان بو چالى همدان وخلع كرانيان لەاسلحە. ئەو افسرانەى كەلەعراقەوە حكمى اعداميان بەسەرەوەيە. داخلى وظائفى حكومەتى ايران بكرين. وبو باقى عشيرەتەكەشى مشروعى زراعى دابمزرينى وهەتا ئەكەونە سەرفنى كشتوكال لەلاين حكومەتەوە بەخيو بكرين. وبو ملا مصطفىش مقرەراتى‌كى لايق معلوم بكرى.

٢-يا ايران بەجى بيلن بەبى تداخلى حكومەتى بەبى هيچ گونە تڕيقاتيك تسليم نفس بكەنەوە بەعراق. وظابطە مجرمەكانيان لە ايران بمى‌نى‌وە برتأمين حيات.

٣-يانە حكومەت بەشەر دەريان اكات وجداناً معقّب نەبى.

اىجا ملا مصطفى وعدى بەشادا كەتبعەتى ايران قبول بكەن. ومأمورى اسلحەچنى لگلا بنيرن كەچەكەكانيان لى وەربگرنەوە) اىجا حكومەت ايران سرهنگ غفارى لگل ملا مصطفىدا ناردەوە بو وەرگرتنەوەى سلاح لەبارزانيەكان ورِوژى ٣٢٥/١٠/٩ واردى سابلاغ بووەو دەستوراتى رەوانە كردنيش يان بو چالى همدان درا

بەسەر لشكر همايونی. ملا مصطفی بەو فيلە لگل ضابطـەكانيا خـوی لەاسـارەتی تاران امين كردەوە وگرايەوە بو ناو عيلەكەی.

بەاوەل گيشتنەوەی بەناو عيلی بارزانی سرهنگ غفاری يان جواب كـرد بەحجّـەتی ئەوەی كەبرايەكانی لگل ملتەكەيا بـەو قراردادەيـە رازی نـين وبەرامبـەر بـەوعدی مـلا مصطفی تمرد ئەكەن. و مـلا مصطفـیش شـخصاً سـلطەيكی مطلقـی دكتـاتوری بەدەستەوەنيە كەبتوانی ئەو وعدە بەريتە سەر كە بەشای داوە لەتارانا.

## حرەكاتی حكومەتی ايران بو سەر بارزانيەكان

بەهـەر وسيلەيك كـەگونجا عشـيرەتی بـارزان هـەتا ئـەوەلی اسفند خويـان بـەناو خواردەمەنی خلكی ئەوناوە ژيان. اجا لشكری حكومەتی ايران بەهيبەتيكی زور مجهزی تانك وطيارە وزریپوش لگل هيزی عشائری شا يوان-ديبكـری- مامـەش- منگـور- پيران-زەرزە- لەژير فرمـاندەی لشـكر تيمسـار همـايونی لەجنوبـەوە ولەجهتی شـەرق وشماليشەوە لەقولی دشتەبيل ونغدە وسـندوس وتەرگـەوەرو مەرگـەوەر ودولـیوە لـەژير فرماندەی لشكری خرابی وزنگنە (٢) اسفندی ٣٢٥ پەلاماری هيزی بـارزانی درا. چـە پـەلاماردانيك. پـەلاماردانيكی سـەرومالی- پـەلاماردانيكی بـی رحمانـە- لەهـەموو ديـهاتو أوايەكـەوە ئـەهالی ئـەو ناوچەيـە لەترسـی گيـانی خويـان پـەلاماری مـالی بارزانيەكانياندا. عـائلـەی بـارزانی لەديهاتـەكان دەركـران وخزانـە نـاو ئەشـكەوتەكانی ناوچە شاخاويەكانەوە.

عـائلەی هەژاری بارزانی بەبی خوراك لەناو بفرا ئەتلانەوە. بفر ريگای نەئەدا كەئـەو عيلە لەمەرزی عراق نزيك ببیتەوە وخوی بخاتەوە باوشی نيشتمانە رەنجاوەكەی. چونكـە لەوسەروبندەدا لشكری بفر هـەمو ناوچـەيكی داپوشـی بـو ريگـای سـلطـە زەلام نـەبو كەبسەريا بروا چەجای كوچوبار.

بەلام دەردی لەهەمو شتيك ناخوشتر بی نانی بو. ئـەو عشـيرەتە هـەژارە دەسـەلاتی هيچ خواردەمنيكیتری نەبو تنها ئەو رەشە وەلاخانە نەبی كەباريان لینـابون. هـەر ئـەو وەلاخانـەيان سـەرئەبری ولـەناو اشـكەوتانا بـەكالو نـەكوليوی ئـەيان خـوارد. وهـيزی دەولەتی وعشائرەكانی تيرو تەسلاش بەبی ووچان وبـەبی هيـچ چمـير ووجدانيـك. دريـغ يان بەپەلاماردانيان نەئەكرد. بارزانيەكانيش بەرامبەر بەو هـەمو لشـكرە زورە دفـاعی

ناموس وجنگی شەرف یان ئەکرد. (نەجنگی پیشکەوتن ودوژمن شکان ولەایران مانەوە) پیاوەکانیان بەرامبەر بەو ضغطە قەهارەی دوژمن سینگ یان بو گوللەی دوژمن راگرتبو وژنەکانیش یان لەژیر بردومانی طیارە ورەشاشا برەو عراق کوچوباریان لی ئەخری.

أخی عراقی ئازیز بوچی وادوری. أخ مەرزە رەنگینەکەی نیشتمانی شیرین بوچی دەرناکەوی. أی بفری سارد وسری اقطاعی زورداری بوچی دوایت نایە بوچی ناهیلی. أزیزی نیشتمانیمان لیوەدەرکەوی. نیشتمانی نازدار أخوا تاکەی باوەشی رەنگینت بو ئەو لاوانت ناگریەوە کەوا بەکومەل لەژیر تاوی توپ وبومبا ورەشاش وأزاری برسیایەتی وتوفوکریوەی خاکی دوژمنان- سەرسام وسڕ بوون.

دولی گادر- خانی أزیز- کیلەشین-زینوی شیخی- ناوچەکەی حاجی‌اومران دەزو دەرکەون. بنوارنە ئەو برا لیقەوماوانەمان کەبەدەم رەشاشی بی روحمی ایرانیانەوە خوینی سوریان-الأستقلال - ازادی کوردوستان لەلاپەرەی بفرە سپیەکانی ناوکەلەکان ئەنوسی.

جا عشیرەتی بارزان دومانگ بەو تەرزە لەناوکوری جنگ‌و بفرا لەودەشتو شاخستانی ایرانا رایان بوارد. بەدەم شەرەوە برەو عراق اکشانەوە. زیاتر عشائرەکانی ایران فرخەی بارزانیەکانی بریبو. حکومەتی ایران تفنگ وفیشکی بەسەر عشائرەکان دابەش کردبو بو بارزانی کوشتن. تفصیلاتی ئەم جنگەیان بەم پییەبو کەعرض اکری.

## بەسەرهاتی بارزانی لەپاش نەمانی کومەلە وحکومەتی کوردستان

روژی ١٥ بهمن کەمیعادی دەرچوونی بارزانی بو لەایران. ستادی أرتش ایران امریدا بەلشکری چواری کوردوستان کەحرەکەت بکاتە سەر بارزانیەکان. عیلی بارزانیش کەلەفیلی ایران گیشتن مالیان برەو نغدە وپسوی وصوفیان وجلدیان وشنو خستە کوچ کردن ولە٢٨ مانگی بهمن دەستور درا بەفرماندە لشکری ٣و٤ وتیپی رضائیە وسرلشکر خرابی-و همایونی. وسرتیپ زەنگنە- کەچەك لەعشائری هەرکی

وشكاك ودەستەی زیرو وەربگرنەوە. نەوەكو عشائری دەورەی دەشتەبیل بچنە ناو كومەگی بارزانیەكانەوە.

بەترتیباتی خوارەوە لەلاین هیزی دەولەتی ایران دەست كرا بەتعقیبی بارزانی.

١-ستونیك لەژیر فرمادەی سرتیپ زنگنە لەناوچەی بالانوش- كەعبارەت بو لەگوردانی ١و٢ هەنگی بهادری لگل یەك گروهان لەهنگی ێسنی. ویەك أتشپارە ٧٥ ملیمتر ویك گروهانی خمپارە ویك اسورانی سوارەی هنگی فەوزیە لگل دوتانك جنگی ویەك تلسز لەدەورەی قاسملو وأخبلاق دامەزرا.

٢-ستونیك لەژیر فرماندەی سرهنگ انصاری لەمهابادەوە چو بو حسن لو بەقصدی گرتنی نغدە وشنو كەعبارەت بو لەدوگوردانی پیادە ویەك أتشپارە ٧٥ ملیمتر ویكدەستە خمپارە ویك گوردانی سوارەی لورستان لگل دو ئەرابەی جنگی.

٣-ستونیك لەمهابادەوە لەژیر فرماندەی سەرگورد. كلاشی كەعبارەت بون لەگوردانیك پیادەی هنگی همدان ویكدەستە توپخانەی ٧٥ ملیمتر ودو دانە خمپارە بەقصدی گرتنی پسوی وكوچ كردنی بارزانی لەدی گردەسپیان كەوتە ری.

٤-قولێكی عشائری كەعبارەت بون لەعشائری مامەش ومنگور لەژیر فرماندەی ستوانی ٢ نوبهاری لەمنطقەی پیران وبادینیاوا بونەهیشتنی بارزانی كەوتنە عملیاتەوە.

٥-قولێكی تر لەمهابادەوە كەعبارەت بون لە ٣ گوردان پیادە ویك توپخانەی ٧٥ ملیمتری ویك اسوران ویكدەستە مسلسل لگل دو ئەرابەی جنگی ناونجی وچوار عرابەی سوك وهنگی سواری فەوزیە لەناوچەی كوسە كەریز بو احتیاطی لشكر خوی لە بوسەدا.

٦-دەستەیكی فروك كەعبارەت بو لە ٧ فروكی فرودهاینە ودو فروندی تایگرموس- خرایە ژیر اختیاری فرماندەی نیرو وبەترتیباتی خوارەوە امری حرەكەتیان پی درا

١-ئەو لشكرانە هەمویان لەژیر فرماندەی سرلشكر همایونیدا ایش ئەكەن

٢-هیزی سرتیپ زنگنە لەپیش هەمو لشكرەكانا تعقیبی مەلا مصطفی اكات لەترسی ئەوەی كەنەوەكو دەستە زیرۆ وطە هەركی بچنە ناو كومەگی مەلا مصطفیوە. روژی ١٢اسفند سرلشكر همایونی لگل سرهنگ غفاری چو بو نغدە.

لەوی ملاقاتی شیخ احمد وملا مصطفی کرد لەنتیجەی گفتوگودا قەرار درا کەبارزانی لەنغدە وگردەسپیان بچنە دەرەوە ومنطقەی مامەش وپیران بجی بیلن. فعلاً بارزانیەکان ئەو قرارەیان بردە سەر وئەو شوینانەیان بجی هیشت. چون بو شنو وسندوس. لشکری حکومەتی چو جیگای بارزانیەکان ناوچەکانی نغدە وتەواوی لاجان کەوتە ژیر چنگی اوردوی دەولەتی.

ملا مصطفی لیرەدا غلطیکی زور گەورەی کرد کەئەم شوینانەی وابەأسانی تسلیم بەهیزی دەولەتی کردەوە. وبەم غلطە لەم ناوچەیەدا خوی خستە محاصرەوە. لەروژی ۲ سعات ۷ لەمانگی اسفند ستونی سرتیپ زنگنە لگل تاقم زیرو وطە هرکی لەدی لەدی کوکیا- کەوتنە شەرەوە بەبریندار بونی ۷ سربازی حکومەتی. دیهاتی کوکیان واوزان ومحمودأوا وقەلاچم-کەوتەوە دەست حکومەتی ایران.

و لەعینی روژا لەناوچەکانی قاسملوش. بو بەشەر دیسان بەکوژرانی ٥ نفر و١٠ نفری بریندار لەدەستەی سرتیپ زنگنە ناوچەی شیرین کند ومحمد رحیم کندیان- لەهیزی زیرو وگە هرکی پاك کردەوە. وهیزی دەولەتی لەوشوینانەدا دامەزراوە. وبەشکانی دەستەی زیرو وطە هرکی عشائرەکانی دەورەی رضائیە وکوردەکانی شمالی ایران. بەم تأثیرەوە محمد حسین حاتمی وقادر بگی رسولی وسید فهیم ورشید بگی جهانگیری کەسەر بەهیزی بارزانی بون هاتنە لای فرماندەی نیرو وتسلیم بونی خویان أشکرا کرد. ئەم بەسەرهاتەش دیسان لەناو کوردەکان دەنگی دایەوە روحیەی عشائرەکانی خستە وەسوەسە ولەعینی روژا دەولەتی ایران بیان نامەی خوارەوەی بەناو عشائرەکانی کوردا بەهوی طیارە بلاوکردەوە.

أگاداری

بو هەمو لایکی عشائری کوردوستان بلاو اکریتەوە. لەم وختەدا هیزی دەولەتی لەوپەرەوپەری مەرزی ایران بو راکیشانی دەوریکی امنیەت وأسایش هەول ئەدا. پیویستە هەرچەكو جلو برگو خواردەمنیك کەلەدیمکراتیان چنگ کەتوە لەمدەی ۷ روژا ئەبی تسلیم بەفرماندەکانی مهاباد ورزائیەی بکەنەوە. ولەعشائری منگور ومامەش وگەورك زیاتر ن . اسلحەی دیمکرات بدەستەوە بگرن. هی أمانیش ئەبی لەلاین حکومەتی ایرانەوە تسجیل بکری ولەلاین فرماندەکانی نظامیەوە اجازەی هلگرتنی بدریتی.

وئەو عشائرانەی کەلەشارەکاندان وەکو دیبکری وفیض‌الله بگی وشار ویران ئەبی لەمەودای ۳ روژا چکەکانیان تحویلی حکومەتی شارەکان بدەنەوە. وبو محافظەی عشائرەکانی خارجی شار حکومەت بەمسجلی چەکیان بەسەرا دابەش اکات لەمدەی ۷ روژا وروەسای عشائرەکان مسئولن لەکوکردنەوەی چەکی عشیرەتەکانیان. لەمولا هەرکسیك لەخلافی ئەم بیانە مشاهدە بکری حالاً سەوقی محکمەی زەمانی جنگ اکری.

وله ۱۵ مانگی اسفندا لەلاین ستادی لشکری ایرانەوە امر درا بەفرماندەی لشکر کەانذاری ملا مصطفی بکات بەدەستوراتی خوارەوە.

ملا مصطفی

تو بەخلافی بریاری کەلەتاران دابوت رەفتارت کرد. نەخاکی ایرانت بەجی هیشت ونەتوپەکانت تسلیم کردەوە وافسرە فراریەکانیشت نەداینەوە دەست. ایستاش روت کردوتە ناوچەکانی شمال ترگەوەرو مەرگەوەڕ ودەشتەبیل بو هیندی ایشی خەراپ لەضدی امنیتی حکومەتی. لازمە زور بەزویی بەبریارەکانی خوت وەفا بکەیت وخاکی ایرانیش بەجی بیلی.

همایونی

فرماندەی نیروی دەولەتی شاهنشاهی

ولەلایکی‌ترەوە امر درا بەفرماندەی لشکر کەمقری اوردو بگویزریتەوە بو رزائیە. نەوەکو لەبەرنەبونی ریگای تورکیا وعراق بارزانیەکان روبکنەوە ناوچەی رزائیە لەبەر بی‌ریگایی بفرو باران. انجا ملامصگفی لگل روەسای عشائری ترگەوەر ومەرگەوەڕ ودەشتەبیل کەوتە مژاکراتەوە. ملاقاتی زیرو وبهادری وطە هرکی ورشید بگ ونوری بگ ناوانی کرد. ئەو چاوپیکەوتنەی عشائرەکان بەتەواوی سرتیپ زنگنەی ترساند.

روژی ۱۵ اسفند گوردانیك پیادە لەهنگی ٦ لگل یەك دەستەی توپخانە ویکدستەی خمپارە لەوحدەکانی لشکری تەوریز لەژیر فرماندەی سرهنگ سردادور- بو تقویەی ئەو هیزانە گیشتە رضائیە. روژی ۱۸ اسفند نیروی کوردوستان لەسابلاخەوە نقلی جیگای کرد بو رضائیە وسرهنگ فیوضی رئیسی ستاد هاتە رضائیە. وروژی ۲۲ اسفند ماە سرهنگ نیساری لگل دو گوردانی پیادە وگوردانی ۲ هنگی

أسن وگوردانی ٦ أزرپاد لگل یك أتشپاره ٧٥ ملیمتر ویکدەستە خمپارە وارابە یك ویکدستەی سوار لەرضائیەوە بو ناوچەی دەرەی نەرچایی-وبەرزایی کیوەکانی-لەرنی- بەخیار بسەردادانی ملا مصطفی لە-موانی- کەوتنە حرەکەتەوە.

بەلام ئەو لشکرەی لەدەرەی قاسملو- کەمأموری میدان نەدانی اختلاتی عشائرو ملا مصطفی بون. لەروژی ١٩ اسفند شەریك یان لگل دەستەی محمد حسین ومحمد أمین هرکی توش هات. لەدەرەی شعبان کندی وباراندوز چای- لەنتیجەی ئەو شەرەدا (استواری ٢ ژاندارم فخر أزەری) بریندارکرا ودو نفریش لەتفنگ چیانی قرەقوشی ئەکوژرین.

اجا دەستورات درا بەهیزی نغدە وصوفیان وجلدیان- کەبو ناوچەی شنو بکەونە حرەکت. بو ئەوەی بتوانن زور زو دەرەی قاسملو وأخبلاخ- بگرنە ژیر دەستی خویان بو ئەوەی کەبارزانیەکان لەناو جوغزیکی بفرا گەمارو بدەن. لەروژی ٢١ اسفند ماه بەترتیباتی خوارەوە لشکری دەولەتی بو سەربارزانیەکان أراستە کرا.

١-دەستەی دولّی قاسملو عبارەت بو لەگوردانی ١و٢ جنگ بهادری ویکدستە توپخانە ویەك عرابەی جنگی ودو دەستە پولیس کەدەستەیکیان لەشوینە بەرزەکانی-کوکیا- دامەزرا بو ودەستەکەیتریش یان لگل یکدەستەی توپخانە و١٢٠ نفری عشائر بو گرتنی دەروی چالایی- بالاندوز لەژیر فرماندەی سرهنگ فولادوند خویان لەمەکو دابو.

٢-بو سەرپەرستی ریگای دەرەبند- لەشمالی بالاندوز چایی- کەئەوپەری شاری رضائیە اگریتەوە. یەك گوردان ویەك دەستە مسلسل وچند تفنگ چیك عشائری ویکدستەی ژاندرمە بو ئەو ناوچەیە بەرێ کرا. ولەشیوی قاسملو خوی دامەزراند

٣-ستونی سرهنگ نیساری- عبارەت بو لەدو گوردانی پیادە ویك أتش پارە ٧٥و دو دستگای عرابەی جنگی ویکدستە خمپارە ویك اسورانی سوارەی فوزیە ویکدستەی مسلسل لەرضائیە بەقصدی گرتنی- مواناى- محالی ترگەوەر کەوتە حرەکەت.

٤-و گوردانیکی پیادەو دو سواران ودودستە مسلسل هنگی سواری فوزیە ودو ارابەی جنگی ویك گروهان توپ ٣٧ احتیاط بەقواتی شمالی ترتیپ کرا ولەرضائیە مایەوە.

١-لەتازە کند-یك گوردانی پیادە ویکدستەی توپخانە ویك دەستگای ارابە.

٢-لەقلاجوق- گوردانی سواری لورستان‌و یکدستگای خمپارە.
٣- لەصوفیان یك گروهان لەگوردانی همدان‌و یکدستە مسلسل و١٥٠ نفر سواری لەعشائری منگور ومامەش. ٤-لەدرەقورچی ٣٠٠ سواری عشائری منگور ومامەش .
٥-لەشیناوا-یك گروهان لەگردانی همدان ویکدستە مسلسل.
٦-لەگردە سپیان-یەك گروهانی پیادەی همدان ویکدستە مسلسل.
٧-لەنغدە یەك گوردان ویەك گروهانیش لەتیپی کرماشان ویکدەستە ٧٥ وأتشپارە ١٠٥ کوتاە ماتوری و٣ ارابەی جنگی
٨-لەمهاباد دو گوردانی پیادە هنگی ٤ سواری کوردوستان ویەك أتشپارە ویکدستەی ٧٥ ودو دەستگاە ارابە بو احتیاط لەجنوبا دامەزرا بو.
٩-حەوت طیارەی هاین و ٢ تایگرموس خرایە ژیر قیادەی فرماندە وبو تسریعی بردومان نقلی رضائیە کران. وفروکەخانەیکی تریش یان لە ٨ کیلومتری شمالی رضائیە لەبینی أوایی لالەلو- وتاج علی-وچارچی‌لو- لە ٢٣ اسفند دامەزراند. بو لەناوبردنی هیزەکانی بارزانی.
ملا مصطفی تاقمیکی لەنفراتی هەرکی وشکاك ناردە سەر ریگای هیزی سرهنگ نیساری (لەموانە- کیوەکانی قزل بند-یان لەو لشکرە گرت. ملا مصطفی کەوتە سەر ئەو فکرەی کەبەهوی ئەو افسرانەی کەلەقسمی اوردوی ایران وأزربایجان وارمنی وأسوری کە پەناهیدەی ملا مصطفی بون تشکیلاتیکی خودمختاری دابمزرینی لەشمالی ایرانا. جا بەم نیازە بەرە بەرە خویان لەمەرزی شورەوی نزیك ئەکردەوە. لەگەل کوردی-جلال ی‌ومیلانلی وهرکی وشکاك نزیك بووە. ولەگەل کوردی أرارات-انظمەی ئەو فکرەی ریك خست.
لەأشکرابونی ئەو فکرە فرماندەی لشکر همایونی بەنقاطی‌خوارەوە انذاری ملا مصطفی کرد. لگل ئەوەی کەقەرار وابو بەتأریخ ٢٣ اسفند ملا مصطفی بی‌تە نغدە بو مذاکرە. بەلام هەتا ایستا حاضر نەبووە. وقرار دادەکەی خوتان بەدرو خستوتەوە. دوهەم قەرار وابو مالەکانتان لەمەرزی عراق نزیك بکەنەوە کەچی بالعکس هەروا بو شمال هەل ئەکشین وادیارە فکریکی شوم تان لەمیشکایە. بەلام أقبەتی ئەو بیرە بو ایوە

زور خەراپە. پی‌ویستە بەگورجی منطقەی شنو وترگەوەر ومەرگەوەر ودەشتەبیل بەجی بیلن وروبکەنەوە مەرزی عراق.

وشیخ احمد لەجیاتی ملا مصطفی وەرامی دایەوە. تاچند روژیکی‌تر شنو چول ئەکەین وموافقی أرەزوی ایوە ئەجولیْنەوە. وغایەی شیخ احمد لەم نوسینەدا ئەوەبو کەبو مدەیەك ایران اخفال بکەن هەتا لەمنطقەی (اکراد شاهپور) نزیك ئەبنەوە وخویان ئەگینە کوردی چەك داری جلالی. واختیاری تعقیبی ملا مصطفی درایە دەست سەرهەنگ بیگلری بو ئەوەی کەلەجنوبەوە غفلتاً هیزی ملا مصطفی راوبنی. ولەناکاو هیزی بارزانی خان‌طاوس- وەوەزنە- بخاتە ژیر دیلی وریگای گادەریش-یان لەرو دابخات. بو ئەو فکرە گوردانیك لەهەنگی ١٢ کرماشان لگل دو ارابەی جنگی لەژیر فرماندەی سرهنگ غفاری لەقولی وەزنە وخان‌طاوس بو حملەی بارزانی أمادە کرا.

بەگوردانی همدان دەستور درا کەبچنە نەلوس-٣٠٠ نفری سواری منگور بو اکتشاف ومحافظەی قەلاتی سنگان بکەونە فعالیەتەوە. وامریش بەسرهنگ انصاری کرا کەلگل گوردانەکەی خوی وسوارەکانیا بچیتە چالایی-نغدە بەدوا ارابەی جنگی ویەك أتش پارەوە. وسرهنگ غفاریش أگادار کرا کە بەشەو بچنە سەر بارزانیەکان لەوناوچەیەدا. شەوی ٢٤ اسفند هجوم کرایە سەر بارزانیەکانی خان‌طاوس وسعات ٧ روژ دەست کرا بەشەر چە بەتوپ وچە بەتانك وطیارە وتفنگ. لەسعات ١١ روژا وەزنە- سقوطی کرد. وچند بارزانیك کە لەدربندی شیطان أوا- مابونەوە بەدەنگی طوپەکانەوە خویان کوتایە پشتی وەزنە وخان‌طاوس.

هیزی دەولەتیان لەم ناوچانەدا رّاگوشی. نفریکی استوار لەوی کوژرا وباقی هیزەکە تسلیم بەبارزانی بون. بەلام سروان ریجبون- بهاوارەوە هات بەشەریکی زور قورس ئەو قلاتەیان لەبارزانیەکان ساندەوە. ولەچەپیشەوە گروهانو نیویك همدان ویکدستە ٧٥ توپخانە بەشەر داخلی نەلوس-بون. ولشکری منگوریش ئەیانەویست لەچەمی گادەر- بپرنەوە کەبچنە ناو قەلاتی سنگانەوە ولەوە بی خبر بون کەبارزانیەکان هەربە شەو خویان کوتاوەتە ئەو قلاتەوە. بارزانیەکان دەست رّیژیان لەمنگورەکان کردبو لشکری زەرزە ومنگور کە ٤٠٠ نفر بوبون بەکوشتاریکی زور پیس هلات بون ولەم شەرەدا أغای ازای منگور همزەی اصلان مالکی دی ترکش منگور لگل عولا

أغای كاك محمد أغای وجاخی كاك خدر و٧ أغای‌تری منگور وچند نوكەریكی منگور لەچەمی سنگان لەو شەرەدا ئەكوژرین.

اجا بارزانیەكان هجوم ئەكەنە سەر گوردانی همدان لەنەلوسا وسرهنگ كلاشی نەلوس چول ئەكات. بارزانیەكان لەهەمولایكەوە استحكاماتی دەولتیان شەق كرد بو. و ئەو هیزەی كەلەنغدە وسابلاخەوە بو نجات دانی سرگورد كلاشی هاتبو نەی توانی بو التحاق بەهیزی كلاشی بكات هەتا ٢٥ اسفند ساعەت ٤ روژ سرهنگ كلاشی بەتوپی بارزانی ئەكوژری لگل ضابطیكی ترا وهیزەكەشی تسلیم بەبارزانیەكان اكری وهەر لەم شەرەدا صوفیان وجلدیان ئەكەویتە دەست بارزانی ولشكری سرگورد كلاشی عبارەت بو لەیك گروهان پیادە ودو دەستە مسلسل قورس ویكدستە طوپخانە ویك قبضە خمپارە و٤٠٠ نفری عشائری مامش ومنگور وزەرزە كەئەمانەش لەژیر فرماندەی ستوان ٢ نەوبهاریدا- ادرارە اكران. ولەعینی روژا توپیكی بارزانی لەلولەی توپی ایرانی ادا ٧ نفری طوپچی لەسەر توپەكە ئەكوژرین و٦ نفر سرباز بریندار ئەبن و٨ اسیریش هەرلەو شوینەدا ئەكوژین. بەلام داخی گرانم لەم شرەدا شەوكەت عەزیز- طوپچی بارزانی بەر رەشاشی طیارە ئەكەوی وشهید اكری. وهەتا سعاتی كوژران سرهنگ كلاشی داوای امدادی لەتەوریز ئەكرد بەلام امدادەكەی دەفریانكەوت. ولەعینی وختا ٦٨ نفری سربازی نلوسی تسلیم نفسی بەبارزانیەكان ئەكەن لگل پینج نفری افسری ایرانیدا كەناویان عبارەت بو لە-پزشك خدادوست ٢-وستوانی یكەم یعقوبی ٣-ستوانی یكەم بصیرەت ٤-ستوانی ١-كمالی ٥-ستوانی ٢-فاطمی.

بو گرتنی صوفیان وجلدیان ونلوس لەنغدەوە قوەتیك لەژیر فرماندەی سرگورد مساواتدا- حرەكەتی كرد لەبەرزایەكانی چوار بت- لەسعات ١١ شەوی ٢٦ اسفند وتانكەكانی سروان رجیبون- لەسەرجادەی شوسەكراو لگل بارزانیەكان كەوتنە شەرەوە. وبربەرەكانیكی زور دلیرانە لەلاین بارزانیەكانەوە رویدا. لەسەر ریگای تانك وارابەی جنگی چالیان هلقندبو. تنها نفریكی بارزانی لەو چالەدا یاغی بوبو ٢٠٠ گوللەی بەتانكەكانەوە نا. هەمو اندامی تانكەكانی بەگوللەی تانك بر كون كون كردبو. هەتا تانك بەسەر خندەقەكەدا تی نەپەری بو وهەمو لەشی ئەو قارەمانەی تیك نەهاری بو سنگەری پی سپیرەراوی چول نكردبو.

اجا لشکری سەرگورد مساوات بەکوشتاریکی فاحشی داخلی صوفیـان بـو. بەیکدستە مسلسل وچوار دەستە پیادە ویەك ارابەی جنگی لەژیر قومـاندەی سـرهنگ انصاری لەصوفیان استقراری گرت.

## دەستوراتی وزارەتی جنگ بو وحدەکانی

لـەروی تـاثیری حوادثـی نـالوس وزارەتـی جـەنگ لـەپاش موازەنـەیکی جنگـی بەتقریری خوارەوە فرمان ئەدا بەهیزەکان.

۱-پی‌ویستە هیزی بچوك برامبر بەبارزانیەکان رانگرن. چونکە بەتجرەبە اثبات بووە کەبارزانی زور أزان ولەگیانی خویان بیزارن بی پەروا پەلامار ئەدەن ولەمردن ناترسـن واستفادە لەنقاطی ضعیف ئەکەن هیزی بچوك خویان بو ناگری. ئەگەر زور بەدقـەت مقاوەمەتی بارزانی نکەن ممکنە بەسەرهاتی نەلوس تازە بکەنەوە. بو ئەوەی کەمسـئلەی ناشیرنی نەلوس لەبیر بچیتەوە. پی‌ویستە هەرچند زوترییت عـدەی سـرهنگ انصـاری و سرهنگ غفاری بچیت نەلوس بگریتـەوە. وبچنـە شنووە. بـەلام طیـارە ئـەبی لـەپیش اوردودا بچیت بارزانیەکان بترسینی اجا اوردو حرەکەت بکات.

لپاش گیشتنی دەستوراتی سەرەوە وهاتنی ستونی سرهنگ ۲ غفاری بو صوفیـان قرار درا کەبیانی روژی ۲۷ اسفند بچنە سـەر بارزانیـەکان. بـەلام بارزانیـەکان لـەپیش حملەی هیزی دەولـەتیدا لە۳سـی قولـەوە هجومیـان کـردە سـەر هـیزی دەولـەتی ولـەو هلمەتـەدا ۱۸ گوللـەی طوپیـان تـەقاند هـەتا سـعات ۱۲ روژ لـەلاین بارزانیەکانـەوە هلمەت دان دەوامی اکرد.

وگوردانی سوارەی لروستان ودو گوردانی پیادەی توپخانـە دەسـتی بەپـەلاماردانی متقابل کرد. لەرەغمی ئەوەی کەباران بەشدەت بو بارزانیـەکان زور بەمەردانـە شـەریان ئەکرد وسنگرەکانیان بەجی نەئەهیشت وتانکـەکان سـنگرەکانی بارزانیـان ئەشیلاوە. وطیـارەش لەهـەواوە بەشـدەت آگر بـارانی بارزانیـەکانی ئـەکرد. هـەتا ایسـتا هـیزی دەولەتی ایران شەریکی أوا بەهیز وغیرەتی لەعشایرەکانی ایران نەدیبو. هـەتا شـدەتی پەلاماردان گیشتە اندازەیك سـەربازی دەولـەتی بـەبومبای دەسـتی پـەلاماری بارزانیـە پەریشـان وبی‌فیشـکەکانیاندا لـەنلوس وناوچـەکانی نلـوس دەریـان پـەراندن. ولـەو مصادمەیەدا رضا قرەپاغی فرمـاندەی گروهـاتی مسلسـل وگوردانـی ۲ هنگـی ۱۲

تیپی کرماشان لگل ده نفری سەرباز کوژرا وچند نفریکیتری سـەربازیش بریندارکرا.
روژی ۲۸ اسفند گوردانی شیناوه نقلی صوفیان کرا.

## عملیاتی بارزانی لەجنوبی رضائیەوه

لەوختیکا کەهیزی ملا مصطفی لەجنوبی رضائیه لـەقاسملو وبالاند و ژچای- وموانه- دامەزرابو ستونی سرهنگ نیساری لەسعات ٥ روژی ۲۱ اسفند ۳۲٥ ئەچیتە سەر ملا مصطفی لەبەرزایەکانی-لـەرنی- تـاقمی رشیدبگی هـەرکی ریگایـان بـەو هیزه گرتبـو وچنـد نفریـك لەسـەرباز ئـەکوژن لـەگوردانی هنگـی أسـن. بـەلام بەهـەر کوششی که بو هیزی دەولەتی توانی کیوەکانی لرنی وقزل بند وپوتەلان-بخاته دەست خوی. لەعینی وەختا رشید بگی جهانگیری رئیسی عیلی هەرکی لگل نوری بگ ناودا کەیکیك بو لەخاوەن نفوذەکانی ناوچەی تەرگەوەڕ. قاقەزی اخلاص وخذمەت کاریان دا بەپەرلشکری ٤ کوردوستان داوای بخشین وتـأمین حیاتیـان لیکـرد. سرلشـکری نـاوبراو لەوەلاما بوی نوسینەوه پیویسته بەگورجی تسلیم نفـس بکـەن. وچکـەکانیان رەوانـەی حکومـەت بکەنـەوه حـالاً آزاری قـانونی ئـەبینن. هەرلـەو روژەدا لـەکیوەکانی لرنـی شەریکی بەشدەت لگل بارزانی کرا چند نفریکی امنیه کوژراز روژی ۲۲ اسفند سـالی ۳۲٥ رشیدبگی جهانگیری لەرضائیه ملاقاتی سرلشکر همایونی کـرد. تسـلیم بونـی رشـیدبگ تـأثیریکی زوری کـرده سـەر روحیـەی عشـائرەکانی کـورد. بەرەبـەرە عشائرەکانی جنوبی رضائیه اعلانی دەخالەتی خویان أشکرا کرد بەبی قیدو شـەرت. ولشکری دەولەتی بەبی شەر چو ناو (موان) جیگای ملا مصطفی ولـەوی استقراری گرت.

ملا مصطفی کەبیستی رشیدبگ تسـلیم ئـەبی امـری دا بـە-امـری بـگ وشیخ محمدی میزا أغا- وەولوبـگ- وبـرادی أسوری کەبـه ۲۰۰ نفـرەوه بچنـه سـەر ریگـای رشیدبگ نەهیلن تسلیم نفس بەدەولەتی ایران بکـات ولەگـەل هـیزی دەولـەتیدا بیتـه موانه- بەلام مـتأسفانه ئەم بەرگریه دەفریـای دەخالـەتی رشـیدبگ نکـەوت سـەرهنگ نیساری لەپاش گیشتنی بەموانه-تاقمیکی لـەهیزی رشـیدبگ لگـل هـیزی دەولـتیـدا نـارد بـو جنوبـی موانـه- بـو دیـهاتی شـیخ شـیرین وزنگـلان وتولگـی وأمنــه- بــو بەرهلستی بارزانیەکان.

### عملیاتی سەرهنگ نیساری لەجنوبی موانا

روژی ۲۳ اسفند تفنـگ چی رشـیدبگ ونوری‌بـگ لەبەرزایـەکانی تولگـی وشـیخ شیرین وکسرت- لگل هیزی بارزانیدا کەوتنە شەرەوە هیزی دەولـەتی خرایـە فشـارەوە. ملا مصطفی توانی ئەو هیزە بەقوەتە بە ٥٠ نفر کوشـتار بشـکینی وئـەو شـوینانەی خوارەوە بکەن بەجیگای خویان.

۱-ملا مصطفی بە۲۰۰ نفرەوە لەکیوەکانی (کوسرەت

۲-۲٥۰ نفری بارزانی چونە بەرزایەکانی (بەردەسو

۳-۳۰۰نفر لەأوایی-تویی

٤-۲۰۰ نفر لەبەرزایەکانی. کوکی

لەعینی وەختا لەوشـوینانە هـیزی دەولـەتی جنگیکـی خوینینی‌یان لگـل هـیزی بارزانیدا کرد بە ۱۰ نفر کوشتار و۱٥ نفر بریندار عشائر وهیزی حکومـەتی دەولـەتی ایرانیان شکاند.

لەروژی ۲٤ اسفند ستونی سرهنـگ نیساری کە لەچوار کیلومتری جنوبی موانا بو لگل قوەی رشیدبگ ونوری‌بگ لەچدی بارزانیەکان داخلی معرەکەبون ئەوانیش بەپینج نفر کوشتار خویان کیشایە دواوە. لـەروژی ۲٥سـفند هنگـی نیسـاری لەبەرزایـەکانی- کونەجار لگل دەستەی ملامصطفی کەوتنەشەر. دەستەی رشیدبگ هرکـی شـەریکی زور أزایانـەیان لگـل ملامصطفـی‌دا کـرد. مـلا مصطفـی ناچـار بـو کـەبو کیـوی (کولـی) بگەریتـە دواوە. ولـەوی خـوی قـایم بکـا. لـەروژی ۲٦ اسـفند امـر بەسـتونی سـرهنگ نیسـاری کـرا کـەلگل سـتونی سـرهنگ پرتـەوی- لەسـیلوان- یکدیگـیربن لەسعات پینج روژی ناوبراوا دەست کـرا بەشـەر. بەشـەریکی زور بەشـدەت بـارزانی دی سیلو-یان چول کرد. و لەبەرزایەکانی پیرهادی ونوشان- دونفر سرباز کوژرا.

وبەسرعـەت هجومـی سەر ترگەوەر ومەرگەوەر ودەشتەبیل لەجنوبی رضائیە دەست درایی. ئەو هلمتە بەتکانانەی حکومەتی بەتەواوی چاوی عشائرەکانی ترساند.

قبادخانی کـوری اسمـاعیل خـانی سمکـو بـەهوی عمرخـانی شـکاك تسـلیم نفسـی بەفرماندەی رضائیە کرد وطلبی اسلحەی لەحکومەتی ایران کرد کەشـەری پـی لگـل بارزانیەکانا بکات.

٢٠٠ نفر لەعشائری مرگـەوەر و٥٠٠ نفـر لەعشـائری شـکاك لـەلاین حکومـتـەوە چکیان دراییی بو بەشەرهاتن یان لگل بارزانیدا وفعلاً اشتراکی شەریان لگل بـارزانیدا کرد. بـەلام لەگـەل ئەوهـەمو خیانـەت وبـرادر کوژیـەیانا حکومـەتی ایـران تأمینـاتی بەشکاك وعشائرەکانی کورد نەئەکرد بو نمونـەی مثـال تەماشـای دەسـتوراتی سـتادی أرتشی ایران بکەن لەخوارەوە.

## دەستوراتی ستادی أرتش بو هیزەکانیان

لەستادی أرتشی ایرانەوە خطاب بەفرماندەی لشکر همایونی نوسراوە.

١-لـەرغمی ئـەوەی کەسـتونی نیسـاری وپرتـەوی-زور لەپیشـکەوتنان. بـەلاّم پاشەوەیان زور لە خطر دایە. ئـەبی زور آگـاداری پاشـەوەیان بکـەن. نـەوەکو عشـائری شکاکەکان لگل مـلا مصطفی‌دا ریك بکەون بو ضربـەی هیزی دەولـەتی

٢-زور آگاداری ئەوەبکەن نەوەکو لشکری بارزانی اخفالتان بکەن ولەغفلتا پی‌تانا بدەن.

٣-میدانی ئەوە مدەن کەشکاك لگل ستونی نظـامیدا داخلـی جبهـە بـبن چونکـە مدەتیك لگل مـلا مصطفـی هـاوفکربوون نـەوەکو فیلیـك تـان لی‌بکـەن.. پی‌ویسـتە روءسای خیلی شکاك بەسرّی بەرن بو رضـائیـە بیاخنـە ژیـر مراقبـەوە وبەأشـکرایش احترامیان بگرن.

٤-لـەأغوات وبگزادەکـانی ترگـەوەر ومرگـەوەر اسـتفادە اکـری. بـلام نـابی لـەناو ستونی نظامیدا ایش یان پی‌بکری

٥-هیزە بچوکەکانتان زل بکەن. هیچ هیزیك تان لەگوردانیك کمتر نەبی.

٦-بەدریژایی جبهەکان لشکرەکانتان ئەبی تیکلاویەتی یکتریان ببی

٧-راپوری طیارەچیەکان هەتا ایستا زور بەمعلومات نەبوە

٨-لەکاتی هجـوم بوسـەر بارزانیـەکان ئـەبی تـانك وسـیارەی زرەپـوش پیشـرەوبی چونکە موفقیەتی لشکر لەم دوانە دایە.

روژی ٢٨ اسـفند نرکـی وزرکـی-تسـلیم بەسـەرهنگی سـواری علیقلـی وسـرهنگ مظفری بو. بەتسلیم بونی ئەو دو جیگایە بەتعریضی خوارەوە لەستادی أرتشی ایران فەرمان پخش کرا

١-قدرەتی بارزانی چندە
٢-موجودی چەك وزخائریان.
٣-زەخیرە وخوراکیان لەکویوە چنگ ئەکەوی
٤-ارتباطیان لگل عشائرو رەفتاریان لگل شکاك وهەرکی چونە
٥-ارتباطیان لگل روس وتورك وعراق وعشائری مەرزی چونە
بەترتیبباتی خوارەوە لەلاین فرماندەی لشکر جوابی ستادی أرتش درایەوە
١-هیزی بارزانی تقریباً ١٥٠٠ نفر ئەبی کەمخصوصاً بارزانی بن. وتفنگەکانیان هەموی برنەوە لە ٣٠٠ وە هەتا ٥٠٠ تفنگ چی اتباعی زیرو وطە هەرکی‌یان لگلایە. و ٥٠٠ نفریك أسوری وافرادی فراری فرقەی دیمکراتی أزربایجان ورضائیەیان تیکلاوبووە. لشکریکی ٢٥٠٠ نفریان أراستە کردوە. تقریباً ٥٠ مسلسل و٥٠ أفتومات ومقداریك نارنجوکی دەست یان پی‌هیە. وفیشکی ضدی تانك وگوللەی کونکەری ارابەیان هیە. ماشین وتوپخانەش یان تا اندازەیك هیە.
٢-بو زەخیرە زور پەریشانن روژ بەروژ لەدەشتەبیل وترگەوەر ومەرگەوەر زەخیرە کوئەکنەوە.
٣-ادارەیان لگل عشائرەکانا خەراپ نیە. بەلام بو مسئلەی زخیرە فشاریان بو عشائرەکان هیناوە.
٤-ارتباطیان لگل شکاك وهەرکی بەرقرارە.، وادەرئەکەوی کەبینی‌یان خەراپ نەبی. ولگل قونسولی خارجی رضائیە بواسطەی ارمنی وأسوریەکانەوە ارتباطیان هیە.

## ملاقاتی دو فرماندەی عراق وایران لەحاج اومران

روژی ٢٩ اسفند ٣٢٥ فرماندەی لشکری ایران همایونی لەحاجی اومران ملاقاتی فرماندەی پولیسی عراق سید علی حجازی کرد بو ترتیبباتی لە ناوبردنی بارزانیەکان. وبەهۆی وەزارەتی خارجەی تورکیاوە لەتاران. تورکەکان وەعدیان بەایرانیەکاندا کە بو تعقیباتی بارزانیەکان ٣ پاسگاە لە مەرزی تورکیا دابمزرینن یکیکیان لە-دالّەمرداخ-دوهەم لەکیوەکانی-درە بنارد-٣-لەبرامبر-زرکا- زەرکی-- لەحدودی ایران لەناوچەی دی- کوتان-

ملا مصطفى بو نجات دانی عیلی بارزان زیاتر ریگای (دەربناردی تورکیای گرتبو بەرچاو. لەأوایی روستمان-و شیرگان وسیل أوا ١٥٠ نفری بارزانی لگل توپیکی ٧٥ فوهتی دامەزراندبو روژی ٣٠ اسفند ٣٢٥ لەلاین شای ایرانەوە بەدەستوری خوارەوە بەهوی ستادی لشکرەوە ئەم فەرمانەی بلاوکردەوە بو لشکری چواری کوردوستان

١-لەرغمی ئەوەی کەایوە خاوەنی هیزیکی گەورەن زور سستی‌تان کردوە لەدەرکردنی بارزانیەکان. بەگویرەی هیوای ایمە اقداماتان نەکردوە بو لەناوبردنی بارزانیەکان اخباراتی بارزانی زور لەهی ایوە بەقوەت ترە. لەهەر جیگایی کەحسی ضعفتان لی‌بکەن پی‌تان ئەدەن. ولەهەرجیگای کەزانیان ایوە بەهیزن ئەکشینە دواوە.
بارزانیەکان تنها بەهوی دوتوپ توانیویانە دوجار ایوە گوللە باران بکەن. جاریك لەنلوس وجاریك لەنغدە. وهەتا توپیکی ایوەیان بەگوللە شکاندوە. ایوە نەتان توانیوە هیچ بەمان بکەن. ئەبی ئەمە بکەن بەدەرسی عبرەت کەجاریکی‌تر بەسەرهاتی نلوس تکرار نکاتەوە. وأگاداری ئەو نقاطانەی خوارەوەش بکەن.

١-لەهیچ نوختەیکا هیزتان نابی لەفوجیك کمتر بی.

٢-بەهوی فروك ئەبی تەواوی ریگای کوچ‌وبار وقرارگایان ببیژنەوە.

٣-بەهوی عشائرەکان مخلص ئەبی روژ بەروژ لەاحوالاتی بارزانیەکان خبردار بن.

٤-هەتا ١٥ فروردین ١٣٢٦ ئەبی مسئلەی بارزان تەواو بکری.

٥-أغواتی منگور ومامەش ودیبکری لەسەر دوستایەتی حکومەتی توشی ضرەر بوون ئەبی پاداشت یان بدریتەوە ومیدانی دلسارديان نەدری.

٦-فرماندەی ستون بو یارمەتی خوت تعینی بکە یکیك لەدرەی قاسملوو یکیك لەناحیەی شمالی مەرگەوەر ویکیك لەمنطقەی نغدە وصوفیان. کەئەمانە بەدایمی بو یارمەتی یکتر قیام بکەن بەتعقیبات.

٧-لەقسمی استخبارات ئەبی زور ووریا بن.

٨-لەمراقبەی بەسەرهاتی شەو زور أگاداربن چونکە بارزانیەکان لەمسئلەی شەوا دەستیکی بالآیان هیە چونکە تجاربات یان زورە وشبیخون کاریان زور کردوە. استفادەیان لەموانعی طبیعی زەمین کردوە لەشەوا.

## ملا مصطفى لەأوایی کولیچ واسیرکردنی سەرباز

دو گوردانی پیادە ویـك توپخانـەی ٧٥فوهتـی لـەژیر فرمـاندەی سرهنگ مجیـدی روژی ٥ فروردین ٣٢٦ گیشتە أوایی ارنە-ودربند- کـە لەتـەوریزەوە بـو امـدادی تـازە بڕیکرابون ستونی سرهنگ نیسـاری لگـل سـوارانی نـاوخویی رشـیدبگ ونـوری بـگ هەرکی لەبەرزایەکانی جنوبی روژهلاتی سنگان وکیوی قولقوله- لـەروژی ٢٩ اسـفند لگل بارزانیەکان کەوتنە شەرەوە هنگی سوارەی فوزیە فشـار درا. لـەم وختـەدا لـەلاین سرهنگ فولادەوند- دەستور درا کەلەشیوی پالاندوژچاییەوە کومـگ بـەهنگی فەوزیـە بکـات. وبارزانیـەکانیش ئەیانەویسـت لەبەرزایـەکانی روسـت وشـیرگان وقولقولـە وکیوەأخ-و قلاسە-لگـل لشـکری زیـرو وطـە وبـهادر چاویـان بەیك بکـەوی لـەدرەی قاسملو. بلکو لەناوچەی دەشتەبیلا اوردوی دەولەتی محاصرە بکەن.

لەروژی ٣ فروردین ٣٢٦ لەأوایی کولیچ لگل هـیزی دەولـەتیدا مـلا مصـطفـی هەرای دامـەزراند هیزی دەولتیان لەختەیکی ضعیفەوە خستە محاصرەوە. ستوانی یکەم محمدی أمامی و١٣ نفری سـربازیان لەوشـوینەدا کوشـت و٩ نفریشـیان برینـدار کـرد. وستوانی ٢ حمیدی جهانبانی لگل ١٥ نفری سرباز اسیر کرا. ولەسوارەی محلیش دو نفـر کوژا ونفریك بریندار کرا و٤٠ تفنـگ و٣ مـسلسل یـان لگـل اندازەیکـی زوری فیشـك چنگ کەوت.

لەعینی روژا لەبەرزایەکانی قلاسـی-و روسـتم أوا بـارزانی لگـل هنگـی سـوارەی فوزیە کەوتنە شەرەوە بارزانی ٥٠ نفربون ئـەمیش لەدەسـتەی زیـرو وبـهادریبون هـەتا نیوە شەو شەر دەوامی کرد. هلیان کوتایە سەر سنگرەکانی اسـوەرانی ٢ لـەو جنگـەدا ستوان ٢ اسوەران مصطفی هاتفی لەنزیك آوایی (ناری) لگل ٧ نفری سرباز کـوژرا وچوار نفریش بریندار کرا.

روژی ٤ فروردین لەبەری بیانیدا طیـارە دەسـتی کـرد بـەبومبابارانی ناوچـەکانی روست. هەتاایوارە ٦ جار طیارە روژأوای روستی بەردومـان کـرد. بـەلام خوشـبختانە ئەو روژە ٣ طیارە بەر گوللەی بارزانی کەوت. وبەشکاوی گیشـتنەوە فروکەخانـەکانی رضائیە ودستور درا بەگوردانی اصفهان کەفوراً بچیتە سیلو. لەسـەر ئـەم بەسـەرهاتە ناشیرنەی کولیچ- ستادی لشکر بەدەستوراتی خوارەوە امری دا بفرمـاندەی لشکر.

١-بارزانیەکان لەنقطەی ضعفەوە پەلامار ئەدەن ولەنقطەی قویدا مدافعە ئەکەن. ولەزوری ادامەی شەر انسحاب ئەکەن لەدوای انسحاب مەرکزیکیتر ئەدوزنەوە بو پەلاماردانیکیتر ئەکەر زور آگادارنەبن بارزانی ئەتکیکی گەورە بەسەر لشکر ئەهینن. وزورتر لەبەسەرهاتی شەو آگاتان لەخوتان بی.

لەروژی ٢ فروردین ٣٢٦ ستونی دیرژ- بفرماندەی سرهنگ علی قولی مظفری- لەروژهلاتا لەبەرزایی جنوبی دیرش- وجنوبی روژآوای شیطانآوا وزیوە ونصرآباد ودربندی نازناز- لگەل بارزانی کەوتنە شەر دەستەی بارزانی لەوشوینە ٦٠ نفربو. لەدوایی شەردا دو نفر ژاندارم کوژرا و٣ نفر بریندار بو لەنفراتی هنگی سوارەی کوردوستان.

## دەستوراتی تاران

لەتارانەوە دەستوری تازە درا بەفرماندەی لشکر کەبەپی حرەکاتی ئەو چوار روژە وادەرئەکەوی کەبارزانیەکان لگەل دەستەی زیرو وطە هەرکی فکری ئەوەیان هیە بەرزایەکانی بینی دەشتەبیل ومەرگەوەر وەدەرەی قاسملو وشنو بگرن. بو ئەوەی کەزەخیرەی خویان بەآسانی تەواو بکەن وزحمتیکی زوریدەنە بەرهیزی دەولەتی. جابەم بونەیەوە ئەبی بەهەمو رەنگیك کوشش بکری بەرزایەکانیان لی وەربگرنەوە. بەم تدابیرە بارزانیەکان لەگرد آوەری زخائر نائمید ئەبن. ومنگقەی حرەکت وهاتوچویان بچوك ئەبیتەوە. هەم بومباباران وهدەفتان باشتر بو بەانجام ئەگەیندری.

لەبەرئەوەی کەبەرزایەکانی دەشتەبیل وتەرگەوەر بەبفر گیراوە نابی ایوە لە (قلاسی)وە تیپەریکەن. وستونی دیژج ئەبی بەرزایەکانی درەی قاسملو وسیاوان بگری بو ئەوەی نیرو بتوانی لشکری بارزانی لەیك منطقەی کویستانی مرگەور اسیربکات. بەم پییە بارزانی محصور اکرین وطیارەش بومبابارانی بەاستفادە اکات.

روژی چوارەم فروردین ستونی سرهنگ پولادەوەند بودرەی باراندوزچا کەوتە حرەکەت وبەرزایەکانی جنوبی نرەلریان- اشغال کرد لگەل ستونی سرهنگ نیساری تیکلاوبون. لەروژی ٥ فروردین ٣٢٦ بەرزایەکانی بەردە زەرد وقلقلە ورووست-یان بەردومان کرد ولەو معرەکەیەدا چند بارزانیك بەرشاشی طیارە شهیدکران ولەروژی ٦ فروردین ستونی سرهنگ مجیدی لەقرلاتی پیرناهرا-لگەل بارزانیەکان کەوتە شەرەوە.

بارزانیەکان دەستەوکەریکی زور دلیرانەیان کرد. گروهبان دوهم محمد علی پورقاسمی لگل دونفری سەرباز کوژرا. ستوانی یکەم رەوفی لگل پینج نفری سرباز برینداركرا. ولەبارزانیەکانیش کوژراو وبریندار زوربو بەهوی گوللەی طوپەوە. روژی ٦ فروردین رئیسی ستادی أرتش رەزم آرا هاته ناوجبهه چەژنانە وخەلاتی شا کەعبارەت بو لە ٣٠٠ پارچەی نیوی پهلەوی ألتون کەلەلاین شاوە بو افسران تبرع کرابو لگل ١٩٨ قطعە نشانەی آزایی و٢٠٠ قطعە مدالی زیو بەسەر افسرانا دابەش کرا وعشائرەکانیش لەم خلاتە بشداربون. وهەرنفریکی عشائری شەرکەر ٥٠ تومان بخششی درایی وبەترتیباتی خوارەوە لەدەرباری شاهانەوە دەستوراتی حرەکات بەهیزەکانی دەولەتی راگیندرا.

١-لەمنطقەی مرگرور ونرکی زرکا- سرهنگ سردارأور بەخویو عدەکەیەوە لەبەرزایەکانی قلعەبندی واستحکامات بکا بو ئەوەی دوژمن نەتوانی لەجناح غربی تجاوەز بکات ودەستەی سوارەش لەنرکی وسیلو-قرار بگری.

٢-لەناوچەی باراندوزچایی لازمە ستونی سرهنگ فولادوند-برزایەکانی گرگل-و دەشتەبیل وقلقە وبردە زەرد اشغال بکات. لگل ستونی مەرگەوەر ارتباط بکا.

٣-ستونیك لەژیر فرماندەی سرهنگ نیساری لەدرەی قاسملو وضع مدافعە وەربگری.

٤-ستونی سرهنگ مظفری لە شیطانآوا لەپاش اشغالی دەربند و نازناز- شکلی مدافعە وەربگری.

لەقسمی جنوب

١-جاری اوەل ستونی سرهنگ مجیدی کیوی پیار-اشغال بکا

٢-ستونی سرهنگ انصاری بەرزایەکانی چواربوت وسرهنگ غفاری صوفیان ونلوس اشغال بکا.

## أرایشی وحدەکانی ایران لە ٦ فروردین ٣٢٦

١-یك گروهان لەگوردانی اصفهان لەسیلوان.

٢-هنگ سوارەی فەوزیە لگل دو ارابەی جنگی لە زرکا لەژیر فرماندەی سرهنگ پرتەوی.

۳-دو گوردانی پیاده ویك أتشپارەی توپخانە ویــك گروهـانی خمپــارە ویـك ارابـەی جنگــی لـەنرکی لـەژیر فرمـاندەی سـرهنگ سردار أوەر. وئـەو ۳- هنگـە لەسـرهنگ نیساری مسۆل بون.

٤-یـك گـوردان پیــادە ویکدەســتە خمپــارە لەبەرزایـەکانی- صدیـق وزەلـر- لـەژیر فرماندەی پولا دەوەندا بون.

٥-یك گوردانی پیادە ویکدەستە خمپارە ویکدەسـتە توپخانـە ویـك ارابـەی جنگـی لەبغازەی قاسملو لەژیر فرماندەی سروان پاشائیدا جیگای وەرگرتبو

٦-هنگــی سنوارەی کوردوســتان ویـك أتـش پـارە ویکدەسـتە خمپـارە ویـك ارابــە لەشـیطـانأوا لـەژیر فرمـاندەی سـرهنگ مظفـری. بـەلام هەر ۳ســی ســتون لـەژیر نظارەتی تیمسار سرتیپ زنگنەدا ادارە اکران.

۷-یك گوردانی پیــادە ویکدەسـتە توپخانــە لەوزنـە وخانطــاوس لـەژیر فرمــاندەی سرگورد کبیری ادارە ئەکرا.

۸-یك گوردانی پیادە ویکدەستە توپخانە لەقلاچوخ وهەن هنە خرایە ژیـر معیتــی فرمانده سرگورد زرەپوش.

۹-دو گوردانی پیادە ویکدەستە خمپارە ویکدەستە توپخانە لەنغدە لەژیر فرماندەی سرهنگ مجیدیدا دامەزرا

۱۰-دو گوردان پیادە ومسلسل لەنغدە بفرماندەی سەرگورد محسنی ترتیب کرا

۱۱-یکدەستە أتشپارە ۱۰۵ بلند ویکدەستە اتشپارە کوتاە لگل دو ارابــە نیەرایـە نغدە.

۱۲-یك گروهانی پیادە لەگرنە- استحکاماتی کرد

۱۳-یك گروهانی پیادە ودو دەستە مسلسل لگل دو ارابەی جنگـی لەبەرزایـەکانی چواریت لەژیر فرماندەی سرگورد مساوات ترتیباتی وەرگرت.

۱٤-یك گوردانی پیادە ویك گروهانی اسوران ودو عرابە ویکدەستە توپخانە ۱۰۵ کورت لەصوفیان لەژیر فرماندەی سرهنگ انصاری استقراری گرت.

۱٥-دوصدە وپنجاە نفر لەتفنگچیان منگوری بسەرپەرسـتی سـتوان دو نوبـهاری لـەجلدیان دامـەزرا. بەشـەرتی نوسـتونی سـرەوە لـەژیر فرمـاندەی ســرتیپ بیگلــری یارمەتی سەرهنگ غفاریدا بن.

١٦-دو گوردانی پیاده ویك گروهان توپ ٣٧ لەرضائیە بفرماندەی سەرگورد دولو- لگل ٧ فروندی طیارەی هایند وتاگرموس خرایە اختیاری فرماندە ولەفرودگای رضائیە دابەزین. بەم پیە ترتیباتی حرەکات کرا بو سەر بارزانیەکان لەهەمو لایکەوە لشکری بارزانی تذیق کرا کیو بەکیو وگرد بە گرد بارزانیەکان برەو عراق مجبوری حرەکەت کران.

لەهەمولایکەوە بارزانیەکان تنگەتاو کران. وطیارە شەریکی بدبختانەی سەرومالی لگلا ئەکردن. بارزانیەکانیش بەدەم بەری کردنی کوچوبارەوە شەری ناموس و مالّ قوتارکردنیان ئەکرد. لەروژی ١٤ فروردین ٣٢٦ ئەو تانکانەی کەلە تەوریزەوە ئەهاتن بو رضائیە. دوچاری بارزانی ئەبن وتقە لەیەك تر ئەکەن. گروهبان ١-علی افتخاری ئەکوژری و٣سی نفریش بریندار ئەکرین.

لەمنطقەی مندیل پیچ وبەردە زەرد لەروژی ١٦ فروردین بردومان وحرەکاتی زور بەشدەت کرایە سەر بارزانیەکان ملا مصطفی وشیخ احمد ومیرحاج بەهوی هلّمەتی طیارە زور پەریشان بون. نوسراویك یان بەهوی شیخ عبدالله گیلانی مەرگەوەری بو فرماندەی مەرگەوەر نوسی. کەایمە آمادەین کەهەمو افسرە فراریەکان وتوپەکان تسلیم بەدەولەتی شاهنشاهی ایران بکەینەوە. بەشەرتی هیزی هوائیمان لەسەر هلبگرن وحرەکاتی عسکری رابگرن. ومیرحاجیش بەزمانی افسرە فراریەکانی عراقیەوە. طلبی تبعیەتی خوی وأوالەکانی فراری لەفرماندەی لشکری ایران کرد.

جواباً فرماندەی لشکر وەلامی دانەوە. لەبەرئەوەی کەبارزانیەکان هەتا ایستا لەهەمو بریاریکیانا درویان کردوە. هەتا افسرە فراریەکان وتوپەکان تسلیم نەکەنەوە حرەکاتی طیارە و قشون هەردەوام اکات. حرەکات لەقلای پادار- پیرناصر-ارنە- سیاوان-نازناز-تازاس-قاسملو-لەمینی هیزی بارزانی وحکومەت دەوامی کرد- لەپادارا- گروهبانی ٣ اسماعیل بیاتی لەگردانی ١-هنگی ١٢ کرمانشان ونفریکی سرباز و٦ نفر لەتفنگچیانی قرەپاخ کوژران ولەبارزانیەکانیش ١٢ نفر کوژراو و٨ نفر بریندار رویدا ئەو تذیقاتە بو بەهوی ئەوەی کەحمە صدیقی برای ملا مصطفی بەتعریفی خوارەوە محمد امین مەرگەوەری بنیری بو لای فرماندەی نیرو

١-افسرە فراریەکانی ایرانی تسلیم بکەنەوە

٢-أسوریەکان بدەنەوە دەست لشکر

٣-هەر چکیکی دەست بارزانی کەوتوە لەایرانا تسلیمی بکەنەوە

٤-توپەکانی ٧٥ ملیمتری اعادە بکرینەوە. بەشەرتی هەتا چل روژیتر مولەتی بارزانی بدری بو ئەوەی کەبتوانن لەدەشتەبیل عیلە پەرآگندەکەیان کوبکنەوە بو تدابیری چونەوە عراقیان.

٥-لەناوچەی (درەبنار) سەری روستم اوا- لەخاکی مەرگەوەرا مجال بدری کەپوسطیکی بارزانی بەسەربەستی دابمزری هەتامدەتی ٤٠ روژە تەواو ئەبی.

بەلام متأسفانە وایان وەلآم درایەوە هەر وختیك بارزانی توانیان بریارەکانی لەوپیش یان بەرنەسەر حکومەتی ایرانیش ئەو شەرتانەیان لی قبول ئەکات.

لەروژی ١٣ فروردین ٣٢٦ لەلاین گوردانی دو هنگی نادری وگوردانی سروان لشکری پەلاماری بارزانی درا. لەبەرزایەکانی بەردە زەرد لەرغمی ئەوەی کەطیارە وتوپخانەیکی زور لەایش کردن دا بو. لەگروهانی ١-شیدفر-٣نفر سەرباز کوژرا. و ٦ نفریش بریندار کرا. ولەلاین تفنگچیەکانی موسی‌خانی زەرزەوە. لشکری سرهنگ غفاری أوایی سنگان وکانی رەش وخالدأوا اشغال کرا. لەروژی ١٥ فروردین لەژیر فرماندەی احمد مەرگەوەری--١٥٠ نفر تفنگچی لەگردی- گردکەکشان- لگل ستونی سرگورد حمیدیدا بوو بەشەر. لپاش تیر اندازیکی زور ئەو گردە کەچوار کیلومتر لەشنو دوربو تسلیم بەحکومەت کرا.

بەتسلیم بونی گردکەکشان- لەروژی ١٥ فروردین چەك دارەکانی عشائری لگل هیزی سەرگورد زرەپوش داخلی شنو بون.

لەشنودا تەواویك لەگوللەی توپ ویەك توپی بی‌لولە کەوتە دەست هیزی دەولەتی. بەم شەرە بارزانیەکان ٥٠ دی‌یان لەدیهاتی ناوچەی شنو لەدەست چو. بو مسئلەی زخیرە ایشی بارزانی زور گەندبو. لەژیر فرماندەی سرهنگ غفاری روژی ١٣فروردین ئەلوس- بەشەری طیارە وتوپ وحملەی عسکری وهلمەتی عشائری لەبارزانیان وەرگیرایەوە. دونفری تفنگچی ناوخویی لەو هەرایەدا کوژران. ودو نفریشیان لی بریندار کرا وبارزانیەکانیش بەبی وەی-نلوسیان بەجی هیشت.

ستوانی سوار حمیدی جهانبانی-کەلەبەسەرهاتی (کلیچ) اسیرکرابو لگل پینج نفری افسری ایران تسلیم بەحکومەتی ایران کرانەوە وشیخ احمدی برای جنرال ملا مصطفی نوسراویکی لەفرماندەی لشکری مەرگەوەر نیساری نوسی کەوا اسیرەکانمان

بو ناردنەوە. وتوپەکانیش ئەنیرینەوە. بەڵام ایوە خلافی ضمیر ووجدان ژنو منالّی ساوای ایمە بریندار وبەردومان ئەکەن. خذمەتی‌کی گەورەی وجدانی اکەن کەامر بکەن بەراگرتنی بەردومان. ولامیان درایەوە هەتا مەلا مصطفی جنبەی دوژمنایەتی دەولەتی بگریتە بەرچاو. حکومەت هیچ رحمیك بەمایوە ناکات ئەگەر مەلا مصطفی بەتەواوی تعهداتەکانی بەریتەسەر مکنە دەولەتی شاهنشاهی عطفتان لگل بکات.

روژی ۱۸ فروردین ۳۲٦ طیارەیك بەر گوللەی بارزانی کەوت لەناوچەی مەرگەوەر ستوانی۱-غلامحسین نجمی تیا سوتا. وبارزانیەکانیش رویان کردەوە عراق. لە درەگیلاس-وکیوانی کورکل-ودرەی قادر- کوبونەوە.

بەرزایەکانی کلیچ بەهوی تفنگ چیانی رشید بگەوە گوردانی آزەرپاد وگوردانی اصفهان لەنرکی- راوەستا ویك گوردان لەهنگی ٤ کوردوستان بەاضافەی یەك گروهان پیادە لەگوردانی آزەرپاد لەسیلوان- دامەزرا وگوردانیك لەهنگی آسن لگل دەستەیکی خمپارە لەبەرزایەکانی مندیل پیچ وکوەآق- ویەردە زەرد-استحکاماتی وەرگرت.

وسەرگورد مساوات لەسنگان-و گوردانی سەرگوردیمین لەدولّی وگوردانی سەرگورد زرەپوش لەشنو وگوردانی سواری لورستان لە نەلوس قراریان گرت.

ستونی درەی قاسملو وستونی دیزج-وستونی پادار لە ۱۹فروردین لەأخبلاخ- بەیەك گیشتن بارزانیەکان ۱۸ نفر استوار وگروهبانانیان بەهوی سید عبداللە گیلانی تسلیم بەحکومەت کردەوە لگل توپیك بواسطەی سید کمال بو جهانبانی نیەرایەوە.

ئەو افسرە فراریانەی ایرانی کەلەناو اوردوی بارزانیدا حاشاردرابون ئەو پیاوانەبون.
۱-تفرشیان -۲رئیس دانا احسانی ۳-زربخش -٤-توکلی-٥-أرتش یار

جا لشکری بارزان بەهوی تأثیرات وهیزی دەولەتی ایران لەنهایەتی فروردین ۳۲٦ کەمصادفی ۲۱ نیسانی۹٤۷ ئەکات گیشتنەوە حدودی عراق. مەلا مصطفی لگل ٤۰۰ نفریکی سلطەزەلام. و٦ ظابطی فراری عراق لەحدود مایەوە باقی عیلی بارزان تسلیم بەعراق بونەوە.

## دوژمنایەتی منگور ومامەش لگل بارزانیدا

اصلا بەمناسبەتی ئەوەی کەهەمو خواردەمنیك وجیگا ومأوایکی بارزانیەکان لەلاین اهالی ئەو ناوچانە تأمین اکرا کەلسەرەوە باسمان کردن. بەیەك کەرت ملەتی ئەو ناوە بەدەست بەخیوکردنی ئەو عیلە زورەی بارزانی نارەحەت بوبون. هەرچی کەهەیان بو دەرخواردی بارزانیان دابو. سەرەرای ئەوەش کەبەهوی بارزانیەکانەوە شەو وروژ طوپو طیارەی حکومەتی ایران ئەو ناوچانەی بەردومان اکرد کەبارزانی تیا اژیان.

جاعشائرەکان پڕ بەدل ئەیانەویست کەحکومەت بهاواریان بگات ولەچنگ بارزانی رزگاریان بکات.

جابەم هویەوە چارەی بارزانی لەبەرچاوی عشائرەکان ناشیرین بوبو. بارزانیەکانیش هیچ چارەیان نەمابو مجبوربون کەخویان بەخلك بەخیوبکەن چونکە لەهیچ لایکەوە یارمەتی زەخیرە وخواردەمنیان پی نەاکرا.

اصلاً عشائری منگور بەناهق بەگژ بارزانیەکانا چون لەپیش حادثەی سنگان هیچ ضرەریکی أوایان لەبارزانیەکان نەدیبو کەمستحقی ئەو لشکرکەشی وبەگژاچونەیان بی. هەرمعاملەیەکی کەدرحق بەخیلی منگوریان کردبی لەسەرحق وحقایق بووە. چونکە منگورەکان متعدی وبارزانیەکان محاید ومدافع بون.

بەلام لەقضیەی عشائری مامشەوە بەراستی بارزانیەکان تعدا وغدریکی گەورەیان لەعشائری مامەش کرد. ومامەشەکان حقیان بو کەزور لەوەزیاتر تعقیبی بارزانی بکەن وتولەی خویانیان لی‌بکەنەوە.

بارزانیەکان بەناحق-ابراهیم أغای کوری قرەنی أغای مامشیان لگل دو کوری کاوسین أغای برای قرەنی‌أغای مامەش یان لگل کاوسین أغای برای قەرەنی أغا لگل أغایکی‌تری مامەش بەبی‌تاوان کوشتبو. تقریباً بارزانیەکانیان برامبر بەم عشیرەتە خیانەتی نمك یان کرد. چونکە هرچیکی ئەو عشیرەتە هەیبو دەرخواردی بارزانیان دابو ئەمەشیان پاداشت بو کەگیرامانەوە تفصیلاتی قضیەش وەکو خوارەوە حکومەتی ایران اعلانی کردبو کە عشائرەکان ئەبی مدەی ۷ روژ چکەکانیان تسلیم بەحکومەتی ایران بکەنەوە.

ملا مصطفی پیش دەستی کردبو. (......) کەیکیك بو لەافسرە فراریەکانی عراقی لگل تاقمیکا ئەیان نیری بو دی سیلو- کەاسلحەی عشائری مامش کوبکاتەوە.

لەوەختیکا ئەگاتە دیوانخانەی کاووسین-خلکەکە خەریکی نان خواردن ئەبن. هەربەپیی‌وە داوای کوکردنەوەی چکەکانیان لی‌ئەکات. ئەوانیش ئەلین فەرمو دابنیشن نان بخون ئەو وختە چیتان بوی پیکی دینین. راناوەستی لگل پیاوەکانیان بەمسلسل وەرئەگریتە ئەو جماعتەی کەخەریکی نان خواردن ئەبن قوربانیکی أوا فاحش لەو دیوانخانەیە ئەنی‌تەوە، کەنهائیاً روی خوی ومیژوی کورد ناشیرین بکات.

## تلفیاتی ایران ولشکری ملا مصطفی هەتا حدود

بەپی تقریری مجلەی أرتشی ایران ژمارە ۳ سالی ٦ چابی تاران بەپی مفرداتی خوارەوە ایرانیەکان لەشنو ومنطقەی مەرگەور ودەشتەبیل ئەو کوشتارەیان داوە. بەلام وادرئەکەوی زورتریان تلفیات بوبی

١-سرگورد حسین کلاشی
٢-سەروان رضا قرەباغی
٣- غلام حسین پور جوهر
٤-استوار سید محمدی امامی
٥-ستوان ۳ مصطفی هاتفی
٦-ستوان ۳ غلامحسین نجیبی
٧-سروان رضا سلماس اسعدی
٨-ستوان محمد علی دبیری.
٩-ستوان سید جلال رحیمی حاجی‌أبادی
١٠-ستوان ١- غلام حسین نجمیی.

علاوەی ئەو ١٠ افسرانە بەپی اعترافی مجلەی ناوبراو ١٥٧ نفر سەربازیش لەوشەری کوچی بارزانیەدا کوژراوە. ولەعشاترەکانیش ٤٠ نفر کوشتار بووەو پینج طیارە لگل توپیك شکاندراوە. مقداریکی زوریش تفنگو فیشك یان چنگ کەوتبو. بەلام لەبارزانیەکان هەر ٣٥ نفر کوژراویان بوبو. وجلالی امین بگیش لەنزیکی گادەر تسلیمی نفس بە استوانی سرهنگ غفاری ئەکا لگل عبدالقادر ناویکی معلما-و اسیری بارزانیش تنها ئەو دو نفرە بوبون. باوەر ناکری کەایرانیەکان برامبر بەو تلفیاتەیان راست بدوین. چونکە شەرەکانیان زور بەمودا ودوورودریژ بووە معقول نیە

لەمسافەی ٥٠ روژا لگل ئەو هەموو مصادماتانەی کەبەطیارە وتوپ ورشاش وتفنگی سەرباز وعشائرەکان لگل بارزانیەکانا کرابی هەر ١٩٧ نفر کوژراوی حکومەتی وعشائرەکان بوبی

## غلطی ملا مصطفی لەایرانا

لەپاش ئەوەی کەحکومەتی قاضی محمد سقوطی کرد حق نەبو ملا مصطفی بەو دەرەجەیە لەحدودەکانی عراق دوریکەویتەوە. و لەناوچەی ئەو هەمو عشائرانەدا خوی اسیر بکات. حق وابو بەدریژایی عشائری منگور وپیران خوی بەحدودی عراقەوە ملاس بکات. ولکی جنگ بهاویتە ناو عشائری سویسنی- کلوی- گەورك-و ناوچەی سابلاغ-و تاقمیکیتر لەشکلی چتە بو اشغالاتی ریگا ومراکزەکانی ایران بنیریتە ناوچەکانی سقز وبوکان وساینقلا وتیکان تپە-و میاندوواو. لەهەموو لایکەوە استحکامات وخگی سوق الجیشی دوژمن تهدید بکات. لەووختەدا ئەو خطەیەی زور بەأسانی بو بەانجام ئەگەیشت چونکە بەاعدام کرانی ١٩ أغای کورد. دانیشتوانی کوردی ایران گوناهبار وبی گوناە چون یك دغدغەیان نیشتبو سەر. ولەخویان متردد بوبون ومطلقاً امنیت یان بەحکومەتی ایران نەمابو.

ئەو عشائرانە پشیمان بوبونەوە زور مائلی حرەکات وأژاوەبون. اگر لەو وختەدا پنجەیکی بەقوەت ببوایە بو اعادەی حرەکات لەایرانا کەم کەس ئەمایەوە کەلەوهەلەدا اشتراك بەحرەکاتی ملا مصطفی نکات باخصوص کەحزبی جەوان لەو وختەدا زور أمادەبو بو حرەکات. منتسبینی ئەو حزبە زور لەخویان اترسان اگر حرەکاتیك لەو ناوچەیەدا دەست پیکرابایە بالعموم نفراتی ئەو حزبە اشتراك یان بعملیاتی جنگ وشقاوەت ئەکرد. ولەو وختەشا دعایکی هاتنەوەی روس هەبو بو ایران. عشائرەکان اکپریان هەرمحتاجی توزی تنویر وتشجیع بون بو اشتراکیان بەوحرەکاتە. وهیچ نبوایە ملا مصطفی بەهوی ئەو حرەکاتەوە استفادەی لەو پلانەی خوارەوە ئەکرد

١-ریك کەوتن لگل ایرانا بەشروط.

٢-تفاهم لگل عراقا بە انتسابی شروط.

٣-تفاهم واتصال لگل روسیا بەپی مقتضی.

بەلام داخی‌گرانم ملا مصطفی ئەو لکانەی نەهاتبو بەرچاو. حسب بەنەشارەزایەتی جیگا ومناخی ایران. خوی لەوەلاتیکی دووردودریژ وأوالەی ایران محصور کردبو. ریگای هاتوچوی لەهەمولایکەوە لەخوی بستبو. تقریباً تهیّای شەری خندەقی کردبو برامبر بەدوژمن خوی أمادە کردبو بو شەری خندەق برامبر بەحکومتیکی تیروپر ومجهّز لگل ئەوەشا اگر ملا مصطفی کوچوبار وعائلە وبرسیایەتی سەری لی‌نەشیواندایە. وا امید اکرا لەبهارا ولەرەشوخوشیدا مقازەفەیکی سیر بەایرانیەکان نشان بدات. بەلام قضیەی کوچوبار وبی‌نانی شەقی لەهەمو امال وپیشکەوتنیکی ملا مصطفی هەلدابو.

بەتأریخی ۱۵/۱/۳۲٦ لەدی قبار بگیانی منگورەوە نوسراویکی پر لەترتیباتی جنگ وکردنەوەی جبهەیکی دوهم بو ناو عشائری منگور وسویسنایەتیم -نوسی بو ملا مصطفی- لەسەر استشارەی هیندی لەأغواتی منطقەی گەورك ومنگور وسویسنایەتی. واکثری ئەو نقاطانەشم تیا ذکر کردبو کەلەپیشەوە بعرضم‌گیاندن. ولەو وختە ترسو محاصرەیەدا ئەو نوسراوەم بەسلیمی أموزام وە وەلی خالما- نارد بو منطقەی دەشتەبیل وتەرگەوەر- بەجفا وفلاکەتیکی زور گیشتبونە لای ملا مصطفی. ولەوختیکی زور ناهەموارا نوسراوەکەی ئەدەنی.

لەپاش استشارە ومشاوەرەیکی لەبینی فرماندە وبرایەکانیا بەموضوعی خوارەوە وەلامی بو نارد بومەوە بەراسپاردنی پیاوەکان.

(بەأغای م م. منگوری) بلین

نوسراوەکەی لەوەختیکا وەرگیرا کەپینج نفر لەبرایە شەهیدەکانی بارزانیم لەاشکەوتیکا بەدیارمەوە راکشابو. بو کردنەوەی جبهەیك لەو ناوەدا امکان نابی. چونکە ایمە بەهیوای ایران نەماوین کەلکی تیا بکەی‌نەوە ایمە شەری ناموس ودەربازبون اکەین. نەوەکو شەری تقدم ومانەوە لەایرانا. بائەویش لگل رفیقەکانی کنارەگیری بکات خوا کەس وکو ایمە دوچاری فلاکەت نەکا. البتە هلگری نوسراوەکەش باسی سەرگەردانی عیلی بارزانیت بو ئەکا کە لە چە مرحلەیکی خطردان. سلاوی هەمولایك مان بەأغایان رابگەینە. هەمولایکتان بەخوا اسپیرین. داوای چاکمان لەیزدان بو بکەن.

مصطفى بارزانى

**له اشكهوتى ترگهورا**

**جا نوسراوبەرەكان بە ١٢روژ وشەو گیشتنەوە لای من. تعریفی مشاهداتەكەیان لەناو ئەو عیلە هەژارە ئەوەبو. كە ملا مصطفى همیشە لەخوا ئەپارایەوە بو٩فردە أرد كەبیكا بەنان وبەسەر لشكر وعیلەكەیا دابەشی بكات. جەمیك بەتیری بیخون ئەمجا بمرن. لەوەسیرتر ئەوەبو كەنامە بەرەكان گیرایانەوە. لگل ملا مصطفى لەاشكەوتابورین كەپینج نفری شەهیدكراویان لەبارزانیەكان هینایەوە بو اشكەوت. تحریانكردن تنها یكیكیان تقریبی ٢٠ غرام ووردە نانی پی‌بو لەناو كلكی فقیانەكەیا بو تنگانە قایمی كردبو. امجا نامە هلگرەكان كەئەمەیان چاوپی‌ئەكەوی بەپلە داوای ورامی نوسراوەكە ئەكەن وئەگەرینەوە.**

**جابەو پی‌یە ئەو لشكر وعیلاتی بارزانە واردی عراق بونەوە. شیخ احمد وشیخ صدیق وشیخ بابو وشیخ سلیمان وحما أغای میرگسور وكاك مامند ومحمدی امیرخان ناوان كەزور مطلوبی حكومەتی عراق بون لگل عزت عزیز وخیرالله ومحمد محمود ومحمد عبدالله ونوری** احمد طه **تسلیمی نفس ئەكەن بەحكومەتی عراق. ومصطفى خوشناویش لەمخفری حاجی أومران لەلاین پولیسی عراقەوە لگل دونفری جندی فراری اگیریت.**

**قسمی سەركومارەكانی بارزانی لگل هیندی پیاوی ناسراویانا فری‌درانە بندی‌خانەكانی موصل. هولیر. ومعقل بصرا. وقراری حكمی اعدامیان كەدرحق صادر بوبو تأجیل كرا بو وختیكی غیر معین. وزور كەرت بو برەلاكردنی اسیرانی بارزانی لەمجلسی پرلمانا كاك زیاد أغای كویی- داوای لەحكومت كردوە. وقسمی منتسبین تحرر وپارتیش بەچند تكرار وندا ونوسین داوای بربونی برا بارزانیەكانیان كردوە بەلام لەرغمی ئەو هەمو** طلب **داواكاریە حكومتی عراق هەتا ایستا ئەو بیچارە بندیانەی بەرەلا نكردوە. بەلام بو عوائلی بارزانی لەمنطقەی بارزانا هندی ترتیباتی خوراك‌و پوشاك‌و تەرزی زراعەت وتعاونی حاصلخیزی كردون. ئەوانەی كەتبعید ونخراونەتە معقل تا اندازەیك بەوسائلی ژیان كومگیان پی‌كراوە. وهیندی نفراتی** سلطه **وبی ژنومالیشیان لەبارزان دورخستوتەوە وبەسەر لوایەكانا دابەشیان كردوون. بەلام لە**

١٩٥٠دا متصرفی سلیمانی لەگەڵ أغاو میرزا توفیق‌و شیخ قادرو بابەعلی حفیدی داوا کرد کە ١٥٠ نفریکی بارزانی لەو بارزانیە بی ژنو مالانە بی‌نی‌تە لوای سلیمانی بو اشتغالیا بەاموری کسابەت‌و کشتوکال لەسەر حسابی خویان بەشەرتی ئەو أغایانە مسئول بن لەسەرپەرشتی‌و فرارنکردنیان. بەلام أغایانی ناوبراو دەستەبەری سەرپەرشتی‌و محافظەیان نەبون‌و حکومەتیش بلاقیدو شەرت ئەو بارزانیانەی نەهینایە سلیمانی. وبو ظابطو جندیە فراریەکانی عراقی دیوانی عسکری تشکیل کرا. أغایانی مصطفی خوشناوو عزت عزیزو حفظ‌اللّهو محمد محمودیان لەو محکمەی عسکریەدا لەتناف دا لەسەر اسراری صالح جبری رئیس الوزرا. نوری أحمد طە محکوم کرا بە ١٥ سال زندانی. وجلالی امین بگیش لە حکومەتی تارانەوە لە ١٩٥٠دا لگەل چند اسیریکی‌تری عراقیدا. لگەل چند اسیریکی ایرانی کە لەعراق گیرابون. بەتأمیناتی حیات لگەل عراقا ألوگوریان پی‌کرا. وبەقانونی استردادی مجرمین جلالی امین بگ وعبدالقادری معلم هاتنەوە عراق. جلالی امین بگ لپاش چند مضابط وتشبساتیک بەوصی عراق وبەرئیس الوزا ومقاماتی بەرزی عراق. حکمی جلال بگ هینرایە سەر (٥) سال.و محمد عبدااللەش کەعریفی فراری بو محکوم کرا بە ٢٠ سال وعارف اسماعیل ناویش بە(٣) سال.

بکر کریمی حویضی- بواسطەی خزمایەتی کەلگل کاك زیاد أغای کویی‌دا هەی‌بو هەرلەوادی فرارا مایەوە. لەمنطقەی کویی لەدی (شیواشان) محافظە وشیرەرایەوە. وهەمزە عبداللەش لە ٩٥٠ دا لەسابونکرانی سلیمانی لەلاین کریمی صوفی صالح-ناوی پولیسی سریەوە گیرا. لەپاش افراجبونی لە اتهامەکانی سیاسی. اسقاطی جنسیتی لی‌کرا ودەرکرا بو خارجی عراق‌و لەتورکیا گەراوە دەستی دایەوە تشکیل حزبی بەرەی پیشکەوتنی پارتی کوردی عراق ومیرحاج وأورحمان طیب لگەل مەلا مصطفی‌دا چون بو روسیا‌و باقی عسکرە فراریەکانی تریش هەریکەیان بەحکمی مختلف محکوم کران.

## حرەکەتی ملا مصطفی بو روسیا

لەدوای تسلیم بونی عیلی بارزانی بەعراق وروت کردنەوەیان لەهەمو اسلحەیك. مەلا مصطفی لگەل حکومەتی عراق کەوتە مخابراتەوە کەمباشرتاً عفو بکری

ولەناوچەی بارزانا دابنیشی. بەلام حکومەتی عراق بلاقید وشەرت بو تسلیم بونی ملا مصطفی موافق بو. انجا لەپاش یأس بونی لەعطفی حکومەتی عراق. و رزگاربون وبیخەم بونی لەکوچوبار ومالومنال بە٥٠٠ نفریکی سلطەی بارزانی وغوارەی عراقی وایرانی لە ٦ مانگی خرداد ٣٢٦ بنا لەسەر جرەیانیکی اعتمادی کەلەبینی ملا مصطفی وروسیا وقوعی کردبو. ملا مصطفی بەو لشکرەوە بەرەو روسیا کەوتە حرەکەت. بەتأریخ ٢١ خردادی ٣٢٦ مسافەی ٣٢٥ کیلومتری بەشەرەوە بڕی بەبی هیچ گونە تلفیاتیك لەقەراغونە-وە لەچەمی أراس پەرینەوە و داخلی ارأضی روسیا بون وروسەکان بەاکمالی احتراماتەوە لەمەرزی أراسەوە ملا مصطفی ونفراتەکانیان ورگرتن وداخلی (سدّی پولاییینی) روسیایان کردن.

ملا مصطفی زور بەقارەمانانە وپالەوانانە خوی گیاندە روسیا بەراستی هەر بڕینی ئەو مسافە دورودریژەیەی اپباتی ئەکا کە بەاوەل نشتمانپەرست وفداکاری کورد ئەناسرا لەوکاتەدا بو ئەوەی کە بەکیوەکانی أراراتا زوتر خوی بگەینیتە روسیا. بەو ٥٠٠ نفرە مسلحەیەوە مەرزی تورکی دڕی خوی گیاندە ناو کوردەکانی تورکیاوە. بەلام تورکە خوین خورەکان لەسەر تشبساتی ایرانیەکان مەرزی تورکیان پرکرد بو لەلشکر. بەهلمەتیکی زور سخت تورکەکان ملا مصطفی‌یان دەپەراندەوە بو ناو خاکی ایران.

حکومەتی ایران بەترتیباتی خوارەوە ڕێ بازەکانی ملا مصطفی‌یان تەنی‌بو وبەو هەمو لشکر وتجهیزات وتوپ وطیارەوە تعقیبیان اکرد.

١-لەماکو- دو گوردانی پیادە ویك دەستە لەتوپ تقینەرەکان لگەل دو توپی ٧٥ ملیمتری ویك گوردانی سوارە ودو عرابەی جنگی ویك دەستەی تلسز.

٢-لەسیەچشمە-کانیەرەش-گوردانیك پیادە ویك دەستە توپخانەی ٧٥ ملیمتری ودو عرابەی جنگی لگل یك تلسزا.

٣-لەقرەضیاءالدین- گوردانیك پیادە.

٤-لە خوی- گوردانیك پیادە.

٥-لە قطور گوردانیك پیادە.

٦-لەبینی خوی وقطوردا یك گوردان پیادە ویك دەستە خمپارەانداز یکدەستە توپخانەی ٧٥ ملیمتری ویك فوج سوارە.

٧-لەشاهپور- یك گوردان پیادە ویك گوردان سوارە.

٨-له تەرگەوەر- دو گوردان پیادە یك دەستە.توپ ودو تانك ویـك گـوردان سـوارە ودستگاهیکی تلسز.

٩- نغدە یك گوردان سوارە ویك دستگاهی تلسز.

١٠-رضائیـه یـك گـوردان پیـادە یـك دەسـتە توپخانـەی ١٠٥ ملیمـتری بلنـدی ماتوری لگل ٦ طیارەدا.

١١- لەتەوریزەوە یك گوردان پیادە ودو تلسز بو تقویەی ئەو قطعاتی جنگاوەرانە هاتبو دەرەوە.

جالشـکری حکومـەتی ایـران کەلـەو وختـەدا تعقیبـی مـلا مصطفـی ولشـکری بارزانی ئـەکرد لەسفری چونـە روسـیایانا. بەوپیەـە ریگـا وبازگـەکانیان قـایم کردبـو وموجودی ئەو لشکرەش نزیکی اکردەوە بە ٨ هـەزار نـەفر وپیـنج دەسـتەی تـوپ و١٢ دبابـەی جنگـی و(٥) دەسـتەی خمپـارەانداز و٦ طیـارە لگـل ئـەو هـەمو تعقیبـات واهمیتی وسائطـی جنگی ایرانیەکان. پالەوانانی بارزانی خطـی کارزاریسان هـەر دڕی وخویان گیاندە روسیا؟ لەسەر ئەو موضوعە سەرلشکر و فرماندەکانی ئەو حرەکاتەی ایرانیەکان هەمویان لەجیش اخراج وبعضاً محکوم کران. چونکە وا قنـاعت پیـدا کـرا کە بە رەشوتی روسـەکان بارزانیـەکان دەربـاز بوبـن. جابەراسـتی انسـان لـە سـڕە ناگـا کەبوچی هـەر لـە ئەوەلـەوە روسـەکان مـلا مصطفیـیان بـەمالو منالـەوە نـەبرد بـو روسیا. خو لەو وختەدا زور بەأسانی روسەکان ئەیانی توانـی ئـەو عیلاتـی بارزانیـە بـو روسیا بخنە حرەکەت وچون بـو کـە لەکـەرەتی دوهـەما مـلا مصطفیـیان لـەحدودی عـراقەوە خستەوە سەر رەتی چونە روسیا.

وادەرئەکەوی کەسیاسـەتی ئەو وختەی روسەکان موافق نـەبوبی کەبارزانیـەکان برنـە روسیا ومناسبەتی اخیریان لگـل ایرانیـەکان تیـك چوبـی وقضیـەی رفضـی لایحـەی نەوتەکەیان لیرەوشەن بوبی. اجا بو تهدید وتخویفی ایرانیەکان بو ملا مصطفی ناچار بوبنەوە.

جابەهەر نوعی کە ئەو نقاطانـە تفسیر بکـەین. نـاتوانین بلـین کـە روسـیش وەکـو دەولەتی انگلیس وامریکا مستعمر نیە وروحی استعمار وسیاسەت بلاوناکاتەوە گالتە پیکردنی ئەو تشـکیلاتی کوردوسـتانەی بەتـەواوی اسـپاتی استعماری وسیاسـەتەکەی کرد. ولگـل ئـەو حالەشـدا مـلا مصطفـی دوچـاری جیگـایك بـووە کەبـەهیچ تـەرزی

حقائقى وضعى امروى لەلايە معلوم نەبى. وهەراشاعە وباسيكى كە بەدەم خلكەوە هەتا ئەو تأريخە درحق بەملا مصطفى ئەگوترى بەاعتقادى من شتيكە خيالى وهەلبست. مصيرى ملا مصطفى مربوطى حرەكاتيكى عالمىيە. مقدّەراتى ملا مصطفى بەدەوريكى زور سياسىيەوە بستراوە. بەاعتقادى من ئەبى روس شەربكات وشەرقى بكەويتە دەست انجا ملا مصطفى پىبنىتەوە ناو كوردوستان بەمركز وموقفيكى غيرە معلوم. جا روس شەر اكات يا ناى كات. سەرئەكەوى يا ناكەوى ئەمانە هەموى لەپەردەى غيبا ماونەتەوە وتكهنات برامبر بەنتيجەى ئەو بەسەرهاتانە شتيكە بى پيزو غيرە معتبر. لەگەل ئەو هەمو حالانەشدا. ملا مصطفى تنها مقدّەساتيكى شخصى تأريخى چنگ كەوتووە. باوەرناكرى هەتا نهايەت تصادفى دەوريكى كە بكاتەوە كەبەشخصيتى زعامتيەوە لەناو كوردوستانا بەرچاو بكەويتەوە. موقفى ملا مصطفى بستراوە يا بەنجاح وسەركەوتنى روس. ويابەهوى تطوّريكى سياسى بتوانى كە لەروسيا دوربكەويتەوە ولەلاين حكومتى عراقيشەوە ببخشرى. وياخاريقەى طبيعەت كوردوستانيكى أزاد دروست بكات وبەشكلى عامليكى موءيد ملا مصطفى وربگريتەوە ولەناو ئەم سدّى پولايە-دەربازى بكات. چە بەانقلابيكى عراقى وەچە بەروداويكى سياسى روس.

### فصلى (٨)

## شهيدكرانى قاضى محمد وأوالّەكانى

قاضى محمد كورى قاضى على- بو لەفاميليكى ناودارى سابلاغ. قضاواتى سابلاغيان لەقديمەوە بە ارث بو بەجى مابو. ئەو فاميلە لەريگاى خوشى وأسايشى ملتى سابلاغا زور جفايان ديبو. هەتا لەدەورى اسماعيل أغاى سمكودا- لەسەر ميداننەدانى تالان كردنى سابلاغ (قاضى على) لەلاين اسماعيل خانەوە زور دوچارى كيشمە كيش بو بو. فاميلى قاضى محمد لەنفسى سابلاغيدا ٢٠ نفريك ئەبن. بەلام بەرجستەترينى ئەو عائلەيە قاضى محمد بوو وصدرى قاضى براى وحمە حسين خان وحمەرحيمخانى برازاى ئەوانيش لەدرەجەى دوهەما هلكەوتو وأرشدى ئەو عائلەيە بون. قاضى محمد زور حەزى بەژيانى تمدن ونهضەتى عصرى ئەكرد. لەپيش

هاتنی روسەکانیش بو ایران. قاضی محمد لەنفسی سابلاغ واطرافیا تشکیلاتی احزاب وجمعیەتی بوبو. بەلام زیاتر لەتیك چونی استبدادی ایران توانی کەخوی أشکرا بکات.

قاضی محمد شخصیك بو سادە وبی آرایش. حەزی بەهیندی عظمتو خونشاندان نەئەکرد. هەروەکو دەوری قاضیەتەکەی پالتاویکی هاودامانی لەگەل دەرپی‌یکی سپی وکراسیکی بی فقیانە وسوخمەیکی دوگمەداری ملایانە ومیزەریکی سادە وکەوایکی خاکی شاقەل شوری لەبەر ئەکرد. وهیندی جار پاپاغیکی کولکنی- لەسەرئەنا. پیاویکی بالابەرزی دەموچاو أمالّ سپی کەلانە. روخوش ودەم بەپی‌کەنین بو. بە وضعیتی پیشەوایی هیچ خوی لی‌نەگوڕا بو.

صدری قاضی برای قاضی محمد بو. زور خویندەوار ودوراندیش بو. حەزی بە أژاوە وئەو حرەکاتە نەاکرد. ئەو لەقاضی محمد باشتر تقدیری موقفی سیاسیانەی ئەکرد. لەدەورەی ١٤هەمی مجلسی پرلەمانی ایرانا هەتا نهایەتی ژیان نائبی سابلاغ بو زیاتر لەوحرەکاتەدا هەر لەتاران دائەنیشت. هەتا ٢٠ روژ پیش انقلاب هەرلگل حکومەتی مرکزی خەریکی اتصال وریکەوتنی بینی حکومەت وقاضی محمد بو. وبیریکی دوراندیشی بی‌تینی گرتبو بەرنظر. لای وابو لەروژیکا روسەکان ئەو تشکیلاتە تیك ئەدەنەوە وئەویش اتوانی قاضی محمد ومسببینی ئەو حرەکاتە لەورتەی فلاکەت بپاریزی. جابو ئەو جهتە همیشە اختلاطی شا وهیئتی کاربەدەستانی ایرانی اکرد ولگل حکومەتی مرکزیدا اتفاقیکی نهینی بو ئەو موضوعە هینابو وجودەوە. بەلام قاضی محمد لەفرحەتا فرصەت وقیمەتی ئەو قراردادەیەی نهیشتبو. وختیك قاضی محمد بو تنفیذی ئەو قراردادەیەی بینی شا وصدری قاضی پشیمان بوبووە کەکار لەکارترازا بو. شەقی سیاسەت وروژ هەمو أمالیکی قاضی محمدی تارومار کردبو.

هەرچندە لەپیش ورودی قشونی ایران بەسابلاغ صدری قاضی لەتەوریزەوە بەسواری طیارەی ایرانیەکان چو بو تاران بو تطبیقی بنودی ئەو قراردادەیەی کەلگل شا وقوام السلطنەدا بستبوی بو محافظەی هەمو حقوقیکی قاضی محمد واتباعی. بەلام ئەو چونە تارانەی بوبو بەسببی تیاچون وشهیدکرانی خوی وقاضی محمدی برای وحمە حسین‌خانی برازای.

اگر صدری قاضی بەهیوای ئەو قراراداەیە دەستی قاضی محمدی نەبستبایە ممکن بو قاضی محمد ریگایکی تری هەلببژارتایە. وأوا بلاقید وشەرت تسلیم نەبوایە. بەلام تفنّنی صدری قاضی بویەسببی ئەوەی کە قاضی محمد بلاقید وشەرت خوی بخاتەوە باوەشی ایرانیەکانەوە.

حمە حسین‌خان-پیاویکی سور وسپی چوارشانە وهیکل بو. پیاویکی أزا وبرّیار دروست بو. هەتانهایەت حەزی بەریك کەوتنی ایرانیەکان نەاکرد همیشە ووتەی ایرانیەکانی بەدرو وتفرە ئەزانی. حمە حسین‌خان برازای قاضی محمد بو برازایکی زور گوی‌دیر وبەمشور بو. لەفرمانی حکومەتی قاضی محمد ئەوّەل عامل واندامیکی حسّاس وفعّال بو. لگەل روسەکان زوراتصال وارتباطی باشی هەبو. روسەکان بو هیندی اموری جنگی ئەویان بەپیشکەوتو دانا بو. فعلاً لەملك واساساتیشا لە قاضی محمد دەولەمندتربو.

حمە رحیم‌خان- برای حمە حسین خان بو. ئەو علاقەیکی چندانی لەو وختەدا بەسەر سیاسەتەوە نەبو. جنبەی زراعەت وسەرپەرشتی دیهاتەکانی گرتبو. بەلام لەپیش تیکچونی سابلاغ بەناوی تحصیلی أدابی روسی. لەسەر حسابی حکومەتی روس چو بو روسیا. ولە اعادەی تشکیلاتی ایران نەگەرایەوە بو سابلاغ ولەسەر اذاعەی سرّی قوقازی روسیا بەزمانی کوردی هەتا امرو مشغولی بەانجام گیاندنی فرمانی دعایە واخبارات بلاوکردنەوەیە. وئەو شخصەی کەهەمو روژیك لەمحطەی سرّی أزربایجانی قەوقاز بەزمانی کوردی جنیومان بو بەحەمەرضای گور بەگور باب ادا وهەمو روژی جاریك گوی‌مان لی‌ئەبی. ئەوا ئەو حمە رحیم خانە برا کوژراو ومامە کوژراوەیە. کەگرّی درون وحسّی انتقام هەر اوندەی دەسلات داوەتی کەبەجنیودان وقصەی ناهموار تسکینی دلە زامدارەکەی خوی بکات.

قاضی محمد لە ١٣٢٠دا سەرکردەی ئەو هیئتە بو کەبەنمایندەی کورد چون بو باتکویا- هەر لەو سفرەدا امتحانی لیاقەتی خوی بەو روسەکاندا. خلافی انتظاری أوالّەکانی هەر لەو سفرەدا چند چاوپیکەوتنیکی نهینی پیاوە سیاسی وبەرجستەکانی روسیای کرد. وهەرلەو سفرەدا تعهداتیکی شخصی دابە روسەکان. هەروا بەرە بەرە بەتفاهم لەروسەکان نزیك بووە. وعبدالله اوف-ناو کەمەئلیکی سیاسی روس بو. بو امتحانی قاضی محمد ومراقبە ودەبرخی احوالی نیرەرایە سابلاغ. نقەتی قاضی محمد

لە نظر روسەکانا گیشتە مرحلەیك مالەکەی وەکو- باشگای افسرانی- روسی لیهاتبو. هەرچند ناتوانین صورەتی ئەو وثائقانە وەربگرین کەلەبینی قاضی محمد وروسەکانا رەدو بەدەل کراوە. بەلام اتوانم بلیم هەتا نهایەت قاضی محمد هنگاو بەهنگاو بەاشارەتی شفەوی روسەکان جولاوەتەوە.

چونکە قاضی محمد بەپشتیوانی روسەکان پەلاماری ئەو حرەکات وتشکیلاتەی دابو نەوەکو بەپشتیوانی عشائر وکوردەکان. جالەبەرئەوە هەتا نهایەت لەپروگرام ومصلحەتی روسەکان دەرنچووە. چونکە روسەکان زور بەووردی لەترسی سیاسەتی انگلیس ئەجولانەوە. هەتا مستر ایدن وزیری خارجەی انگلیس لەمجلسی پەرلەمانا بەتأریخ ١٠/١٠/٩٥٢ بیانی کردووە کەحکومەتی انگلیس وامریکا نیان هیشتوە روس وأزربایجان مربوطی خوی بکات. کەچی امرو ایران خیانەتیان لگلا ئەکات ئەو موضوعە لەروژنامەی اهالی ١٦/١٠/٩٥٢ چاپ کراوە. والاّ زور شتی واهەبووە کە قاضی محمد دەرکی کردوە. کەبو ئەو ناوچەیە بعمل نایی وکرانی باش نیە. ومجبوراً کردوشیەتی.

قاضی محمد اگر دارای رئی وافکاراتی مطلقی خوی ببوایە. باوەر نەاکرا هەروا بەأسانی وسادەی تسلیم ببیتەوە. ئەو هەمو اسلحە وچکانە بداتەوە بەایران. و ئەو عشائرانە لەخوی برنجینی. وروسەکانیش هەر ئەوندە مقتضای سیاسەتیان هینابوی کەبەوپییە تشکیلات بو قاضی محمد بکەن وبەو پییەش بەکوشتی بدەن.

ئەمە قاعدەیکی سیاسی عالەمی استعمارچی وسیاسەت بازانەیە. روژیك بەملاین مصروفات شتیك دروست ئەکەن. لەروژیکیشا بەیەك دەنکە شخارتەی ایسوتینن. سیاسەتی استعمار ئەوەیە کە بو لەناوبردنی سیطرەتی قیصری حکمداری روس انگلیس کومەگ بەلینن-و شیوعی راوەستا وبەانواع تعاون انگلیس لەنینی- لەسویسرەوە بردەوە بو ناو روس حسب بەاعترافی چرچل لەملاقاتی ستالین-لەموسکو بەتأریخ ١٢ أغستوسی ٩٤٢. کەچی لەپاش مدّەتیکی زور زو المانی لەترسی شیوعی هینایەوە وجود لە ٩٣٢دا. انجا بو لەناوبردنی المانیا لە ٩٣٩دا هەتامایسی ٩٤٥ روژی ١٤ ملیون مصارفاتی جنگی انگلیس بو کەچی امرو ئەوەندەی کەمصرف ئەکات بەشەرتی المانیای بو زندو ببیتەوە. ئەو روسەی بولەناو بەری کەلە ٩١٧دا خوی معاونەتکەری دروست کردنی بووە.

سیاسەت ئەوەیە. کەامریکا بەملاین مصارفات بومبایکی أتوم دروست اکات. و بەیك بومبیا شاریکی ١٠٠ هەزار کەسی لەناوئەبا. وەمکروبی نەخوشی دروست اکات وبلاوی اکاتەوە کەبەملاین بەشەری پێ لەناوبەری وەهەرای کوریا تنها بو أزموودەی پیلانی جنگی مستقبلی روس دائەنی کەهەتا ایستا بەملاین خوینی تیا رشتوە. و لەعینی وختیشا لەسەر کوژرانی قشەیکی بلغاریا (مسیسنی ناو) هەزاران احتجاج ودعایەی بێ‌وجدانی بو روسیا اکات ولەعینی وختا لیژنەی (أنیسکو) بو پرسینەوەی حقوقی بەشەری دروست اکات. وحقوقی فردی ومجتمعی پێ داوا ئەکات.

سیاسەت ئەوەیە کەروسیا ئەو کوردە هەژارانەی لەحکومەتی ایران هەلگیرایەوە لەدوایشا بەوعدی قرارادەیکی نەوتی دروی ایرانیەکان. ئەو ملتە هەژارەی تسلیم بەایران کردەوە بەهەزاران خانەوادەی کوردی دوچاری کوشتن وتالان وسوتان وسەرگەردانی کرد.

## غلطەکانی قاضی محمد لەتسلیم بونیا

قاضی محمد واحالی بوبو کەئەو تشکیلاتی ایرانیانە وختیە تنها بو ئەوەیە کەانتخاباتی ایران لە نظر حکومەتانی جهان ثابت ببی کە بەکمالی أزادی وحریەت کراوە. وهیچ گونە فشاریك وبی تشکیلاتیکی مەرزی تیا نەهاتوتەوە وجود. بو ئەوەی کە بەاکثریەت قرارادەی نەوتیان بو روس تصدیق کرد. ملتانی خارجی نتوانن بلین ئەو انتخاباتە انتخاباتیکی قانونی نەبووە وئەو مجلسەش شەرعی نیە. و ئەو تصدیقی لائیحەی نەوتەش موافقی رغبەتی شعب نەبووە.

اعتقادی وابو انجمنی ایالەتی چە بو کوردو چە بو أزربایجانیەکان هەتا نهایەت ئەمی‌نی‌تەوە ودەستی لی‌نادری. چونکە روسەکان لەایرانا داوای نەوت ونفوذ وەمرکزیکی سیاسی وتشکیلاتیکی گەورە ئەبن.

بەهوی ئەم اخفالاتی فکریە زور فرصەتی محلّی لەناودا. ئەگەر لەهەوەّلەوە بەودەرزی‌یە- (مورافینی) مەستی‌یان لەدەماخ نەدابایە. ئەی توانی ئەو عملیاتانەی خوارەوە بی‌نی‌تە وجود وبەتەواوی لەنظر ملتانی خارجەدا اثباتی بکات کەکورد بو حریت وأزادی خوی لەمیدان راوەستاوە. وەبەپشتیوانی هیچ قومیك داوای ازادی وسەربەخویەتی خوی ناکا. تنها شجاعەت وتمدّنی ملّی کوردی خستوتە سەر ئەو بارەی

کەهەتا أخر تنوکی خوینی لەمیدانی مبارەزەی قومیو استردادی حقی غصبکراوی خوی رابەوستی ودفاع لەحریەت وسەربەخویەتی خوی ئەکا. وبو اثباتی ئەو فکرە ئەی توانی ئەو نقطانەی خوارەوە بگریتە بەرچاو وفعلاً بەانجامیان بگەینی.

١-حقوانەبو جبهەی سقز چول بکات. ولەرغمی تسلیم بونی تەوریز حقوابو قاضی محمد پەلاماری سقزی دابایە. چونکە لەو وختەدا لشکری ناوشاری سقز بو گرەفی ساینقلا وتیکان تەپە- حرەکەتی پی درابو سقز بەچولی مابووە وزور بەسەهلی سقزی بو اگیرا. وبەگیرانی سقز وبانە وسردەشت هەمو نخشەیکی ایرانیەکان ئەگورا.

٢-لەعینی وختا ئەیتوانی بەچاوپوشی لە ١٠٠ نفر کوشتار سەردەشت بگری چونکە هیزی دیمکرات لەدەورەی سەردەشتا مستعدبون بو هلمەتیکی أوا وهیچ کوشتاریان بلاوە مطلب نەبو. ویانە هەریەمحاصرەی مابانەوە هەتا روژی کە بەطبیعەت تسلیم ئەبون.

٣-اکثری عشائرەکان ئەو روژە لەسابلاغ بون لەترسی گوناهباری وسوئی پاشەروژی ایرانیەکان أمادە وچاوەری امری قاضی محمد بون بو اشتراکیان بەجبهە ولشکرکەشی. من شخصاً لەو وختەدا لەناو عشائرەکانا بوم رام اعتقاد اکرد کەبەتفاهمیکی زورکەم تەواوی مخالفەکانی قاضی محمد ئەهاتنەوە جبهە وبرامبر بەحکومەتی ایران رائەوستان.

قاضی محمد لەو وختەدا بەهیزی خوی وعشائرەکان ایتوانی (٥٠) هەزار نفریکی مسلح جمع أوری بکات وجبهەی میاندوواو ورضائیە وماکو وهوشار وسنەیان پی تحکیم وبەربەست بکات.

ولەوختەشا فیشك ورەشاش وتوپی ضدی تانك وطیارە وخواردەمنیکی زوریان هەبو. وچوار طوپی ساز وریکیشیان لەأزربایجانیەکانەوە چنگ کەوتبو و١٦ ماشینی باری وسواریشیان هەبو. قاضی محمد بو بەرهەم هینانی ئەو فکرە زور بەباشی سەرئەکەوت. واستفادەی لەونخشانەی خوارەوە ئەکرد.

١-دەولەتی ایران ناچاری ئەوە ئەبو کە بەقید وشەرتیکی شرافەتمندانە لگلیا ریك بکەوی. حریەت وامتیازی مهاباد بەپاریزراوی بمی‌نی‌تەوە.

٢-اگر قاضی محمد اقدامی لەسەر بریەرەکانی ایرانیەکان بگرتایە. لشکر وگوناهبارەکانی أزربایجانی هەمویان بەتجهیزاتی جنگیەوە التحاقیان بەلشکری

قاضی محمد ئەکرد وتسلیمی نفس‌یان بەایران نەئەکردەوە. هەتا ٢٣ افسری أزربایجان لەتەوریزەوە بەفراری هاتبون بو سابلاغ. لایان وابو قاضی محمد تسلیم نابی وشەر ئەکات. بلام متأسفانە لەمیاندوواوا گیرابون چونکە غفلتاً کەوتبونە ناو اوردوگای حکومەتی ایران ولەوختی خویا باسی اعدام کرانەکانیان ئەکەین.

٣-حزبی جەوانانی أزربایجان وکوردوستان بلا استثناء لەبەر سوابقی ناشیرنی خویان ئەیان نایە کومەگی قاضی محمد.

٤-زور ممکن بو هەر انگلیسەکان تداخلیان بەلاوانەوەی قاضی محمد بکردایە لەوختیکا کەبویان رەوشەن بوبایە کەئەو حرەکاتە لەضدی روسە وبەپنجەی روس هەل گیڕ ووەرگیڕی پی‌ناکری. ویانە هەر روسەکان مقتضی سیاسەتیان تبدلی بکردایەوە.و ببانەوە بەموبیدی ئەو حرەکاتە. چونکە روسەکان لەمدەیکی زور زودا سیاسەتەکەیان تبدلی تی‌کەوت لە ١/فروردینی ٣٢٦ موافق نەبون کەعیلی بارزانی بچیتە ناو روسەکانەوە. کەچی لە ٦خردادی ٣٢٦ کەهەموی فرقەکەی دومانگ اگریتەوە. ملا مصطفی‌یان لەحدودی عراقەوە گیاندەوە بو ناو روسیا.

مادام شکلی جهان ونخشەی استراتیژی بەتوزی تبدّلی وضعیت قابلی گوران وتیك‌چونە. وامرو روژیکە بەتفنگیکی غلط. سیاسەتی عالمیك وقفە اکا ویاخوی کوئەکاتەوە. جابەو مناسبەتەوە حقوانەبو قاضی محمد هەروا جبانانە خوی تەسلیم بکات وقابلیتیکی أوا نشان ندا کەانسان بتوانی بلی کورد لەهەموو روژیکا اتوانی دفاع لەحقی خوی بکا.وحرەکاتەکەی قاضی محمد لەپاش دەوریکی ترا ببی بەنمونەی مثال بو پیشکەوتویی کورد لەمیدانی جنگ وکارزاریدا.

من شخصاً روژی ١٩ أزەری ١٣٢٦ ملاقاتی قاضی محمدم کرد. بەعینی وضعیەت کەعرضی ایوەم کردوە تفصیلات وتنبهاتم بو نوسی ودامەدەست. ((چونکە ازدحام وقرەبالغەکە لەوەدانەبو کەبتوانم بەزمان پیشنهادەکانم بەانجام بگەینم)) قاضی محمد وورد وورد بیرەکانی منی اخویندەوە. وفرمیسکیشی بەچاوا ئەهاتە خوارەوە. هەروەکو لەوساتەدا کوژرانی خوی لی‌یقین بوبی. لپاش خویندنەوەی نوسراوەکەم هەر ئەوندەی جواب دامەوە

کاك حمەدەمین

أزربايجانيەكان بی وەفاییيان لگل كردین. هەموو پیلانیكیان لیٚتیك داین، روی سیاسەت ودونیایی رەش بی. هەر روژە بەرەنگی روناكی لەكوردان ئەشاریتەوەو. ئەمەی گوتو خوی كرد بەژوری حزبەكەیا. لەپاش بینیك هاتە دەرەوە سواری اوتوموبیلەكەی بو وبەناو ئەو هەمو ازدحام وژنو منالە لیو بەبارانەی سابلاغیدا رویشتەوە بو مالەوە.

## شكلی پیشكەوتنی ایرانیەكان وكشانەوەی

## لشكری كوردوستانی أزاد لەمهابادا

لە ٥و٦ أزر٣٢٥. لشكری أزربايجان لەژیر قیادەی ژنرال عظیمی واردی منطقەی سقز بو. لەوختیكا كەدیمكراتیەكان لەپەراوەی گیرانی شارانی سقز وبانە وسەردەشتا بون لەمقابل شاری زنگان.

كمیسونیك كەعبارت بون لەسرتیپ علوی. وصدری قاضی ودوكتور مهتاش لەتارانەوە عازمی سقزبون. تخلیەی سقز وسردشت وبانە وتیكانتەپە-یان بەفرماندەی لشكری ٤ كوردوستان تیمسار همایونی ابلاغ كرد. همایونی ولامی ئەو هیئتەی داوە كەلەتارانەوە شتیكی أوای پیٚنەگوتراوە. واگر پیشی گوترابی اطاعەی ئەو أمرە ناكا جنبەی عصیانی اگری برامبر بەو قراردادەیە وهەتا نهایەت لگل لشكرەكەیا لەضدّی ئەو قرارە حاضری هەمو وینە اقداماتیكە.

اجا صدری قاضی گرایەوە بو سابلاغ. ولەمزگەوتی سوری سابلاغا خطبەیكیدا كەلشكری ایرانیەكان هەر ئەوندەیە كە لەمركزەكانا محاصرە كراون. حكومەتی مركزی ناتوانی كومگ بو سقز وبانە وسردشت بنیری وایرانیەكانیش دروتان لگلا ئەكەن تنها ئەتان خافلینن. جالەوە سەرم سورئەمینی كەصدری قاضی لەهەموو دەوریكا لگل ایرانیەكان متفق بو وهەمیشە مائلی روحیكی مسالمت وبرایەتی بو لەبینی ایران وكوردەكانا. لەوأخرەدا بەچە سیاسەتیك ویا لەچە تعصّبیكەوە ئەو خطبە خطیرەی لەضدی ایرانیەكان دا وجنبەی مخالفتی لگل ایرانیەكان بست. وأیا كەئەوندە مهتم بو لەوأخرەدا بەچە أمالیك بەسواری طیارەی ایرانیەكان چووە بو تاران وروی هاتوە داوای تطبیقی قراردادەكەی لەمەوپیشی لەایرانیەكان بكات. ویاخو ئەوە

هەرتصویریکی سیاسیانه بووه وبو چاو بستنەوەی قاضی محمد صدریان بەوناوەوە بویاغ کردبو. ولەدوایشا بەگیانیکی دکتاتوری خائنانەی بیبڕیاری هەرشهیدیان کرد.

### نخشەی حرەکاتی ایرانیەکان

لەروژی ١٤ أزر ٣٢٥ طیارەیکی ایران هاتە سەر (سەرا) مقری نیروی بارزانی. تنها بومبیکی بەسەرادادا. بەلام خوشبختانە ئەو بومبایە هەر مریشکیکی زامار کردبو.

انجا دەولەتی ایران لەسەر ئەو نخشەی کە لەتارانەوە گیرا بو ولەخوارەوە بعرض اگیندری ولەمجلەی أرتشی ایران چاپ کرابو. وبەپی قراردادەی ئەو نخشەیە روژی ١٦ أزری ٣٢٥ ئەبوایە هلمەت برابایە سەر لشکری دیمکرات لەهەمو لایکەوە.

١-ستونیکی نظامی لە-تیکانەوە- لەژیر فرماندەی سرهنگ اشرەفیدا بروا بو میاندوواو ولەوی داخلی عملیاتی جنگی ببی.

٢-ستونیك لەسقزەوە لەژیر فرماندەی سرهنگ بیگلری بروا بو بوکان وسابلاغ

٣-ستونیك لەژیر فرماندەی سرهنگ أیروم لەبانەوە بروا بو سردشت وسابلاغ

٤-ستونی چوارەم لەژیر فرماندەی لشکری کوردوستان سرتیپ همایونی تطبیقی احتیاطی بکات.

١-انجا قاضی محمد بو ئەوەی کەئەو خگّهیە تیك بدات لەژیر فرماندەی احمدخانی فاروقیدا تاقمیك پیشمرگەی نارد بو بو (تیکان).

٢-أرامی ارمنی- فرماندەی پیشمرگەی أزربایجان ئەویش بەعدەیکەوە لەساینقلا استحکاماتی کردبو.

لەروژی ١٦أزری ٣٢٥ لەنزیك دی (ماین بلاغ) لەبینی هیزی أزربایجان وکورد ولشکری ایرانی مناوەشەیکی شەر دستی پیکرا.

لە١٧ مانگی أزری ٣٢٥ لەتەپولکەکانی -سورسات- قرەحصار- همزە قاسم- ترك درەی- اطرافی تیکان جنگیك کرا دە نفر سەربازی ایرانی کوژرا وپینج نفریشیان بریندار دابو.

لە ١٨ مانگی ناوبراوا لەدی - ساینجو ومنبر- شەریکی زور بەتین دەست پیکرا. لشکری دیمکرات بو دواوە کشانەوە. و ئەو کشانەوەیان بو بەهوی ئەوەی کەهنگی

سوارەی (٥) لروستان بچیتە هولە سووە-و ١١سعات لەهولسودا- جنگ پەرەی ساند طیارەکانی شاهنشاهی دەورو پشتی هولسوی زورباش بەردومان کرد بەلام پیش ئەوەی کەئەو دو لشکرە یقەی یکتر بەردەن وغالب ومغلوب معلوم بکری. لەگەرمەی شەرا-داخەکەم امری تسلیمبونی أزربایجان بەفرماندەی لشکری ئەو ناوچەیە (أرام) ناو تبلیغ کرا. اجا لشکری أزربایجان دەستیان لەشەر هلگرت وکشانەوە بو تەوریز.

احمدخانی فاروقی بەلشکری سابلاغیەوە وعلی‌بگی شیزادیش بەهیزی یك شەوە وفیض‌الله بگیەوە. گەرانەوە بو سابلاغ وجبهە وریگای پیشکەوتنیان بو لشکری ایران چول کرد. اجا لشکری ایران بەبی شەر داخلی شاهین دوژ- دیهانی محمود جغ-و میاندوواو بون. بەلام لەشاری میاندوواوا لەروژی ٢١ أزری ٣٢٥ (٢٠) نفری ارمنی لگل لشکری ایرانا لەکارخانەی قندا بەشەرهاتن لەپاش مدەتیك محاصرە تسلیم نفسیان بەقشونی ایرانی کرد.

ستونی سقزیش-لەروژی ٢٠ أزری ٣٢٥ بەبی شەر چونە بوکانەوە ستونی سردەشتیش- لەژیر فرماندەی سرهنگ أیرمدا بەریگای کورتەکا روژی ٢٨ أزری ٣٢٥ واردی سابلاغ بو.

لەدوای گەرانەوەی حمە رشیدخان بو عراق اول وأخری شری دیمکرات لگل حکومەتی ایرانا ئەو چند تقانەبون کە لەهەوشارا لەبینی هیزی سابلاغی وفیض‌الله بگی وأرامی ارمنی وسرهنگ اشرفیدا کرابو ایتر تقەی‌کیان ندیبوو، هەتا تیاچونی حکومەتەکەیان.

## شورشیکی سەرسامی لەشاری سابلاغا

ئەو روژەی کەحکومەتی أزربایجان اعلانی تسلیم بونی بلاوکرایەوە. هەر بەبیستنی ئەو خبرە شاری سابلاغ وضعیتیکی زور ماتوملولی وەرگرت. عشائر واهالی سابلاغ هاتنە بەردەرگای حزب وراوەستان. بەروویکی زور سارد وپرغم وسەریکی زور سامدار چاوەری ئەوەیان ئەکرد أخوا قاضی محمد بەرامبر بەو موقفە چە قراریك ئەدا.

ایرانی خواهەکان دلشاد ودەم بەپی‌کەنین بون. کوردپەرستەکان رەنگ زەرد ولیو بەبار چاوەری دەستوراتی قاضی محمدیان ئەکرد . وبیریان لەدوا روژی سامداری خویان ئەکردەوە. بەلام لەهەمو کەس پەریشان تر وسەرگردان تر ملا مصطفی

بو.کەرەوشەنایی لەژێر ئەو چەرخی پانوبەرینــەدا شـك نەئـەبرد. مـلا مصـطفـی زیـاتر محاوەلەی ئەوەی ئەکرد کە قاضـی محمد اقناع بکات کەاسـتمرار لەسـەر شـەرکردن بکـا بەوهیوایە. افسرەکانی سابلاغی وبارزانی هەمویان لەباشگای افسران ودیوانــی جنـگ کوبوبونەوە بو وەرگرتنی تعلیماتی جبهە.

أغاواتەکانی عشائریش هەمویان خویان أراستە وامادەکردبو چـاوەری دەسـتوراتی رئیسـی جـمهوریتی کوردوسـتانیان اکـرد بـو اشـتراکیان بـە فرمـانی جنگـی. قـاضـی محمدیش وەکو ماسی دەرمان خواردو گیژ بوبو. ئەو موقفــە بەتاسـە تاسـاندبوی. سـەر روشـتەی منطـق وذکـای پـس پـس کردبـو گـا بەسـواری ماشـین بـە دەورەء ســابلاغا ئەسورایەوە وگاە ئەهاتەوە بو حزب ولەشوێنیکا سەری ئەنایە سەر ئەژنو شدّەتی موقف و وروماتی کردبو هیندی جار لەبەردەرگای حزب پیاسەی اکرد وەچاوێکی پڕ بـەگیانی ئەبڕیە ئەو هەمو ژنو منالو حشاماتە کەبەشینو گـابوڕەوە هاتبونـە بـەر درگـای حـزب وچاوەری دەستوری پیشەوای مەزنی خویانیان ئەکرد أخوا بڕیاری جنگ ئەدا یا تسـلیم بون.

لەعینی وەختا خطی تلفـون واتصـالی سـابلاغ لگـل نغـدە وسـندوس ومیـاندواو وتوریز ورضائیە قطع بو وشاری سابلاغ بوبە جیگایکی منعــزلی خوینین. لەوکاتـە حەرج وسەرسامیەدا اوتوموبیلیك بەتاوهات سـائقی ماشـینەکە هەرلـەدورەوە هـاواری کرد گوتی. مزگینی لەپیشـەوای گـەورەمان بـی لشـکری بـارزان چـو نـاو شـاری سـقز وسقزیان گرت.

أی أی لەسەر ئەو مـوژدە هلبستراوە چە قیامەتیك روی‌دا چ شایو شاپور وهلـپرکی وچپلەریزانیك دەست پی‌کرا. أخ بو چند وینەگریك کەلـەو وختـەدا بەوشـادی وسـرورەوە وینەی ئەو هەمو ژنو منـال ولشکرچی وفلکەی گرتبایە. بـو ئـەوەی کەببایـە رمزیکـی تأریخی کەکورد برامبر بەپیشکەوتنی قومیتی خوی چند بەتاسووداخوازە.

بـەلام داخـی گـرانم لـەدوای سـعاتیك ئـەو شـادی وخوشـیە روی کــردەوە شـیوەنو دلتنگی. ئەو روناکایەی سقز گرتنە بەتاریکی درو دەرچو. اجـا هەرلـەعینی وختـا خـبر بلاوبووە کەصدری قاضی بو بنای أشتی ومسالمەت چو بو تەوریز کەلـەویوە بچـی بو تاران.

قاضی محمد لەژێرەوە بەهوی صدری قاضی خبری تسلیم بونی بەلشکری ایرانیەکان راگەیاندبو. بەلام هەرچند ئەیکرد نەئەویرا ئەو موضوعە لەبەر ملا مصطفی دەربڕێ. ئەیەویست خاوە خاوە بەوخلکە بکات هەتا لشکری ایران لەسابلاغ نزیك ئەبێتەوە. ئەوەکو ملا مصطفی وبارزانیەکان پرکیشیکی قاضی محمد واهالی سابلاغ بکەن. بەبهانەی اسلحە وفیشك وشکانی هیندی امباری زخائر وتوزیعی بەسەر بارزانیەکانا. ملا مصطفیی خافلاندبو. ولەو وختەدا چەکیکی زوریشی بەسەر رەشو رۆتی بی کلك بلاوکردەوە. لەوختیکا کەلەسەر تفنگیك ویادە مانچەیك أغایکی رئیس العشائری ئەتوران. کەچی لەو ساتەدا ٢٠ و٣٠ تفنگی برنەوی ادا بەاشخاصی أوا کە بەکلکی هیچ وینە فرمانیك نهین.

لەوختیکا دلی حمە رشیدخانی لەسەر ١٦ تفنگە شکاوی عشائری سقز ئەهیشان (وکاغذ لەسەر قاقەزی اکردە سەر بو استردادی ئەوتفنگانە کەچی لەعینی وختا ٢٢ تفنگ و٣ صندوق فیشکی ادا بە (مینە قارمانی پیاوی حمە رشیدخان).

دلی عبداللەخانی منگوری لەسەر ٣ تفنگ اشکان. کەچی لەوروژەدا ٣٠ تفنگی ادا بەشیخ حمە امین-حقەی سەرگلوی تبعەی مامە رضای مهشور ومام عزیزی قرنیأغای مامەشی لەسەر ٣دمانچە وتماتیریك متأثر کردبو. کەچی لەوکاتەدا ١٦ تفنگ ویەك مسلسلی بەشیخ أمین اسعدی- کەس نزانی سەرشیو. و ٢٠ تفنگی بەشیخ جلالی کاکە لاوی نودییی-ئەدا کەئەو شخصانە نەیان ئەتوانی محافظەی تفنگەکانیان بکەن چە جای محافظەی قاضی محمد وحقوقی حکومەتەکەی. لەلایکەوە عبداللەخانی منگوری لەسەر ٣سی تفنگ ناچاری فرار وجلای نیشتمانەکەی اکرد. کەچی لەو روژە بەسامەدا ١٦ تماتیری ادا بە (ملا خلیلی گوڕەمر) کەهەم لەسابلاغ خانەنشینی دەستی قاضی محمد بو وبەنظری خائن و دوژمنی حکومەتەکەی تماشا اکرا. کەلەعمری خوشیا لەغیراز مندیلو میزەر اسلحەیکیتری هل نگرتبو. ولەوەل ورودی لشکری ایران بەسابلاغ. جنابی ملاخلیل بەکمالی افتخار وسرورەوە ئەو ١٦ تماتیرانەی بوسرتیپ همایونی اعادە کردەوە وتمایشی صداقەتی پیوە ئەکرد.

لەوروژەدا کە قاضی محمد ٢٠و ٣٠ تفنگی بو پیاوی بی کلك ونالایق حوالە اکرد. لەعینی کاتا ئەو شخصانە تفنگەکانیان بەقاچاغچیەکان ئەفروشتەوە. قاضی

محمد لەو روژەدا بەهوی بلاوکردنەوەی تفنگی عمبارکراوەکانی. قیمتی تفنگی برنەوی ایش پی‌نکراوی گیاندبو ٥٠ تومان ئەوانەی کە قاضی محمد بەتفنگ ودەمانچە تجهیزی کردبون بەپلە پەل لەترسی سربازی ایرانی تفنگەکانیان ئەفروشتوە.

ئەوەی کەاستفادەی لەاسلحەی قاضی محمد نکردبی تنها عشائرەکان بون. هەتا لەروژیکی أوا خطر وحرجیشدا نظریهی برامبر بەعشائرەکان باش نەبو. هەتا لەو روژەدا کەاسلحەی ئەو تەرزەی سەرەوە پخشان اکرد. علی جوانمردی - کەرئیسی گەورکی دولی میرەدی بو. لەو وختەدا لەسابلاغ بو. بو خوی وخزمەکانی داوای اسلحەی لە قاضی محمد کرد کەچی تنها دەمانچەیکی اوتوماتیکی گەورەی دایی. کەنسبەت بەو شخصانەی ٢٠و ٣٠ تفنگی دابونی حق وابو علی أغا ٥٠٠ تفنگی بدریتی.

## خطبەی تسلیم بونی قاضی محمد

لەشەوی ٢٠ أزەری ٣٢٥دا قەراری تسلیم بونی خوی بەخلك راگەیاند. اوراقی حزب وچاپخانە ودائرەی پیشەوایی وجنگی سوتان- دەستوری دا بەملا مصطفی بو گەرانەوەی لشکرەکەی لەجبهەکانا. بیانی زو لەگل اشرافی مملکەت وکاربەدەستانی حکومەت چو بو مزگەوتی سور. وخطبەیکی بەموضوعی خوارەوە خویندەوە.

أغایەکان برایەکان هاوخوینەکانم

لەبەرئەوەی کەدەولەتی انگلیس وامریکا. پشتیوانی لەایرانی اکەن ودەتوانن لەسەر ایرانی سرانسەری وەلاتی ناحەزانی ایرانی بسوتینن بەبومی (أتومی). ولەنقطەی دوایشدا أزربایجان کەسویندخور وهاوپەیمانی ایمە بو بی قەولی دەگلدا کردین. بەبی قرار ورئی ایمە تسلیم بەایرانیەکان بووە. ایمەش لەو وختەدا بغیراز تسلیم بون چاریکی دیکەمان نەماوە.

هەر ایستا هیئتیکیش دەنیرم بو لای سرلشکر همایونی بو ئەوەی لەسەر اصول وقراردادەیك نیوبی‌نەتە ناو شاری. ولە ایستاشەوە ألای کوردوستانی دابگرن. بەاسلحەشەوە مەگەرین.

انجا رئیس الوزەرا حاجی بابەشیخ ئەویش هەر تأید بەنطقەکەی قاضی محمد چند ووتەیکی پچکر پچکری فرمو.

ئەو موضوعە (بەدەستگای رادیوی سابلاغ) بلاوکرایەوە.. چونکە لەسابلاغ دەستگایکی مکبّرەی رادیو هەبو. لەسەر ئەو دستگایە خطبە وقصە اگوترا دسیمی ئەو . انجا مصیری عشائرەکان معلوم کرا. هەرکسە بو مالی خوی گەرایەوە. شاری سابلاغ کوچو رەوتی تی‌کەوت دەست کرا بەشت راگوازتن وخوقایم کردن شاربو بەشوینگای شینو زاری. ئەوەی کەلەدیهات جیگایکی شك ئەبرد بەمالو اساسیەوە چو بو لادی. دەولەمندەکان دورکەوتنەوە هەژارەکان مانەوە.

هەتا قاضی محمد وفامیلی ئەمانیش قایەیان کرد. شتی بەکەلکیان راگوازت بو دەرەوە. راوروت لەناو شار و اطرافیا دەست پی‌کرا قەوی هەژاری روت اکردەوە دەمانچە وتفنگی قاضی بو تەوقی لعنتو چو ملی هیندی اشخاصی بی روح وترسنوکەوە. هیندیکیان بەشەو اسلحەکانیان فری ادایە ناو مزگەوتەکانەوە. وهیندیکیان هلیان گرتبو کەتسلیمی بەحکومتی ایران بکەنەوە. وئەو عراقیانە وشخصە پستانەی کە قاضی محمد اسلحەی دابونی کەشەری بوپی‌بکەن بەتەرتیباتی خوارەوە هەمویان روت کرانەوە.

١-شیخ جلالی کاکەلاو-بەخویو بەتاقمەکەیەوە ئەچیتە ناودی میرەدی منگوران أغای ئەودی‌یە پەلاماری ئەدا هەم پیاریکی‌لی‌ئەکوژی وهەم خویو پیاوەکانیشی روت ئەکاتەوە ناهیلی تفنگەکانی قاضی محمد بریتەوە بو عراق.

٢-شیخ امینی حقەی سرگلویی- بەخویو پیاوەکانیەوە لائەداتە دی (زیوە) لەوەلاتی سویسنایەتی- دەستەی احمدأغا وقادری قاسمأغاپەلاماری ئەدەن ئەویش روت ئەکەنەوە.بەروتو قوتی هاتبووە بو عراق ولەدی (کستانە- بەرانکو چوخەیکی (محمود أغای) پژدەری أرال جذبە وارشادی تجهیز اکری.

٣-تفنگەکانی شیخ امین اسعدیش-بەبی کەمو کورتی لەدی کەس نەزانی سەرشیو تسلیم بەحکومتی‌ایران بونەوە.

٤-بەپی قید ودفت رەهەرچی ایرانیکی ئەوناوچەیە تفنگ واسلحەی لە قاضی محمد ورگرتبو اسلحەکانی بەپی‌خوی تسلیم بەحکومەت کردەوە بەشەرتی لەوادی فرارا نەبوبی.

## چونی هیئت بو لای سرلشکر همایونی

روژی ۲۲/أزری ۳۲۵هیئتیك كەعبارەت بون لەحمە حسینخانی سیف وسید علیحسین-ومیزا رحمەتی شافعی وشیخ حسن شمسی برهانی وعلی قرنی أغای مامەش وكریم أغای قونقلای دیبكری ومام حسن منگور ومامند أغای سلامەت-بو مذاكرەكردن لگل سرتیپ همایونیدا چون بو میاندوواو.

بەلام سەرلشكر همایونی ئەو هینەتەی قبول نكردبو. پیگوتبون ئەبی شخصی قاضی محمد بی بو چاوپیكەوتن چونكە ایمە ایوە بەهینتیكی شەرعی نازانین. انجا روژی ۲۳ أزری ۱۳۲۵ قاضی محمد لگل حاجی بابەشیخ وبایز أغای گەورك وهینتی ناوبراو چون بو میاندوواو. ولگل سرلشكر همایونیدا شەوی۲٤ مانگی باسكراو چون بو بوكان-وحمامیان بو مالی حجی محمود أغای ایلخانی زادە سرلشكر همایونی لەحمامیان تبلیغ بەقاضی محمدی كرد. كەپیویستە بەفوری سلاح بەسابلاغیەكان فرێ بدەی وبارزانیەكانیش چك بكەی بەلام قاضی محمد لەچككردنی بارزانیەكان اظهاری ضعیفی كردبو.تنها بەدورخرانەوە ودەركردنیان لەسابلاغ تفاهم لەبینی قاضی محمد وسرلشكر همایونیدا واقع وریك خرابو.

انجا قاضی محمد وهینەت گرانەوە بو سابلاغ بو ئەوەی كەملا مصطفی تجاوەزاتیك نكا. اقناعیان كرد بەنوسینی قاقەزیك بو سرلشكر همایونی كە ملا مصطفی وعیلی بارزان مائلن بەمانەوە لەایران وتبعیەتی جنسیتی دەولەتی شاهنشاهی.

وبو پیك هاتنی مەرام وتیك نەچونی انجامی كار. سەرلشكر همایونی قبولی داوای ملا مصطفی زور بەشیرینی بو ملا مصطفی نوسیبووە. وهەتا حصولیموافقەتی سركزی منطقەی شنو ولاجانی پینشان درا بو اقامەت ومانەوەیان وبەو فیلە بەبی هیچ گونە تعرضاتیكی خەراپ ملا مصطفی لەسابلاغ دوورخرایەوە.

انجا روژی ۲٦ أزەری ۱۳۲۵ دو هنگی سوارە ودو هنگی پیادە لگل چەند تانك وماشینی زرەپوش ولگل بەشیكی لشكری عشائری دیبكری- گەورك- ودەستەی أغا صالح سلطان پەناە-بەبی هیچ وینە مصادەمە وتقەیك واردی سابلاغ بون. ولەلاین اهالی سابلاغەوە استقبال واحتفالیكی زور عظیم بو ئەو لشكرە ئیسەی دكتاتوری محمد رضای- شاهی ایران كرا.

هەتا استحكامات ومواظبەتیكی تەواو لەسابلاغ پیك هـات وامنیـەت وأسـایش لەهەمولایكەوە جی‌گیربو. سەرلشـكر همـایونی هەرلـەمالی قـاضی محمـد میـوان بـو. وهەمو فرمان وكاریكیشی بەاستشارەی قاضی محمد پیك ئەهینا.

لەپاش استقراری امنیەت بە (٧) روژ سەرلشكر همایونی بیاننامـەیكی بـو هـەمو أستانی رضائیە وكوردوستان بلاوكردەوە. هـەر اسـلحە وچـەكیك كەبەدەسـت عشـائر واهـالی شارسـتانیەوە هیـە. ئـەبی لـەمودای (١٥)روژا بی‌هینیتـەوە بـو حكومـەت. وهەركەسی كەخلافی ئەو بیاننامەیە مشاهداتیكی لی بكری ئەبی بخنكی.

ئجا لەهەمولایكەوە مأموری چك چنی دەرچوو. چـە جـای اسـلەحەی كـە لـەقاضی محمد ورگیرابو. ئـەو چكانـەش تسـلیم كرایـەوە كەبەهـەزاران تومـان- لـەلاین اهالیـەوە كرابو.

## حبس كردنی قاضی محمدو او الەكانی

ئجا لەدوای اسـتقراری امنیـەت. لـەناكاو پـەلاماری گرتنـی مسـببین‌و مشـتركینی حرەكاتی كوردوستانی أزادی مهاباد درا. لەعینی وختـا مـلا مصـطفـی لـەتاران بـو. پیشەوای كورد قاضی محمدیان لگل حمە حسین خان وحاجی بابەشیخ ووهابی بلـوری- أغـای صدیقـی- منـافی كریـمی- سیدە پیرە-مامـەغنی- أغایـانی مـازوجی-أمـین شەرەفی- حسین فروهر- علی ریحانی- جعفری كریمی-علی خسروی- خلیلی خسروی- حسین مدەنی پور- میرزا حسینی نال بندیان- محمدی ایازی-سعید زادە- عبدالقـادری دباخی- میرزا عزیـزی صدیقـی- یـاهو- لشـكری-احمـد أغـای عباسـی- احمدالهـی- محمدی اسحاقی- اصحابی- هاشمی همزەی-نغدەی- عبدالله روشنفكر- احمدی قادری- سید كـاملی كـردی گـلان- نـاظمی لـەاهالی سـابلاغی گـرت. ولـەأغواتی عشـائری منطقەی سقز و بوكانیش احمدخانی فاروقی- محمد خانی دانشور-عبدالله خانی متین- علی بگی شـیزادی- محمـد امینبگـی شـكاری- سـعیدخان-أورحمـان‌بگی همـایونی- حبیب‌اللەخانی عزام الملك- محمدبگی بابەخان بگ- حمە حسین خـان-فیض‌الله خـانی امیری- احمدخان- محمودخانی شجیعی- عزیزخانی یاسی‌كند- حسـن خـانی بـالاقلو- علی خانی قلاكون- عزیزخانی قاتان قور- احمدخانی خسرەوی- لەعشائری فیض‌الله بگی خرانە زندانی بوكان وسقز و ایضاً لەعشیرەتی گـورك ومنطقـەی سقز- علی

جوانمردی- رسولی محمودی-مصطفی معروفی-کریمی محمدی-امین اسعدی-صدیقی اسعدی ئەوأغایانەش زندانی کران. وغیری ئەمانەش هەرچیکی اشتباهی اشتراکی دیمکراتی لی کرابی.وپارەی پی.وه شك برابی خرایه زندانەوه. بەلام ئەو شخصانەی کەلەسەرەوه باسکران ئەوانە هەمویان درەجەدار وخاوەن وظیفه وفرمانی‌گەورەبون لەدەوری قاضی محمدا. وصدری قاضیش کەبو تطبیقی قراردادەکەی بینی خویو شا لەوپیش چوبو بوتاران. ئەویش بەحپسی هینرایەوه سابلاغ وخرایه لای قاضی محمد وئەو هاوری‌یانەی. اجا قاضی محمد لەحپس‌خانەدا هوشی هاتەوەبەر. لەخەوی غفلەت راپەڕی که تەماشای دەوره و پشتی خوی کرد.هەر زڕەی زنجیر ودەنگی سخورمەی سەربازە پیسەکانی دکتاتوری ایران دی. نەأغای حەرشیدخان وملا مصطفی وعمرخانی شکاك وعبدالله خان منگور وامام عزیزی مامەش بەدەورەوه نەماوه أی. خوکسیکی لەو قارەمانو لیدەرانە بەدەورەوه نیه. لغیراز ئەو سەربازە چارە قورسانەی کەبەدوکەلی تریاك وحشیشەوه (فرچك یان گرتووه ونیزەی تیژی ژهراویان بەسەر لولەی تفنگەکانیانەوه چسپ کردوه وبەدیار أغای قاضی محمد پیشەوای مەزنی کوردوستان راوەستاون. اجا تی‌گەیشت کەلەسیاسەت نەزانین انسان دوچاری مرحلەی أوا غلط وسخت ئەکا. ویا سیاسەتی استعمار بەو تەرزە (کەرویشکی سڵ) بەتختەیکی بی گیانی عرەبانە اگریت. بەلام داخی گرانم فرصەت لەدەست دەرچو بو هزار ندامەت سودیکی نەبو. پەشیمانی جی هیچ فرمانیکی پیش امدی نەئەگرت. سفینەی نجاتی روس فڕی دابو.ناو دەریایکی پر لەسیاسەت وتلاطمی شەپولەوه. اجا کەسەری هەڵبری چاوی بەصدری برای کەوت.

آی کاك صدر-بخیربی‌یەوه.چیت کرد

کاکه هیچ- چون هیچ- بەخوا هیچ-

بوچی شاش دروی کرد. بەڵی) چونکه ئەویش دکتاتوره وبەخورشتی سیاسەتی تەژی.بەڵی-

ئەی جاران ئەوەت نەازانی. بەڵی‌ام زانی. بەڵام لەبەرچاوم بو عاقبت چون ئەبی ئەم ویست وانەبی.بەلام داخەکەم هەروا بو.

محاکمەی قاضی محمد-رقم (۱)

لەدادگای جنگی) سابلاغ هینتیک کەعبارەت بون لەرئیس سرلشکر همایونی واندام سەرهنگ فیوضی. وسرهنگ غفاری وسرهنگ بیگلری- بو محاکمەکردنی قاضی محمد لەدادگای زەمانی جنگ تشکیل کران وسروان شریفی- بەمحامی قاضی محمد لەو محکمەیەدا معلوم کرا. دەرگای صالونی محاکمات کرایەوە. (٢٠) نفری سەرباز بەمهماتیکی پر لەسام قاضی محمدیان بردە حضوری ئەو هیئتە وبەترتیباتی خوارەوە استجوابیان کرد.

س-أغای قاضی محمد تومتهمی بە ١-تشکلیلی حزبی دیمکرات ٢-بەرابطە لگل حکومەتی خاریجەی روسدا-٣- بەکرینی موادی جنگی وتوزیعی بەسەر عشائرا- ٤-تشکیلی سلاح لەروی نیروی دەولەتی-٥-تصمیمی تجزای ایران وایجادی کوردوستانیک-٦-هلکردنی ألای خودمختاری بەبی قراردادەیکی دەولەتی-٧- اشتراك بەشورە وکوشتاری تەوریز ورضائیە-٨- احتلالی شارەبانی سابلاغ وکوژرانی پنج نفری پاسەوان وتالانی شارەوانی -٩-کوشتنی تاجری ناسراوی سابلاغ میرزا غفوری محمودیان- ١٠-کوژرانی قاضی زادە رئیسی ادارەی نفوس.

غیری ئەمانەش شتی زور خراپترت کردوە. بعضاً بموجبی مدارك ووثائق رەسمی وهیندیکیان بەاستنادی شهود. امجا ورامت چیە.

ج-ئەوەی کەمشمولیەتی بەنیشتمان پەرستیەوە بی انکار ناکری. چونکە وطنیت شتیك نیە کەلەهەموو أثار وزندەگانیك خوشەویستتر وپیروزتر نەبی ئەوەی کەمن کردومە بو سلامەتی خاکی ایران بووە. کەخارجە نتوانی سیطرەتی مطلقی بەسەرا پیا بکات. وامروش لەری سلامەتی خاکی ایرانا ئەکوژریم زورم پی‌خوشە. مادامیکی من بوم بەسببی ئەوەی کەناوی ٩,٥٠٠ ملیون کوردی پاشکەوتو وبەش خوراو بەجهان رابگەینم. البتە بەأرەزو وداخوازی خوم گیشتوم ولەوە زیاتر چاکە لەژیانما نەماوە ونامەوی بژیم.

س-ئەی بوچی هەتا نهایەت ادامەت بەاستقلال وسەربەخویەتی نەدا وە بوچی بدون قید وشەرت تسلیم بەنیروی شاهنشاهی بویتەوە. کەخوت بەحامی و پیشەوای ٩,٥٠٠ ملیون کورد ئەزانی.

ج-صدری قاضی برام برامبر بەو کلیمەیە گوناهبارە. دەنا من ئەمزانی کەدەولەتی ایران ذرەیك شرافەتی تیا نەهاتوتە وجود. بەلام صدری قاضی اخفالی کردم

کەگوایا لگل شادا ریك کەوتوە. کەبرامبر بەکوردەکان هیچ أزاریك رونـەدا. منیـش بـو ئەوەی کەمالّو منالّی کورد لەو رێیەوە دوچاری زحمەت وفلاکـەت نـەبی. وبرادەرکـوژی نکری. قصەکەی صدری برام بەراستزانی وبەمقتضـی روژم تلقی کرد. دەنـا امتوانـی بەرامبر بەبی شرافەتی دەولتی ایران اقدامات لسر کوشتار بکەم.

لگل ئەوەشا لەبیرەکەی خوم پشـیمان نەبومـەوە. بـا حیـاتی مـن قوربـانی أسـایش وخوشی ئەو ملته هەژارە بکری کەبو پـارازتنی شـەوکەت وشـەرافەت. یـان لـەمیدانی کارزار راوەستابون.

س-ئەو بیاناتانەت هەموی باعثی اثباتی مجرمیتی خوتـن. اعـادەی نظـر بکـەوە لەو اعترافە خەراپانەت.

ج-بەشعوریکی کاملەوە تأید وتأکیدی أزادیخواهی کورد ئەکەمەوە.

س-أغای سروان شریفی-برامبر بەمجرمیتی قاضـی محمد چە گونە دفاعیك اکەی.

ج-قاضـی محمد پیویستی روعفتە چونکە لەحالاتی اجباری وتأثیراتی اجانب ئەو حرەکاتەی هیناوەتە وجود. وضغطی بیگانە ناچاری کردوە بەو حرەکاتە. ئەمـە اثباتـە لەدوای رویشتنی اجـانب بلاقیـد وشـەرتی تسـلیمی نفسـی کردوتـەوە. اگـر بـەتأثیری اجانب ئـەو اقداماتـەی نکردایـە. ایتوانـی ادامـە بـەجنگ بـدات وحـاضر بـی بـو برادەرکوژی. من داوای ئەوە اکـەم کـە دەولـەتی شاهنشـاهی چاوپوشـی لـەو تقصیراتـە بکات. چونکە بەحریەتیکی فردی وسوء العملی شخصی ئەو کارە پیك نهاتوە.

س-أغای شریفی. تباهکاری قاضـی محمد ئەو دفاعە هلناگری

ج-بلی أغایـان: نظر یـەی هینتـی دادگـای زەمـانی جنـگ لەسـەرچی قراریگـری منیش بو تأیدی ئەو قرارە موافقم.

سەرباز-أغای قاضـی محمد برنەوە بو زندان أە ببخشن بـو مقـامی پیشـەوائیەت.-بەلی بەلی-

سەرباز-أغای حمە حسین خانی سیف بین-بەلی گوریان

## محکمەی حمە حسینخـانی سیفی قاضـی رقم (۲)

س-أغای حمه حسین‌خانی سیفی قاضی-توش عیناً متهمی به(بزه وگوناه باریه‌کانی قاضی محمد. وپنجه‌ت له‌هه‌مو فرمانیکی قاضی محمدا بووه. جا دفاعت چیه بی‌لی.

ج-من شخصاً حاضربووم که له‌ری له‌أزادی خواهی کوردا هه‌تا دوا هه‌ناسم لگل ده‌وله‌تی دکتاتوری مستبدی ایران بجنگیم. وبه‌هه‌ر وسیله‌ی که‌بوم بکری قه‌لای بوگه‌نی استعماری و اقطاعی ایران بروخینم. به‌لام متأسفانه قاضی وصدر میدانی ئه‌وه‌یان نه‌دام که‌داخوازه‌کانم پی‌ك بین.

من شخصاً له‌ده‌میکه‌وه‌یه که‌ئه‌زانم هیکلی حکومه‌تی ایران به‌ر ژره‌ی شه‌رافه‌ت نه‌که‌وتوه وتیشکی نظام وعداله‌ت وضمیر وعاطفه له‌و هیکله پیسه‌ی ده‌وله‌تی مرتجعی ایرانی نداوه. وبرامبر به‌نظامی حکومتیکی أوا متفسّخ. دفاع وداوای بی تقصیری‌کردن چه تأثیریك ئه‌نوینی.

من شخصاً بو ئه‌و محکمه بی‌حرمتانه‌تان نه‌هاتووم که‌چاوپوشی له‌مجرمیتم بکات بلکو له‌محکمه خوینریژه‌که‌تان داوا ئه‌که‌م هه‌تا زوتر چاوم له‌دیداری شومی ایوه دوربخریته‌وه که‌مه.

بژی أزادی. بژی کوردوستانی مزن.

س-أغای سروان شریفی دفاعت چیه

ج-أغایان-هیچ

سه‌رباز-أغای حمه حسین خان برنه‌وه. أغای صدری قاضی بین

## محکمه‌ی صدری قاضی ژماره (٣)

س-أغای ابوالقاسمی صدری قاضی نائبی ده‌وره‌ی ١٤ ده‌وله‌تی شاهنشاهی تو له‌لاین أغایانی قاضی محمد وحمه حسین خانی سیفه‌وه متهم‌کراوی گوایا تو میدانی ئه‌وانت نداوه شه‌ربکه‌ن وخوین ریژی بخنه رۆ. جوابت چیه

ج-به‌لّی من له‌ئه‌وّله‌وه هه‌تا أخری هه‌ر مخالفی ئه‌و به‌سه‌رهاتی تشکیلات وأژاوه‌یه بووم. چونکه زانیومه قضیه‌ی کورد مسئله‌یکی عالمیه أوا به‌أسانی پیك ناهی. وهیچ قومیکیش حاضر نیه له‌و وختدا به‌پی مصالحی استعماری خوی بو کورد تی‌بکوشی.

جابو ئەوەی خوین‌ڕیژی وبرادەرکوژی نەکەویتە بینی حکومـەتی شاهنشاهی وئـەو کوردە هەژارانەوە. همیشە اختیاری جنبەی أشتی وریکیم لگل حکومەتی شاهنشاهیدا کردوە. وبو ئەو بابەتە بلینی تەواوم لەشـا وەرگرتبـو. اگـر قـاضـی محمد شـرنکا أزاری هیچ کوردیك ندری بەلام متأسفانە دەولەتی شاهنشاهی قراردادەکەی خوی هەتا ایستا نەبردوتەسەر.

س-أغـای صـدری قـاضـی تـو لـەلایك داوای مسـالمەت وریکیـت کـردوە. کـەچی لەلایکی تریشەوە لەمزگەوتەکانی سـابلاغا خطـابـەت خویندوتـەوە. گوتوتـە کـەهیزی دەولـەتی شاهنشـاهی هـەر أو نفراتانـەن کەلەسـقز وبانـە وسەردەشـتا محصــورن. اگـر پەلاماریان بدری حکومەت هیزی کەی نیە بو امدادیـان بنـیری. گوتوتـە ایـران مـردوە زندو نابی‌تەوە.

ج-شتیکی وها نەگوتراوە گوتومـە اگر ایران بش مری بقدەر ایمە هەر زندووە. اگـەر نیروی ایران هەرئەوەش بی کە لەشارانی سقز وبانە وسەردەشـتا محصـورن. بعشـائر هـەر ناگیرین.

## شاهد ملاخلیلی گورەمەر لگل چند ملایکا

قاپی محکمە کرایەوە..

ملایکی ریش سپی پشت کومـاو. کـەوایکی ڕەشـی شـۆڕی لەبـەردابو ومـیزەریکی سپی لەسەرنابو. پشتیندیکی مندیلی لەپشت بستبو. بەگوچانیکی وینە گالوك-هاتـە ژورەوە.لەبەردەمی هیئتی محکمە راوەستا.

رئیسی محکمە-جنابی أغای ملاخلیـل راجع بەخطـابـەداتی صـدری قـاضـی چـە معلوماتیکت هیە بی‌فرمو.

ج-اشـهدباللّه ئـەمن بـو خـوم لەوشـوینە حـاضربوم. کـەأغای صـدری قـاضـی خطـبـەیدا گوتی سەربازی ایران هەر ئەو عدەیەن کەلە شـارەکانا محاصرە کـراون. تـازە لەتارانەوە هاتومـەوە. دەولەتی ایران مردوە جاریکی‌تر زندو نابی‌تەوە.

خلیل گورەمری
امضـا

س-جنابی ملاحسین مجدی قاضی حالی سابلاغ وجنابی ملا محمد وشیخ عبدالرحیم شیخی برهان وملا ابراهیم-ایوه هیئتی عدلیەی قاضی محمد بون. بەرامبر بەتهمتی صدری قاضی چە معلوماتیکتان هیە بی‌لین.

ج-ایمەش حرفیاً شهادەتی جنابی ملاخلیل تأید ئەکینەوە.

س-ایوە برامبر بەخەراپەی قاضی محمد وحمە حسین خان ئەلین چی.

ج-گوناهکاری ئەمانە لەهەمو لایکەوە معلوم وثابتە.

س-ئەمانە مستحقی اعدامن یانە

ج-لەکوشتنیانا هیچ گوناهیك توجیهی اعلیحضرتی شاهنشاهی ارواحنا فداه نابی. وهیچ تاوانیکیش روناکاتە حضرتی تیمساری معظم فرماندەی نیروی عزامی همایونی. بەلام عفوکردنیان لەکوشتنیان جوانترە.

| ابراهیم | شیخ عبدالرحیم برهان | محمد | حسین گرشیری |
|---|---|---|---|
| امضـــــا | | امضـــــا | امضـــــا |

امضا

## محاکمەی حاجی بابەشیخ ژمارە (٤)

س-أغای حاجی بابەشیخ رئیس الوزرای کوردوستانی قاضی محمد. توسابقەی شاپەرستیت زوربو. مغفور لە رضا شاە شاهنشاهی پیشوی ایران احترامی توی زور اگرت. بوچی بقصەی خاریجان کفرانی نعمتت کرد. ولەحکمی گورەی خوت هلگرایەوە. بو مجزای ایران بوی بەهاوری قاضی محمد ودەستەء افسادات خواهان

ج-واللّە وباللّە وتاللّە لەاوەلی هەتا أخری من مائلی مجزای ایران نەبووم. لەشکلیکی اجباریدا اختیاری کومەگی قاضی محمدم کردوە. لەوختیکا کەریگاکان لەلاین حمە رشیدخانەوە محاصرە کرابو. بو بەرەلاکردنی ئەو ریبندانە زور کومگیم بەقشونی ایران کردوە. لگل رەزم أرا وشابەختی‌دا رەمزی صداقەتم موجودە. هەتا رزم أرا بو اثباتی بی علاقە وبیطرەفی من لەتارانی‌وە یك جلد قوریئن ویك بەرمالی-بو ناردبوم. ومن لەهەمو تهمتیکی راستەقینەی ئەو تشکیلاتە بەریم.

حاجی بابەشیخ ترجان
امضا

## محاكمەی محمدی ناظمی ژمارە (٥)

س-أغای کبتان محمدی ناظمی- ناظری تخشائی لشکری قاضی محمد تو متهمی بەوەی کە لەسەر تبلیغاتی خاریجەکان طغیانت کردوە بو مجزای ایران تی کوشاوی. چند غوغا وحادثەیکی غیرە قانونیت لەناوچەی مهابادا هیناوەتە وجود. ولامت چیە.

ج-أغای تیمسار همایونی بم بخشە ئەو فرمودەیەت وەریگرەوە من بقصەی هیچ خاریجەیك قیامم نکردوە. مغدوریەتی قومی کورد منو هاوری‌کانمی اجبار کردوە کەبو چارەی پاشکەوتنی کورد هەتا أخر نفس گیانمان لەژیر پی رهبەر وپیشەوای بەرزی کوردوستانا بەخت بکەین. وتوش لەوە زیاتر بەچاوی تحقیر تەماشامان مکە. چونکە قضیەی کوردوستان تحقیر هلناگری.

محمد ناظمی

امضا

## محاکمەی رسول نغدەی ژمارە (٦)

س-أغای کبتان رسول نغدەی مأموری انضباطی مهاباد- تو متهمی بەو مسائلانەی کەلەدەوری قاضی محمد دەرحق بەحکومەتی شاهنشاهی اجرا کراوە ولامت چیە بیلی-

ج-أغای تیمسار همایونی. وهیئتی دادگای خوینریژی ودکتاتوری ایران صاعقەی ملیەت ایمەی مجبور کرد کەداوای مجزائیەتی ایران بکەین. حبی وطنیەت ایمەی هاندا کەلەپیناوی أزادی کوردا گیانی خومان بکەین بەقوربانی. خواهش ئەکەم دوا روژی من لەدوا روژی ئەو نیشتمانپەرستانە جیامکەوە کە کفنیان بەگوللەی دوژمنانی دکتاتوری ایران سورکراوە.

رسول نغدەی

امضا

## محاکمەی کپتان حمیدی مازوجی ژمارە (٧)

س) أغای محمدی مازوجی مأموری سوقیاتی زخائری لشکری دێکرات. تو متهمی بەوەی کە لەجبهەی سقزا اشتراکی رێبندان وبراکوژی سەربازی دەولەتی شاهنشاهیت کردوە.

ج-قضیەی پیشکەوتن وسەربەخویی ٩,٥٠٠ ملیون کورد ئەوەنیە کەهەمو فردیکی کورد اختیاری هەزاران مقاذەفە ومخاطراتی بو نکا. ئەگەر ژیام واجباتی قومی کوردم پیك هیناوە. ئەگەر شهیدیش کرام ئەو لاوانەم خوش بن کەوامن خومیانم بو کردن بەقوربانی.

محمدی مازوجی
امضا

### محاکمەی روشنبیر عبدالله خدر میرانی ژمارە (٨)

س-أغای عبدالله خدر میران پیشکاری رەبری قاضی محمد تو بەوە متهمی هەمو اوامریکی غیرە قانونی قاضی محمد بەهوی تووە تبلیغ ودابەش کراوە. وەبەهەمو اسراریکی قاضی محمدت زانیوە لەبەر صداقەتی یك روحی

ج-بەلی اصلاً من صداقەتی روحیم لگل قومی کوردا هیە. ورهبر وپیشەوای معظمی کوردیش جنابی قاضی محمد روحنا فدا. یکیکە لەافرادی کورد. بەلام لەبەرئەوەی کەشعوری ٩,٥٠٠ملیو کورد ئەوی خستوتە حرەکەتەوە. ومقدەراتی هوزی کورد لەم مسئول کراوە. بەواجباتیکی قومی شرافەتمندانەم زانیوە کەلەریگای پیشکەوتنی ئەم وبەرزبونەوە، استقلالی کورد فداکاری ودلسوزی بکەم. وایوەش ئەم بەسەرهاتە، منە بەهەرشتیك کەتلقی ئەکەن منتتان لێنازانەری. چونکە رزمندانەی نیشتمانم لەدل أزردەگی امپراطوریەتی مرتجعی ایران بەلاوە مقدەس وپیروزترە

عبدالله خدر میران
امضا

انجا قاپی دادگاە داخرا. متهمەکان وأزادی خواهەکانی کوردوستان برانەوە بو زندان. بەچاوەروانی کوژران هەریکەیان لەسوچیکی زندان بەدەستو پێبستراوی دانەران.

قاضی محمد-أی أغای صدر چیت پیکردین چون حیات بردم

صدری قاضی — کاکە بلیم چی. منیش ئەو هەمو کوشیشەم هەر بو مصلحەتی کوردان بو. چونکە ئەمزانی کەروسەکان لەدائرەیکی ضمیر وانصافا دەستیان نەداوەتە

ئەو حرەكاتی ایمەیە. روژیك هەرئەبی كەكوردوستان بەدو گالون نەوت بفروشن. جالەبەر ئەوە نەمئەویست كە نە تو ونە ملەتی كورد دوچاری سوكی وأزار ببی.

بەلام مقدّەراتی خوایی وای‌كرد كەمن لەخطەكەی خوما سەرنەكەوم. وبی شەرافەتی دەولەتی دكتاتوری ایران من مجوب وشەرمندەی تو بكات. ایستاش بەكمالی بی‌شەرمی‌وە داوای عفوت لی‌ئەكەم. چونكە من بوم بەسببی أزار ودل تنگیت كاكی گەورەم.

حمە حسین خانی سیفی- خواهش ئەكەم لەسەر ئەو موضوعە مەرون ئەوّەلی روژ كەایمە ئەو هنگاوەمان هەلی‌نایەوە. ئەو زندان وبندیەمان لەبەرچاو بووە. بنای استقلال هەتا بەهەزاران كلّەی وكو ایمەی تی‌نخرابی بەرز نەبوتەوە. حقوایە ایمە هەمومان بەو تنافە بنازین كەكلّەی ایمەی پیوە هەلّوەسری. استقلال وأزادی خواهی بی خنكان تأمینی ئەو شەرەفە ناكات كەایمە منظورمان بووە. موژدەتان ئەدەمی. حاجی بابە شیخ افراج اكری بەلام ایمە ئەو ٧ نفرەمان ئەخنكین. وخوا رحم بەو كوردانە بكات كەوا لەسەر قصەی ایمە دوچاری ئەو مشكلات وبەسەرهاتە هاتوون

## خنكاندن-شهیدكرانی قاضی محمد وأوالەكانی

روژی دەهەمی فروردین سالی ١٣٢٦ كەمصادفی دوشمبەی هشتی جماد الأولی ١٣٦٥هـ و٣١مارتی ١٩٤٧ ئەكات. كەخلقی سابلاغی لەخەوی شیرین راپەڕین. ودرگای دوكان وبازارانیان كردەوە. جاردرا كەبچنە بەر درگای سەربازخانە بو مشاهداتیكی سیر وعبرتگاهیكی مأثرانە. اهالی گەورە وبچوك ومنال وژن وپیر وجەوان. لەبەر درگای سەربازخانە كوبونەوە. چاویان بە ٧نفری كورد كەوت كەملیان بەتنافی دەولەتی دكتاتوری ایرانەوە كرابو.

أی أی ئەمانە كین-

چون نایان ناسن-ئەمانە أغایانی رهبرو پیشەوای بەرزی كوردوستان

١-قاضی محمد-٢-صدری قاضی -٣-حمە حسین‌خانی سیفی-٤-محمدی ناظمی-٥-رسول نغدەی-٦- حمیدی مازوجی -٧-عبدالله روشن فكر كەلەری أزادی خواهیدا كوژراون.

وئەو فرمانەی خوارەوەشیان بەژور سەرەوە هلاوەسرابو.

ستادی نیروی کوردوستان

رکنی دوهەم رضائیە

اعلامیە

ژمارە ١٩١٢٥

روژ ١٣٢٦/١/١٠

ساعەت ٨ افرنجی

لەأخری سالی ١٣٢٠دا قاضی محمد وابو القاسم صدری قاضی ومحمد حسین خانی سیفی قاضی لەمهابادا. دەستەیکیان لەسلسلەی تحریکات واقداماتی خراپ لەضدی امنیەتی منطقە بەرهەم هینابو. تدریجاً عملیاتی ئەو أغایانە توسعی کرد. هەتا عملیاتەکانیان گیشتە حالیکی اسف انگیزەوە. هجومیان کردە سەر شارەبانی سابلاغ پینج نفری پاسەوانیان کوشت وشارەبانیریان تالان کرد. لەفقرەی دوهەمدا تاجری بەناوبانگی سابلاغ (محمودیان) ناو کەشخصیکی دەولەت وکشوەر پەرستبو کوشتیان. وبەمەش کفایەت نکرا رئیس دائرەی نفوس قاضیزادە ناویشیان بەفدای مصالحی شخصی خویان کرد. قاضی محمد بەهاودەستی صدری قاضی برای کە ظاهراً نمایندەی ایران بو لەتاران. ولەباطنیشا عاملی نخشهای مجزای ایران بو. ومحمد حسین سیفی قاضی بو پیاکهینانی مقاصدی شومی خوی هەمو روءسای ادارەجاتی حکومەتی لەسابلاغ دەرکرد.

روژی ٢٦ أزەری ٣٢٤ آلای ٣ رەنگی شیرو خرشیدی ایرانی لەبلندی عمارەتی دەولەتی داگرت. وألایکی بەعنوانی ٣ رەنگی کوردوستان هلکرد.

لەروژی ٢ بهمنی ٣٢٤ قاضی محمد خوی بەرئیسی جمهوریتی کوردوستان ناونا وعدەیکی اشخاصی بدسابقەی لگل خویا کرد بەهاوری. وبو خودمختاری کوردوستان لشکریکی لەنفراتی سابلاغی وبارزانی بو مقابلەی نیروی دەولەتی مسلح کرد. واسلحە ومهماتی لەخاریجەوە جلب کرد. وبەسەر عشائرا بلاوی کردەوە. ومحاصرەی سقز وبانە وسردەشتی پیکرد. چند حادثەیکی خوینین لەو منطقەیە رویدا. هیزی دەولەتی چند کەرەت قاضی محمدی بەاطاعەت تشویق کرد. بلام سودیکی نەبو. هەتا لەتاران اولیای اموری دەولەتی بو اقناع کردنی زور تیکوشین سودیکی نەبو.

لەناوەراستی أزەری ٣٢٥دا نیروی دەولەتی بو أزربایجان کەوتە حرەکەت ئەو شخصانە لەمجالس ومزگەوتانا خطبەیان ادا. بو بریرەکانی نیروی دەولەتی شفاهاً

ومكتوباً بو سەرحملەی ستونی نظامی امریان صادر ئەکرد. بەلام خوشبختانە عشائرەکان بەافکاری پیسی ئەمانە اقناع نەبون ونیروی دەولەتی بەسرعەت پیشرەوی کرد. تەواوی نقشە پیسەکانی ئەمانەی بطال کردەوە.

لەنتیجەدا ئەو عناصرە خائنانە بەسەر پنجەی عدالەت گرفتاربون. وحوالەی بارگای زەمانی جنگ کران. و ئەو خائنانە محکوم بەاعدامی کران. دادگای تجدیدی نظریش رئی دادگای زەمانی جنگی تصدیق کرد. وبەتصویبی بندەگانی اعلیحضرتی همایونی شاهنشاهی گیشت.

ساعەت ٦ روژی ١٠ فروردین ١٣٢٦ حکمی اعدامیان تنفیذ کرا.

فرماندەی لشکری ٤ کوردوستان سرلشکر همایونی

اجا دوا روژی قاضی محمد بەتنافی ایرانیە خوین خورەکان هات. قاضی محمد وای ئەزانی گیانی ئەو لەلاین روسەکانەوە پرستو وسگرتو-کراوە کەس ناتوانی پنجە بو گیانی ئەو بەری. نەی ئەزانی کەخالو خوارزایی وروحم ووفا وریکی وتبایی لەسیاسەتا نیە.. اجا استناد بەو غروریەتیەوە هیچ احضاراتیکی بو پاشەروژی خوی نکردبو و بلکو احضارات نەکردنەکەی ئەوبو بەسببی امینبونەوەی زورکەس وتیاچونی زور عائلە. حقوابو قاضی محمد یاچوبا بو روسیا ویا لگل لشکری بارزانیدا مدەتیك کنارەگیری بکردایە. چونکە هەر بەختی کنارەگیری لەوبەسەرهاتە اسف انگیزە بەدور ئەبو. بەلام تقدیری ازەل وپنجەی قدرەتی وصی هەمو وینە بیرو مشوریکی دور اندیشی بەستبو... وایمەش بەو مناسبەتەوە وبەم تأسفەوە هیچ چارەیکیترمان لەدەست نایی کەلەو وختەدا بو بەرزی وپایە بلندی ئەو بیکەین بەآثار وشاهدی فداکار واخلاصی کورد پەرستیەکەی. تنها ئەو نوسراوەی (بەسەرهاتی سیاسیە-نەبی کەبەناوی ئەمەوە شەرەف وزینەتی وەرگرتووە.و لەدرجەی دوهمیشا داوای غفرانی لەبارەگای یزدان تکا اکەین وبەخوای شهیدانی نیشتمان پەرستی اسپیرین. اجا حاجی بابەشیخ لەپاش بینکی تر تبریە بو. وباقی بندیەکانی کەلەمەوبر بعرض گیاندران هەریکەیان بەمحکومیتی سالیك هەتا ٢٠سال محکوم کران. بەلام زندانی هیچ لایکیان دوسالی نەخایاند هەمویان بەهوی پارە ورشوەت خویان بەرەلا کرد وخویان تابعی عفوی شاهانەی ٩٤٨ کردەوە.

## شهیدکرانی افسرانی أزربایجانی لەسابلاغا

لەوختێ خویا کەأزربایجانیەکان پەلاماری هێزی دەولەتی ایرانیاندا لەتوریز وأستانی رضائیەدا. صاعیقەی قومی ومیهن پەرستی ئەو افسرانەی اجبار کردبو کەاختیاری خیانەت بکەن، لگل حکومتی فارسا. وبەهوی یك خوینی ویك عرقی تورکمانی أزربایجانیەتیانەوە اشتراکی حرەکاتی أزربایجانیان کردبو وداخلی قشون وسربازخانەی أزربایجان بربون.

اجا لەتیك چونی أزربایجان ئەو افسرە درەجاتدار وخوین گرمانە وایان زانی بو کە قاضی محمد تسلیم نابی فراراً هاتبون بو سابلاغ. بەلام نەیانزانی بو کەاوردوی دەولەتی واردی میاندوواو بووە بەامنیەتەوە لەشاری میاندوواوا اسیر اکرین وادرین بەدادگای زەمانی جنگی مهاباد بەترتیباتی خوارەوە ئەمانیش لەسابلاغ لەتنافی دەولەتی دکتاتوری ایران دران. ولەسەر آزادیخواهی.ئەمانیش خاکی أزادیپەرستی مهابادیان بەنصیب بو. وبون بەمیوانی ئەو آزادیخواهانەی کەلەپیش ئەمانا ناومان هینان.

١-سرهنگ ابو القاسم عظیمی

٢-سەرگردی سوارە جعفری سلطان أزاد.

| | |
|---|---|
| ٣-سەرگوردی پیادە | علی اکبر حسینی |
| ٤-سروان پیادە | یوسف مرتضوی |
| ٥-سروان پیادە | حسین قاسمی |
| ٦-سروانی هوائی | محمدی آگهی |
| ٧-سروانی پیادە | غلامحسین ناصری |
| ٨-سروانی توپخانە | احمد جودەت |
| ٩-ستوان (١) مالی | حسین غفاری |
| ١٠-ستوان (١) سواری | غلام رضای دبیرینا |
| ١١-ستوان (١) پیادە | افتخار هریس |
| ١٢-ستوان (١) پیادە | علی اکبری شمری |
| ١٣-ستوان (٣) سوارە | قربان علی أرین تاش |
| ١٤-ستوان (٣) مهندس | حسین کوپال |

| | |
|---|---|
| ١٥-ستوان (٣) پیاده | عقیمی بلند جاوید |
| ١٦-ستوان (٣) پیاده | عبدالله ستارزاده |
| ١٧-ستوان (٣) سوار | عطاءالله زندیان |
| ١٨-ستوان (٣) پیاده | علی عالی ثنائی |
| ١٩-ستوان (١) مالی | شاهپور شرەفی |
| ٢٠-سروان سابق | حبیب‌الله خاك زادی |
| ٢١-ستوان (١) سابق | حسن ظهیری |
| ٢٢-ستوان (٣) سابق | علی غائی |
| ٢٣-استوار (١) هوائی | ابوالقاسمی حقیر پەرست |

محاکمە واعدام‌کرانی قاضی محمد وأوالەکانی واعدامکرانی ٢٣ نفری أزادی‌خواهی أزربایجانیش بەوپی‌یە لەشاری سابلاغ دوایی هات وبەو گیانە پاکانەوەیان خویان فرێدایە باوەشی فرشتەی رحمت ولاپەڕەی میژوی أزادی خواهیتەوە. میژوی ناموس وشرافەتەوە. میژوی نیشتمان پەرستی وکورد پەرستی‌وە.

## فصلی (٩)

# محاکمە وشهیدکرانی دوانزە أغای أزادی‌خواهی کورد لەشاری سقز وبوکانا

نظر بەقضیەی دسائسی خاریجە کوردەکان بەتەواوی خویان لەنظر دەولەتی ایران عیبدار کردبو. اعتقادیان وابو کەجاریکی‌تر زنجیری اسارەت نابی‌ننەوە. لەوختیکا کە لەلاین قاضی محمدەوە اعلانی تسلیم بونەوە کرا. أزادی‌خواهەکان سەریان لی‌شیوا. وەکو کەوی بالو پی‌شکاو نەیان ئەزانی بو کوی سەر ومال دەرباز بکەن.

تشددّی هەوا وبفر ریگاکانی حدودی بستبو. أزادی خواهەکان مالو منالیان بو دەرباز نەاکرا بو خارج. لەسەر تشجیع ودل نوازی وامیدەواری قاضی محمدیش خلك کەمتر باکی پاشەروژی لەبیرمابو.

چونکه هەتا بینیك قاضی محمد لەساباڵغا احترامی اگیرا وبو زور ایش پرسی پـی اکرا. وديسان قاضی محمد خلکی وادارکردبو کەدەولەتی ایران حەقی بەسـەر کەسـەوە نیە کەس مترسـی نـەبی. لـەعینی وختـا حکومـەتی ایـران بیاننامـەیکی بلاوکردبـووە کەکەس ترسی نەبی حکومەت بەچاوی گوناهباری تماشای کەس ناکات. چونکە لەنظر دەولەتا پابت بووە کە بەپنجەی خارجە ئەو تشویشاتە هاتوتەرو. هیچ ایرانیـك مسببی ئەو حرەکاتە نەبووە.

جا أزادی خواهەکان بەو ۳ دلنوازیە امین بوبونـەوە. بـو رفعـی اشتباه واسـتقراری امنیەت روءسای عشـائرە گوناهبارەکـان رسمـاً کـران بـەمأموری اسـلحە کوکردنـەوەی عشیرەتەکەیان.

لەروژی ۲۱/أزەری ۳۲٤، اکثری أغایانی فیض‌الله بگی لەترسی لشـکری ایـران بەماڵەوە هاتبونە دی(شرف کنـدی) وخانقـای برهـان-مـنیـش لەسـابلاغ ئەهاتـەوە بـو دولی میرەدی. لەدی شـرف کنـدی-بـەاحمدخانی خلیل‌خـان وعلی‌بگـی شـیزادم گـوت. کـەوضعیت تبـدّل ئـەکات. ایرانیـەکان دروئەکـەن کـەس عفـو ناکـەن. بەهـەرنوعیك کەبوتان اکری یا ایران بجی‌بیلن یان لەشوینیکا کنارەگیری بکەن تـا مصیری قـاضی محمد وبارزان رەوشەن ئەبی والا ایرانیەکان ئەتان خنکینـن. چونکـە ایرانیـەکان مجبـورن فعالیتیك بو لناوبردنی ئەو غایەی استقلال ومجزائیەتـە بکـار بی‌نـن لـەپیش تصدیقی لائحەی نەوتەکەی (سادچیکوفا).

بەلام احمدخان جواباً گوتی من خنکـاندنی ایرانیـەکانم لەدەربـەدەری وچونـە عـراق بەلاوە باشترە. چونکە بەخنکاندنی خوم ناموسم محفـوظ ئـەبی. بـەلام لەدەربـەدەریونم ناموسـم نـامینی بـەلام سـەرم پـاریزراو ئـەبی. چونکـە تجرەبـەی دەربـەدەریم دیـوە لـە ۱۹٤٤دا کەهاتمە ناحیەی پینجوین روم ئەکردە ژیـر سـیبری هـەر گـەورەیك طمـاعیـان ئەکردە ناموسەکەم. جا کەوا بو با بخنکیم واعادەی ئەو دەورە نەبمەوە.

باقی أغایانی کەش هەربەعینی موضوع وەلامیان دامەوە. ومنیش بەچاویکی پر لەفرمیسـك ودلیکـی زور بەپەروشـەوە مـاڵ‌أوایی ابدیـم لـەو کـوردە نـاودار وشـەرافەتمندانە خواسـت وبەوحالـە بـەجیم هیشـتن. انجـا لـەروژی ۳۰ أزەری ۹٤٥ احمدخـانی فـاروقی کـرا بـەمأموری اسـلحە کوکردنـەوەی عشیرەتی فیض‌الله بگـی. وهەمولایکیان امین کرانەوە واعادەی سەرجیگا وریگای خویان کران.

متأسفانه لەپاش تەواوبونی اسلحەچنی أغایانی خوارەوە هەمویان بەتأریخ ١٠/١٠/٣٢٥ لەبوکان کو اکرینەوە. وهەمویان بەیك آن توقیف اکرین وهەر لەبوکان حوالەی دادگای زەمانی جنگ ئەکرین. ولەپاش تصدیقی حکمی اعدامیان بو خنکاندنیان لەروژی ١٣/١١/٣٢٥ ئەو أغایانە هینرانە زندانی سقز.

١-احمدخانی فاروقی-٢-عبداللەخانی متینی -٣-محمدی دانشوەر -٤-احمدخانی شجیعی -٥-محمدامین بگی باغلوجە کەمشهور بو بەمحمد امین‌بگی بابەخان‌بگ- بەلام علی‌بگی شیرزادی تنها لەزندانی بوکان مایەوە. چونکە دی یك شەوە تابعی بوکانە. وقانوناً مجرم ئەبی لەو منطقەیە اعدام بکری کەارتکابی جرمی تیاکراوە وجیگای جریمەکانی ئەویش ناحیەی بوکان بووە.

## محاکمەی علی جوانمردی رئیسی عشیرەتی گەورکی میرەدی

علی جوانمردی رئیسی گەورکی دولی میرەدی لگل رسولی محمدی برای وکریمی محمدی کوندەلان ومصطفی‌أغای معروفی کیلهشین وشیخ صدیقی اسعدی یازی‌بلاغ-لەسەر طلب وداوای سرلشکر همایونی چون بو سقز. بەو فیلە اقناع وداواکران بچنە سابلاغ بو استفادەی مرحمت لەسەر لشکر همایونی. علی جوانمردی تا اندازەیك خوی بەبی گوناە ازانی لەقضیەی دیمکراتا. چونکە هەتا چوار مانگ پیش ئەو تأریخە لەسنە زندانی بو. وکە گەراشەوە بو (تموتە) بارزانیەکان بەتقریری درو متهم یان کردبو گوایان اختلاطی لگل رزم أرا وسرلشکر همایونیدا هیە. بوتأید ومراقبەی نظر مدەتیك بو بردبویان بو سابلاغ هەتا روژی انقلابەکە هەر لەسابلاغ بو.

جابەو مناسبەتەوە خوی زور بەبی تقصیر وسەربەست ئەزانی اجا بەبی تردد لگل ئەو أغایانەی کەباسکران چو بو سقز. بەلام بەگیشتنی بەشاری سقز لەسەر تحریکات وافساداتی محمد أغای عباسی کەتالان کران وەدەربەدەری خوی بەهی ئەو ئەزانی لەدەوری حەمەرشید خانا.

أغاى جوان مردى بەخوى خزمەكانيەوە اسير اكرىو لەعينى روژا كەتصادفى ١٠/١٠/٣٢٥ ئەكات أغايانى -شيخ امين اسعدى-و حسن خانى كانى نياز وعلىخانى فاتح قلندر كەعائدى منطقەى سقز بون ئەوانيش توقيف اكرين ولەافسران-ضرغام- وموثوقى-صديقى-كهيارى--هيئتيكى دادگاى زەمانى جنگ لەسقز تشكيل كرابو محكمەى ئەو ٦ أغايانە.

## محاكمەى على جوانمردى

### قاپى محكمەى جنگى كرايوە

س-أغاى على جوانمردى تو بەمە متهمى كەلەدەورى شهريورى ١٣٢٠دا اشتراكى حمە رشيدخانت كردوە. لەوختيكا كەحمە رشيدخان خارجەيك بو كە بانەى گرت ئەو هەمو عائلەى افسران ومأمورى ادارەجاتى ايرانى بەكمالى شەرافەت وهنرمندىوە وبەامنيتى كاملەوە لەمنطقەى سقز تسليم بەتوىكردن كەواردى سقزيان بكيتەوە كەچى تو فعلاً انواع حنارەتت بسەر هينابون.-٢- كەلەسنە برەلا كراى تعهدت لىوەرگيرا كەتداخل بەقضيەى قاضى محمد نكەى كەچى فعلاً لە معاونەتى قاضى محمد قصورت نكردوە. وحسن ومحمدى كورت اشتراكيان بەحرەكات كردوە لەجنگى ميرەديدا لگل لشكرى بانەىدا سەربازيان كوشتوە ولامت چيە-حمەخانى محمودخانى كانىسانان لەسابلاغەوە بە ٢٨ تفنگەوە هاتوتە لاى تو نەتگرتوە بەريت كردوە.

ج-اصلاً اشتراك كردنم لگل حمە رشيدخانا بارى ناچارى بو. وختى كەحمە رشيدخان بقصدى حملەى بانە واردى (ترخاناواو بورين وكانى ملا احمد-بو كاغذيكى هەرەشەى لىنوسيبوم ئەگەر اشتراكى ئەو حرەكاتەى نكەم عاقبەتى بو من خراپ بى. بەلام هەتا گيانى بانە من گويم نەدايى. لەوختيكا كەبوم معلوم بو حمە رشيدخان چوكى بەدەولەتى ايران داداوە. وحكومت موجود نيە كەحقوقى خوى محافظه بكات چە جاى حقوقى ايمە. ولەترسى سابقە عداوەتى كەلەبين ايمە وبانەىدا هەبو. ناچارى ئەوەبوم كەاشتراكى حرەكاتى حمە رشيدخان بكەم.

٢-بو قضيەى عوائلى ايرانى كەلاين منەوە تعرض وتحقير كرابن. قطعياً اصلى نيە چونكە غرەتى شرافەتمندى كورد درحق بەاسير وژيركەوتو لەغيراز تلطيف ومهرەبانى هيچ فكريكى كە قبول ناكات.

٣-بو قضيه شەركردنى محمد وحسن كورم لگل دەولەتى شاهنشاهى بى علاقەم چونكه لەو وختەدا من لەسنه اسيربووم. وبو چونى سابلاغ وعلاقەم لگل قاضى محمدا جارى ئەوەل حمه رشيدخان بەاجبارى ناردومى بو زيارەتى قاضى. وجارى دوهەميش بەحپسى بردويانم لەسەر راپورى محمد قدسى ضابطى بارزانى وحەمەخانى محمودخانيش كەلەسابلاغ گراوەتەوه هاتوته مالى ايمه. من لەمالەوه نەبووم كورەكانيش نەيان توانيوه بيگرن. بەلام حق نيه دەولەتى ايران بەو دەرەجەيه پشتيندى غرضكارى لگل ملەتى كوردا ببستى و آثارى ئەو ملته بى‌چارەيه بىريتەوه.

هيچ وامەزانن كەبەو تشدوداته كورد دوايى بى. بلكو هەتا ايوه لەحرّيەتى زاتى منعيان بكەن ئەوان زياتر بو داواكردنى حقوقى مرعيەى خويان حريص ئەبن. لەجياتى ئەوەى كەايوه كوردكوژى وبرادر كوژى بكەن بەتفاهم وتساهل باشتر اتوانن معنوياتيان پاش بخەن. رضا شاه هەتا مرد نەى‌توانى بەتشدد خوليايى قومى لەميشكى كوردەكان دەربى‌نى. لەرەغمى ئەوەى كەهرچى رئيس العشائر ومتنفذين وأزادى‌خواهانى كورد هەبو لەقصرى قجرا زندانى كردبون. لەئەوەل وهلەدا ئەوەيان بەسەر دەولەت هينا كەايستا منى پى متهم ئەكەن. من وا اعتقاد ئەكەم ئەو قضيەى أزادى خواهيه بەكوشتن وزندانى‌كردن دوايى نايى الاّ كەريگايكى تساهل‌ترى بو نەدوزنەوه. منيش هەر ئەونده تماس لەو هيئتى دادگايه ئەكەم هەتا بەيقينى ازانم، تصميمى خراپيان بو قضيەى هاورى‌كانم اگرنه برنظر. ولەوختەدا من داواى كوژرانى خوم ئەكەم لەپيش أوالەكانما. چونكه مردن لەژيانيكى بى دەسلاتانه خوشتره وبى‌أوالى لەمردن پيس‌تره.

علي جوانمردي
امضا

## محاكمەى رسول أغاى محمودى گەورك

س-أغاى رسولى محمودى-تويه كوشتنى سەرجوخه شعبان-متهمى كەلەپوسطى ميرەدى كوژراوه. چونكه ميرەدى دى تويه. ايضاً بەوه مسئولى كه لەديواندره برينداركراوى وأغا صالح كندولان خور خورەى وحمه امين بگى صدبارى بانه) كەلەشەرى ديواندره كوژراون. توتشجيعت كردوون كەهلمەت بەرنه سەر پادەگانى

شاهنشاهی لەومەرکزەدا ولەدەوری قاضی محمدیشا لەسقز فرارت کردوە چووی بـو لای حمە رشیدخان وقاضی محمد.

ج-اصلاً سەرجوخە شعبان- کەکوژراوە من لەسقز حپس بووم قیدی زندان شـاهدی بی گوناهیمە. وبو شـەرێ دیوانـدرە انکـار نـاکری کەاسـبابی ضـروری ئـەو شـەرەی پی‌کـردوم. لـەفراری سقزیشـما ناچـاربووم چونکـە ژنومـالم لـەمیرەدی اسـیری دەسـت دیمکراتیەکان بووە. وخوشم فعلاً بەبی گوناه لەسقز گل درابومـەوە. جابو دربـازکردنی عـائلەکەم لەدەست ئەو هەمو لشـکرەی کـە لـەمیرەدی کوبوبـووە ناچـاربووم کـەالتحاق بەعـائلەکەم بکەم ولەفراری منیشا بەناوی منەوە هیچ حادثەیك رویـنەداوە. وبوهـەردو حرەکاتیش امری عفوی شاهانە بخش کراوە. من وا اعتقـاد ئەکـەم کـە لەسـەر ئەوشتە کونانە نـەرون باشـترە خـەریکی اعـادەی امنیـت واصلاحـات واعـادەی روحـی عمـران وکشاوەرزی بن لەو غـائلەی گیران وتختو تازە باشـترە. چونکـە تشـدد دوبـارە دەوریکـی راهن لەایرانا ئەهی‌نی‌تەوە وجود کەاجارە بـەهیچ تدابـیریك بەرهەلسـت نکـری. حقوایـە حرفیـاً تطبیقـی قـانون وعفـوی امـری شاهنشـاهی بکـەن وبـەاغراضـی شـخصی وبەتحریکاتی هیچ ناحەزیك درحق بەدانیشتوانی ایرانی نژاد غرض‌کاری تعقیب نکەن باشە.

رسولی محمودی
امضا

## محکمەی شیخ صدیقی اسعدی سقزی

س-أغای صدیقی اسـعدی تـو متـهمی بـەوەی کەلباسـی دیموکراتـت لەبـەرکردوە وبەدرەجەی کبتانی اشتراکی شەری هیجانانت کردوە. وسەربازی ایرانیت کوشتوە.

ج-دەولەتی ایران حاضر نەبو کەمستقیماً دفاع لەو جیگایانـە بکـات کـەناموس وعـائلەی ایمەی تیا اژی. حالاتی ناچاری وشەرف محافظەکردن اختیاری ئەو خذمـەتـەی پی‌کردین

صدیقی اسعدی
امضا

## محکمەی مایور شیخ امین اسعدی کەس نەنازانی

س-أغای مایور شیخ امین تو بەرگی زنّارت پوشیوەو پروپاغندەی پچکرینی ایرانت کردوە. وداواکاری سەربەستی ودیانەت نەهیشتن بووی. وبقصدی تجهیزی عسکری چەکت لە قاضی محمد وەرگرتوە. اشتراکی جنگی هیاجانانیشت کردوە.

ج-اصلاً لەپوشینی لباسی زناری جرمیك توجە ناکری. کاروانی تمدن بەرەو پیشکەوتن ئەوا. مستوای أدەمی زاد امرو گیشتوتە مرحلەیك کەحقوقی فردی وگەلی لەهەمو لایکەوە پاریزگاری کراوە. بەحسب ئەوەی کەمن ناو وزمان وجیگام بەکورد وکوردوستان ناوبراوە. واجباتیکی هەرە پی‌ویستمە کە بو شکانی أمانجی پیشکەوتنی ئەو کوردو کوردوستانە تی بکوشم واختیاری انواع دەوری مخاطراتی بو بکەم. وئەو لباسەی کەهیئتی دادگای محترمیش پوشیویانە هەر بەرگی زنارە. چونکە نهضەتی بەشەری ئەو لباسەی کردوە بەلباسیکی عالەمی. مادامیکی ادەمی‌زاد بەرەو پیشکەوتن ئەروا لەداخوازی حقوقی کورد وسەرپەرشتی وەلاتەکەما خوم بەمقصر نازانم.

وبو قضیەی دیانەت اصلاً من بەشعوری دیانەتەوە مقید نیم تنها بەشعوری قومیەتەوە مربوطم. قومیەت اگر مخالفی أدابی دیانەت ببوایە لەناو ملتانا تعقیب نەاکرا. مادام هەتا ایستا قومیەت لەهیچ لایکەوە منع نکراوە. معنای ئەوەیە ملیەتیش لکیکی دیانەت بی. نەدیانەت بەبی‌قومیت ونەقومیەتیش بەبی‌دیانەت اژی. جا بەهوی ضمیری قومیەتمەوە بەواجبم زانیوە کەئەو لباسە لەبەریکەم چونکە ئەو لباسە بەخوینی هەزاران گنج ولاو لەماشین دراوە.

امین اسعدی

مایور

## محاکمەی حسن‌خانی کانی نیاز فیض‌اللەبگی

س-أغای حسن‌خانی نیاز تو بەوە متهمی کەچووی بو ناو دیمکرات

ج-چونی ناو دیمکراتم جریمەیك تشکیل ناکا. قوام السلطنە بەرسمی بلاوی کردوتەوە کەشخصی اشرفیش‌یان دیمکراتە ورسماً ئەو حزبە لەایرانا امتیازی دراوەتی.

وبو محافظەکردنی املاك وحقوقی أغایەتی خوم مجبور بووم کەتماسی قاضی محمد وغیرەیان بکەم لەو جهتەوە خوم بەمجرم نازانم.

حسن کانی نیازی جلالبگی
امضا

## علیخانی فاتحی قلندەر فیض‌اللەبگی

س-أغای علیخانی فاتحی-تو بەوە متهمی کە لەلاین قاضی محمدەوە مرشح بووی بەفرمانداری سقز

ج-أصلاً کەسقز گیرابایە زورکەس لەمن مقدّم تر هەبو کەبکرین بەفرماندار. قطعیاً ئەمن فکریکی أوام بووە ونەقاضی محمدیش شتیکی وەهای باس کردوە. ئەوە ناحەزان ئەوەیان بو دروست کردوم. ولەدەوری دوهەما اختلاطی قاضی محمد بو من ناچاری بووە. چونکە دییەکەم مرکزی حرەکاتی لشکری قاضی محمد بووە.

علی خانی سرتیپی جهانگیری
امضا

جا محاکماتی ئەو ٦ أغایە بەوپی‌یە دوایی هات ولەنتیجەی محاکمەیاندا قەرار بەاعدامیان ندرا. ولەمحکمەی تجدیدی نظریشا تصدیق کرا. وتنفیذی اعدامیان بو شەوی ١٥/بهمن ٣٢٥ بەتصویبی اعلیحضرەتی همایونی شاهنشاهی ایران گەیشت.

هیئتی دادگای محکمەی أزادیخواهانی فیض‌اللەبگی لەبوکان عبارەت بون لەرئیس سرلشکر همایونی وسرهنگ مفروری وسروان خاکسار-و ندیمی.

-قاپی محکمە کرایەوە-

## محاکمەی احمدخانی فاروقی رئیس عشیرەتی فیض‌اللەبگی

س-أغای احمدخان فاروقی کەمشهوری بەأغای سالار واحمدخانی خلیلخان تو لگل عبداللەخانی متینی ومحمدخانی دانشوەر کەهردوکیان برای بچوك تن. متهمن بەکوژرانی سەرلشکر امین لەسقز. واشتراکی حرەکاتی حمە رشیدخان هتا نهایەت

لەدەوری شهریور و قاضی محمدا. کەشەری هیجانان کراوە فرماندەی لشکری هیجانان بووی لەضدی قوای دەولەتی تشکیلی سلاحت کردوە وسەربازت کوشتوە. هەمو اموراتیکی حمە رشیدخان موافقی دەستوراتی تو بەانجام هاتووە. لەدەوری دیمکراتا بەروتبەی پولکونیکی معاونی حرەبی حمە رشیدخان بووی. تو زور گوناەباری باخصوص لگل أغای محمد امینخانی قادرخان زادە-لەشەری کاکە سیاوی) محالی خرخرە زور شکارەت واقداماتت نشانداوە لەو شەرەدا ١٢ نفر سەربازت کوشتوە. دفاعت چیە بیکە.

س-أغایانی عبداللهخان ومحمدخان ایوە خوتان جوابی خوتان ئەدەنەوە یانە احمدخان وکیلی ایوەشە

ج-احمدخان سەرداری ایمەیە. ایمە لەحضور ئەوا حدّی کلاممان نیە.

س-أغای احمدخان وەلامی ئەمانیش بدەوە. کەئەمانیش شریکی گوناهباری تون

ج-اصلاً أغایانی عبداللهخان ومحمدخان برا بچوکی من بوون واشتراکیان بەو حرەکاتانە نکردوە. تکایە ئەم بیچارانە داخلی پروەندەی گوناەباری من مکەن چونکە ئەمان اقداماتیکیان بو ئەو حرەکاتانە نەبووە. ئەمان برامبر بەم تهمتانە معصومن.

اصلاً حکومەتی دکتاتوری رضا شاهی پهلوی وضعیتی هوزی کوردی گیاندبو اندازەیك. بەراستی لەتەواناماناا نەمابو کەچیتر قبولی ئەو فشار وآزارە بکری. باوکو باپیرەی من پشتاوپشت لگل دەولەتی ایرانا نظر بەسوئی ادارە وعدالەت. هەر بەبی محبت ومهرەبانی رای بواردوە. چونکە لەدەمیکەوەیە دەولەتی مرتجعی ایران هەر خوینڕیژ بدکردەوە بووە. جا منیش زورم بەلاوە سوکیبو کە لەرەویەی اجدادی خوم لابدەم. وبو هیندی ژیان وزندەگانی وەختی سەری حرّیەت بو افسرانی ایرانی بەذلیلی دابنەوینم. بەواجباتیکی مقدەسی ملیم زانیوە. کەفرصەتیکم بو هلبکەوی لەو هەلە مبارەکەدا آثاری بدی شاهنشاهیتی ایرانی ریشەکیش بکەم.

حمە رشیدخان لە قضیەی شهریورا مطابقی رغبەت ونخشەی من کاری نەئەکرد. والاّ من حرەکاتەکەم هەر اوندە محدود نەاکرد بلکو ئەمەویست لەشاری تارانا محمد رضای خائن لگل هینتە خائنەکەی حکومەتەکەیا لداری سیاسەت بدەم.

قاضی محمدیش دیسان هەر بەشخصیکی گوناەبار ازانم. کەنەیهیشت لەتولەی خوینی ازادیخواهانی کورد. ئەو درەجەدارە خائنانەی دەولەتی محمد رضا لەسقز وبانە وسردەشتا بکەم بەعبرت ونمونەی مثالی میژوی کورد.

بلین تان ئەدەمی هەتا أخر نفسم دوژمنم بەحکومەتی حاضرەی ایران. وهەتا دواتنوکی خوینم أمادەم کسەری خوم بخەمە پیناوی أزادی کورد. لەوبیرو بریارەی کەلگل نیشتمان وکورد بەستومە بەرگەشتە نیم. أزادی کوردم ئەوی نەوك زندەگانی کسیفانە وبیدەسلاتانە.

بژی کوردوستان. بژی أزادیخواهانی کورد

احمدی فاروقی

خلیلخان زادە

س-أغایانی عبداللهخان وحمەخان ایوە برامبر بەم تعصبی قومیە الین چی؟

ج-تکایە هیچ پرسیاریك لەایمە مکە چونکە تعصبو نیشتمان پەرستی ایمە زور لەاظهاراتی کاکمان بەرەوژورترە. وحرفیاً ئەو فرمودانەی موافقی أرەزو ونهادی ایمەیە.

محمد دانشور　　　　　　　　عبداللە متینی

## محکمەی علیبگی شیرزادی فیض‌اللەبگی

س-أغای علیبگی شیرزادی-تو درەجەی مایوریت بووە. لباسی افسری خارجەت لەبەرکردوە. بەبی دەستوراتی قانون درەجەت هلگرتوە. تشکیلی حزبت لەدی یەکشەوە کردوە کەملکی خوتە. تو خزمی قاضی محمدی. زور هەولی دلسوزانەت بو داوە. واشتراکی شەری هولەسوت) کردوە. برامبر بەو تهمتانە ولامت چیە.

ج-اصلاً حکومتیکی شرعی وقانونی درەجەی دابو بە من. من لەهەمو اوامریکی دەولەتی بد اطواری ایرانیمستغنی بووم بویە اختیاری ئەو هنگاوی قومیەتەم کردوە. بو پیشرەوتی استقلالی کورد من ئەو لباسانم پوشیبو چونکە لەدەولەتی ایرانا شخصیکی عادی شلاتی لباسی افسری ئەپوشی. بەلام دەولەتی دیمکرات برامبر بەلیوەشانەوە دەرجات ومنسبی دابو من حقی خوم بووە کە بەلباسی افسری دیمکرات مفتخر کراوم. قومی کورد دەمیکبو حقوقی لەلاین خائنان ومرتجعانەوە پایە مال

کرابو. مادام ایمە بوین بەو لاوانەی کەتوانی‌مان ئەو منزەلە دوورودریژەیە طـەی بکـەین حقی خومە بەهەر سزایك کەرەوام ئەبی‌نن. هەتا سزای تالم بدریتەوە لەلاپەرەی میـژودا مرکزی نازداری تر وەراگرم. متأثر نابم بههر جفـایی کـەعقابم بـدەن چونکـە واجبـاتی قومی خوم بەانجام هیناوە. بەدەوامی پیشەوای بەرزی کوردوستان افادەکەم دوایی دینم
علی شیزادی

## محکمەی احمدخانی شجیعی فیضـاللهبگی

س-أغـای احمدخـانی شـجیعی تـو بەچـە هیوایـك لـەهیجانان مقابلـەی نـیروی شاهنشاهیت کردوە. ئەگەر معاونی فرماندەی ئەو جبهەیە بووی بوچـی لباسـی رەسمـی افسریت لەبەرا نەبووە.

ج-اصلاً مـن بو لباس لەبەرکردن اختیـاری خذمـەتی دیمکـراتم نکردبـو. بـەبی‌قید وشـەرت ئـەم ویسـت فداکـاری بـو نیشـتمان بکـەم. لەبـەر ئـەوەی کەدەولـەتی ایـرانم بەدەولەتیکی خائن ازانی. قەرارم دابو هەتا أخر هەناسـم لـەپیناوی دیمکراتـا فداکـاری بـەانجام بگینـم. بـەبی شـەرەفیم ئـەزانی کـەألای أزادی ۹,۵۰۰ ملیـون کـورد بخەمـەوە اسارەتی ئەو دوژمـنانەی کەنازانن معنـای شـەرافەت وتمـدن چیـە. زور بـەو روژە ئـەنازم کەوا مـن لەسەرخذمـت ونیشتمانپەرستی قومی خوم بەتاوانبار دانراوم.

بژی أزادی کورد-بمری دکتاتوری ایرانی

احمد شجیعی

کلتەگەی رشیدخان زادە

## محکمەی حمەأمین‌بگی بابەخان‌بگی فیض‌اللهبگی

س-أغای حمەامین باغلوجە تو بەبی استنادی قانونی أرتشی ایران درجەی کبتـانی دیمکراتت هلگرتبو جلی گاورانت لەبـەرکردبو. ولەشـەری سەردەشـتا اشـتراکی شـەرت کردبو. دو کورت ناردوە بو باتکوبای-روسیا بو تحصیلی روسی.

ج-چونی کورەکانم بو روسیا شتیکی ضروری بو. چونکە وا اعتقاد اکری امـان بتوانن انتقامی خوینی شـهیدانی کـورد لەوخائنانـە وربگـرن کـە بـەبی تـاوان ایمـەیان زندانی کردوە. دوهم استقلال وأزادیش خوشەویستترینی شتە لەجـهانا. مـادام کـورد توانی‌بی‌تی خوی بکا بەخاوەن درەجات ونشان. منیش بەئەوپەڕی فخرەوە هلیان ئەگرم.

وبو اشتراكى هەراى سەردەشتيش واجباتيكى قوميم بەجى هيناوە واتاعەى نظامى سەربازيم كردوە.

محمد فيض‌اللەبگى

بەقەرارى هيئتى دادگاى زەمانى جنگى بوكان ئەو ٦ أغايانە شنقاً قرارى اعداميان بەتصديقى محكمەى تجديدى نظر وارادەى شاهنشاهى گيشت كەلەشەوى ١٥ بهمنى ٣٢٥ دا اعدام بكرين.

جا أغايانى ناوبراو لەروژى ١٣بەهمن ٣٢٥ بەمحافظەى جلاد سرتيپ (لشكرى هينرانە سقز. وعلى‌بگى شيزادى تنها لەبوكان بو صلب گل‌درايەوە وسەرتيپ (لشكرى) كەيكيك بو لداخ دار وژن ومال بەتالانبراوەكانى دەورى حمە رشيدخان لەبانەدا. بو انتقامى ئەو كينەيە داد وطلبى ئەو خذمەتە بوبو كەنهايتى روژى ئەو أغا كوردانە بەدەستى ئەو بى.

جالەشەوى ١٥/١١/١٣٢٥ كەمصادفى ١٣ربيع الاولى ١٣٦٥ھ اكات قرارى صلبيان لەسقز بەو ١١ أغايانە بەتفصيلاتى خوارەوە ابلاغ كرد. وبەحضورى امام جمعهى سقز وصيتى أغايان كرا.

## ١-اعدامكرانى على جوانمردى ورسولى محمودى-(٢)

امام جمعەى سقز-أغاى على جوانمردى لەسەر امرى دەولەتى شاهنشاهى هاتووم پيت رابگەينم تو لگل رسول ئاغاى براتا لەپاش ٢٠ دقيقەى كە صلب اكرين چە وصيتيكتان هيە بيكەن.

على جوانمردى-أغا امام جمعە من ئەو كوژرانەم زور لەو ژيانە بەلاوە باشترە كەزبان وقلەم وحريەتم لەژير پنجەى دەولەتى دكتاتورى ايران اسير كرابى. من زور بەو كوژرانە شانازى ئەكەم كەكلەى من اخريتە بنەرەچەى استقلالى كوردەوە. گيانى كە لەرى ازادى گەلا بخت نكرى ماناى ئەوەيە كەدەورەى زندەگانى نەديوە. بەلام داخى گەرانم بەو مرامە نەگيشتم كەهميشە چاوەروانيم اكرد.

شعر

بەم مەرگە شادم مەرگى مەردانە لەپيناوى كورد كوژران سيرانە

کوردانه

بەلام بەحمە وحسن ورشیدی کورم بلین اگر بویان کرا خوینم وون نەکەن. بەلام رسول أغای برام بی‌گوناهە. چونکە برا بچوکم بووه هرچییکی کەکردبی بقصەی من کردویەتی ده هەزار تومان ئەدەم کەرسول أغا نەکوژن. خوا هلناگری حقی کوشتنی نیه

رسول أغا- کاکە چە وەختی ئەو قصانەیە تو ئەتەوی بەناوی کی پر لەشەرافەتەوە ئەو جهانە خوێرییە بەجی‌بیلی. ومنیش لەبەرچنگی دەولەتیکی بی شرافەت بەجی بیلی کەپیم بلین أغای سەرجوخه شعبانت کوشتوه.

نا نا أغا شتی وامفرمو بو خزمتکاری ئەو مسافەرەتت منت لازمە لەزندەگانیدا هەربەیکەوە بوین با لەو دونیاشا لیك‌هەڵنەبڕین. نازانم چون دلت بڕوایی ئەدا کەلەو شایی وزەماوندی شرافتی میژوی کوردا من بی‌بەش بکەیت. نا نا أغای امام جمعە گوی مدە فرمودەکانی أغا. بەلام ئەو وصیەتەی منە بەسلطەی تنفیذیەی ئەو حکم رابگەینە. کەمن لەپیش جنابی علی أغادا بکوژن باچاوم بەمەرگی أغا نەکەوی. با أغا بزانی کە لەمیدانی گیانکیشان وروح فداکردنی قەوما لاویکی بەجەرگ وبلیمەتبووم. -٢-بەحمە وهمزە وبایزی-کوریشم رابگەینە کەقەت ژیان وزندەگانی بەسەر شوری‌یان نەوی. بلکو کوششی ئەوەبکەن کەتولەی مامە وباوکیان لەو دوژمنانە بکەنەوە. کەئەوان‌یان بی‌مامە وباوك کردوه.

شعر

| | |
|---|---|
| ئەو روژە خوشە لەداری أزاد | بدریم بی‌بی‌نن ناحەز ودوژمن |
| بلین ئەو کوردەی لەری أزادی | گیانی بخشیوه بەجەنّەتبو شاد |

أغایانی احمدخان وهاوبیرانی فیض‌اللەبگی- منو کاکەم وائەروین بو پای دار. گردن‌مان ازاد بکەن. خوا حافظ-خواتان لگل.

ساعەت ٦/٣٠ شەوی ١٥/١١/٣٢٥ بژی أزادی بژی أزادی

**اعدامی احمدخانی فاروقی ژماره (٣) رئیس عشیرەتی فیض‌اللەبگی**

امام جمعە-أغای احمدخانی سالار تو امشەو لگل عبدالله خان رحمەخانی براتا اعدام اکرین چە وصیتیك‌تان هیە بیکەن بوتان ئەگەینم.

احمدخان-من هیچ وصیتیکی أوام نیه کەداوای روعفەتی دەولەتی ایرانی مرتجع بکەم. بەلام بەدەولەتی کونەپەرستی ایران رابگەینە کەخوینی ایمە لەلاین لاوانی کورد وون ناکری. خوینڕژانی ایمە ئەچیتە قالبیکی أوا گرنگی سیاسیەوە. هیچ امید ناکری کەچارەی ئەو پرشنگانە بکری کەوەکو بنزین وأگر ئەکەویتە ناو لاشەی ملەتی فارس زمانەوە.

قەی ناکا ایمە کە۳ سی براین واخوینی خومان بە ۹,۵۰۰ملیون کورد بخشی. البتە لاوانی کوردیش دارای ئەوندە غیرەتو شرافتەن کەیك بەهەزار خوینی ئەو دوژمنانە بریژن کەحقی ایمەیان بەسەرەوە هیە.

اگر ایرانی مرتجع لای وابی بەکوژرانی ایمە قضایای أزادی واستقلالی کورد دائەمرکیتەوە ئەوە شتیکی تینەگیشتو وچەوتانەیە. بەحمە رضای نەهاد بد رابگەینە امرو ئەوەلی شورش وأژاوەی ایرانە وبەکوشتنی ایمە بروزە ئەستینی واگر مەرامیشی بەانجام هینانی غرضیکی شخصیە ایمە أثاریکی أوامان دانەناوە کە بەکوژرانی ایمە کوتاهی بیت. چونکە هەمو نفریکی کورد لەایمە زیاتر امادەی فداکاری بو لەناوبردنی پایەداری محمد رضای دکتاتور ونظامی فاسدی ایرانە انکار ناکری هەتا ایستا یك سەرلشکر ویك سرهنگ و۳سی سەرگورد و۱۲ سروان و۹٦ نفری سەربازی خاصی فارس زبانم کوشتوە. هەرچند کەئەو کوشتارە برامبر بەخوینی منو براکانم شتیکی بیقیمتە.

بەلام بو اثباتی گیان پاکی وتقدیسی شهادەت ئەو کردەوەیەم بوتە گەواهی ئەوەی کە بەپی تەوانام لەدەوری ژیانما واجباتی ملی خوم بەانجام هیناوە. وگلەی برایانی کوردودایکی نیشتمانم بەسەرخومەوە نەهیشتوە. من لەپیش عبداللە وحمەی براما بەرن بو پای دار. باچاوم بەمەرگی ئەمان نکەوی.

| | |
|---|---|
| ئەوا لەسەر تو ئەمبەن بو پای دار | دایکی شیرینم نیشتمانی نازدار |
| لەجیاتی گریانو شین روڵە رو | قبرم داپوشە بەغونچەی گلنار |

## عبداللە خانی متین فیض‌اللەبگی ژمارە (٤)

أغای امام جمعە بەدەولەتی خونخواری ایران رابگەینە. بەرخی نیر بو سەربڕین باشە نەك بو خەوتن. دایکی نیشتمانی کوردم بو سەربڕین منی هیناوەتە وجود. ئەمە واجباتیکی پیروزی خومە بەانجامی ئەگەینم کەوا بەشادی وسەربەرزیەوە ئەچم بو بەر ئەو دارە کەپی‌الین داری استقلال. وامەزانن کەبو بجی هشتنی مالو منال بەپەروشم. چونکە ناویکی پاکی بقام أواڵە لەو سفرەما. ومژدە بەدەولەتی فاشزمی متفسّخی

ایران رابگەینە کەخوینی ایمە ئەبی بەلافاویك کە کاخی مرمری وسرایچەی سعدأبادی کونەپەرستی حمە رضای بدا اطواری پیلەناو بچی.

شعر

ئەو روژە چە خوشە کەسەرم بەرز وبلند جیم
کورسیو سەری سەربازی عجەم کەوتوتە ژیر پیم

## حمەخانی دانشوەر فیض‌اللەبگی ژمارە (٥)

أغای امام جمعە وصیتی من هەر ئەوەیە دایك مان لەدیهاتی (قیلسون وداش أغلوجە وألکەلو-وە بو دیدەنی ایمە هاتوە بو سقز. ئەگەر اکری بومان بانگ بکەن چاویك‌مان پی بکەوی. چونکە ایمە ئەروین بو سفریکی زور دور. با دایکمان بزانی کەدەولەتی ایران بەکوژرانی ایمە. فکری دامزرانەوە وتشکیلاتی ایرانی هیە. بادایکمان ئەوە بزانی کەکلّەی کورەکانی ئەکەن بەخشتی بنای أزادی کورد.

بادایکم بەخانمە خوشەویستەکەم رابگەینی ئەوا من ئەوم بەجی‌هیشت بنا بەو خوشەویستنەی کەبومانە. کورە بچکولانکەی بەو تەرزە تربیە بدات کەبەشەرافەتی باوك وباپیرانیەوە ئەویش بی‌تە ژیر خاك.

شعر

منصوروار اگرم ببرند بەپای دار مردانەجان دهم کەجهان پایەدار نیت

بر ایانی فیض‌اللەبگی گەردن‌مان ازا بکە ئەوا سعات ٧,٣٠ شەوە ئەمان بەن بو پای‌دار. بژی أزادی بژی کوردوستان وسەربەخویی

احمدخانی کوری خلیل‌خانی فیض‌اللەبگی بو. منتهای درجە خوینەدوار وزمان شیرین روخوش بالابەرز رنگ اسمر أزاو هلکەوتوی ئەو عشیرەتەبو. عمری لەدەورەی ٤٥ سالانا بو.لەدی قیلسون منطقەی سقز دائەنیشت. عبداللەخان عمری ٣٥ سال ومحمدخان ٣٠ سالان بو. عبداللەخان لەدی ألکەلو وحمەخان لەدی دا شالوجەی سقز دائەنیشتن. احمدخان زور جوان وسوارچاك بو لەدرەجەی سخاوەتیشا بەوحدەی قیاس

دائەنرا زور بەثبات واقدام بو. همیشە برامبر بەدەولەتی ایران تمردی اکرد. هەتا باوکیشی لەزمانی شیخ عبداللە شمزینان اشتراکی ئەو حرەکاتەی کرد بو لە ١٨٨١دا. رەویەی قومیەت لەناو ئەو فامیلەدا شتیکی وەراثی بو لەقضیەی شەهریوەرا التحاقی بەحمە رشیدخان کردبو. اکثری پیشرەوتی لشکر کشیەکەی حمە رشیدخان لەایرانا بەهوی ئەمەوە پیکهاتبو.

مدەتیك لەدەوری حمە رشیدخانا کرا بەحاکمی سقز. کەتشکیلاتی سقز کرایوە هاتە بانە. کەبانە سوتا لگل حمە رشیدخانا چو بو عراق. ولەدوای سالیك چووە بو منطقەی بوکان لەدی تورکمانکندی دانیشت. ودوایی لەزمانی قاضی محمدا کرا بەمعاونی جنگی حمە رشیدخان. کەحمە رشیدخان گرایەوە بو عراق بەمالەوە چو بو سابلاغ. لەوی کرا بەاندامی انجمنی ایالتی. کەشەری هەوشار وایران وقاضی محمد دەستی پیکرا. کرا بەفرماندەی لشکری سابلاغ لە هولسودا-لەشکستی دیمکراتا لەسەر اعتمادی ایرانیەکان بو بەمأموری اسلحەچنی هەتا ساتی گیرانی لەبەرچاوی ایرانیەکان پایەیکی زور بەکلك وبەرزبو بو خانوی أزادیخواهان.

حکومەتی ایران اکثری اژاوەی ایرانی ئەو ناوچەیان بەتحریکاتی احمدخان ازانی ودەمیك بو لی بداخبون هەتا ئەو فرصتەیان بو هلکەوت. شەوی ناوبراو لگل هەردو برایا خنکاندراو گیانی پاکی خرایە باوەشی فرشتەی أزادی خواهی فرشتەی سەرپەرشتی گیانی شهیدانی نیشتمان خواهی.

انجا بەیانی جنازەی ئەو ٣سی رولە قارەمانانەیا فریدایە بەردەمی دایکیان (......) ئەو دایکە غیرەتدارە هیچ بویان نەگریا. هەر ئەوندەی گوت (رولەکانم دەولەتی ایران زور لیتان ئەترسا بویە أوا جەرگی منی بو ایوە سوتاند. بوتان ناگریم چونکە بو من جیگای فخرن مادام ایوە رۆلەیك بون لەپیناوی گەلا کوژران. حقوایە بەمەرگی ایوە شادمان ببم چونکە بەهوی ئەو گیانە پر صلابەتەتانەوە خوتان کردوە بەخاوەنی شەرەف وأثار لەمیژودا. منیش دیم بو لاتان لەو زووانە انشاالله لەخانوی بقای بەقیمتا بەیکەوە شاد ئەبینەوە.

ئەو پیریژنە هەژارە تقریبی سعاتو نیویك بی هوش کەوت. کاتی وەهوش هاتوە کورەکانی دفن کراون. هەر بەو گرۆتاوەوە چو بو سەر قبرەکانیان وگوریچەکانی بەگونبر هلبستن.

## احمدخانی رشیدخانی شجیعی فیض‌الله‌بگی ژماره(٦)

أغای احمدخانی شجیعی تو امشو سعات ٧,٢٠ دقیقه اعدام اکری وصیت بکە أغای امام جمعه تنها ووصیتی من ئەوەیە کە بەفامیلی فیض‌الله‌بگی وخزمو اتباعی من رابگەینن. کەهەتا أخر کروکچ یان لەپیناوی أزادی کوردا خویان بەکوشت بدەن. وقبولی ژیر چنگی ناحەزان نەکەن. چونکە غصبی حریەت لەهەمو مردنیك ناخوشترە. من ئەو اعدامە بەجیگای تأثر نازانم. چونکە لەمستقبلی خوم امینم کەجوانانی کورد یەك بەهەزار انتقامی ایمە لەفارسە خوین خورە پیسەکان ئەستینوە. بەلام ئەوەی کەاسبابی تأثری من بی ئەوەیە کەمن ئەوندە ژیام بەچاوی خوم ئەو فارسە بد کردەوانە لەژیر چکمەی لاوانی کوردا ببینم.

بە علی کورم رابگەینە ئەگەر زۆلەی من بی ئەبی ئەو رەویەیە بگری کە من گرتبوم رەویەی فارسی دکتاتوری کوشتن. رەویەی أزادی پەرستی وخو خستنە بارمتەی سەربەخویەتیەوە.

شعر

ئەچم بو محشری کوردان بەروسوری وشەرافەتمند
نشانەم تەوقی گردنمە لگەل دودەستو پی پی‌وند

بر ایانی فیض‌الله‌بگی ئەوا من ئەروم بو پای دار اگەر ایوە مان بەوساتەوە یادم بکەن. احمدخان کوری رشیدخانی تورکمانکندی بو لەناو فامیلی فیض‌الله‌بگیدا زور هەلکوتو بو. مشهور بو بەسخی طبع وروخوش وجفەنگ باز. زمانی روسی. فارسی- تورکی کوردی زورباش ئەزانی. خویندەواریکی لایق بو. لەدی کلتەگەی بوکان دائەنیشت لەقضیەی شهریورا لگەل احمدخانی سالارا اشتراکی حرەکاتی حمە رشیدخانی کردبو.

بەلام لەبەرئەوەی کەخزم بەقاضی محمد بو لەأشکرابونی قاضی محمد بای دایەوە لای قاضی محمد. لگەل عزیزخانی یاسیکندا. بەدەستووری روسەکان حزبیکی شیوعی‌یان لەو ناوچەیدا کردبووە. بەلام لەبەر بی مقتضای وخت ئەو حزبە لەپاش بینیك لەلاین قاضی محمد وروسەکانەوە داخرا. لەحرەکاتی هیجانانیشا وکیلی

احمدخانی فاروقی بو. شریکی زور مردانەی لگل ایرانیەکانا کردبو. ئەگەر ئەو روژە ئەو أغایە سەرپەرشتی لشکری فیض‌اللەبگی نەکردایە عیلی فیض‌اللەبگی زور بەپیسی شکستیان هینابو. نەیان ئەتوانی احرازی ئەو مقابلیەتە بکەن کە کردبویان. ئەو أغایە لەتەمنی ٤٥ سالیدا اعدام کرا. بەاعدام کرانی ئەو محمودخانی برای بەرەلا کرا.

## محمدبگی بابەخان فیض‌اللەبگی (٧)

امام جمعە-أغای محمدبگ. تو امشەو سعات ٧,٤٠ دقیقە صلب اکری وصیت بکە.
أغای امام جمعە – وصیت هەر ئەوەیە کەمن لسەر نخشەیەکی شەریفی کورد اکوژریم (سازمانی طبیعەت منی بو زندەگانی (شرب الیهود) نهیناوەتە وجود. بلکو من بو خذمەتی نیشتمان وبەرزکردنەوەی گل أفریدە کردوە نسبتاً ئەوا من واجباتی خوم بەانجام هیناوە. واجباتەکەشم ئەوەیە لەدوای چند دقیقەیکی‌تر خوم ئەکەم بەقوربانی لەژیر پی لاوانی کوردا. خوم ئەکەم بەشاهدی ئەوەی کە کورد مغدورترینی هەمو هوزیکی جهانە کوژرانی من ئەبی‌تە شاهدی ئەوەی کەمستوای قابلیەتی کورد گیشتوتە اندازەیك چیتر ژیر چەپوکی ناحەزانی پی قبول نکری.

شعر

بم بەن بو پایەدار داری استقلال بمکەن بەشاهد بو کوردی بی حال

أغایان بەخواتان اسپیرم من ئەوا برام بو داری ازادی. ایوە ونیشتمان خوش

حمە بگ لەعمری ٤٠ سالیدا شهید کرا. ئەو أغایە لەعشیرەتی فیض‌اللەبگی بو. لە قارەوای بوکان دائەنیشت. زور خویندەواربو فارسی تورکی کوردی زور بەباشی ئەزانی. بالابەرزیکی زور شیك وریك بو. لەقضیەی شەریوەرا اشتراکی حمە رشیدخانی کردبو. لەو أخرەشەوە لەلاین قاضی محمدەوە دەرەجەی کبتانی درابویی. هەتای نهایەت لەجبهەی سقز وسەردەشتا بەو پیشمرگە خصوصیانەی خویەوە اشتراکی جنگی لگل ایرانیەکانا کردبو. دو کوری بو تحصیل ناردبو بو باتکویە بو تحصیلی أدابی روسی. بەلام لەدوای کوژرانی باوکیان کورەکان هاتنەوە بو ایران. بو سەرپەرشتی دایك ومنالە وردە بی‌کسەکانیان.

## علی خانی سرتیپی قلندر ملقب -به کوری- فیض‌الله‌بگی (٨)

امام جمعه- أغای علی‌خان تو ئەمشەو اعدام اکری وصیتت چیه بیلی أغای امام جمعه- بەدەولەتی مرتجعی ایران رابگەینه. بەکوژرانی من تسکینی وضعیتی ایران ناکری. ایرانی متفسّخ ئەوەلی شورش وانقلابیەتی. خوینی ایمه پەژاوەیکه بو تشجیعی گنجه غیرەتدارەکانمان. چونکه قضیەی کورد بوته باسیکی جهانی. وکورد جاریکی‌تر ناتوانی اعتماد بخاتەوه سەر فارسه بداطوارەکان ورزقومالی خویان چیکه درخواردی ئەو حکومته خائنەیه بدەن. هەتا قراری أزادی بو کورد امضاً نکری هەزارانی وەك من حاضرن کەبەو رەوی‌یه خویان فدای بەرزی نیشتمانی کورد بکەن. أزادی‌خواهی کورد بەکوژرانی من تەواو نابی چونکه من هەرواجباتی خوم بەانجام هیناوه ٩,٥٠٠ ملیون کورد ماوه کەئەو واجباتەی لی امیدبکری. بەشای مرتجعی بدنهادت رابگەینه. ئەبی کورد لەایران جیا بکریتەوه. چونکه کورد چیکه بەژیرچەپوکی ناژی. عزەتی نفسی کورد چیکه قبولی استعماری ناکا بەری ایرانی مرتجع بژی کوردوستانی نازدارم.

شعر

من لەکوشتن کەی ئەترسم لافی قەومی لی‌ئەدەم
کەی کوڕی کوردم لەپیناوی وطەن گەر گیان نەدەم

برایانی زندانی سعات ٨ شەوه من ئەوا ئەروم بو سەر قەنارەی دوژمن گردنم أزاد بکەن کوردو کوردوستان خوش.

## حسن خانی جلالی بەگ فیض‌الله‌بگی (٩)

امام جمعه-أغای حسن خان متأسفانه عرضت ئەکەم امشەو ساعت ٨,٣٠ صلب اکری وصیتتان چیه بەانجامی ئەگەینم.

أغای امام جمعه نا نا متأسف مبه. من بو جیگایی ناچم کەمستقبلم تاریك بی وتأسفم بو بخری. پاشەروژی من لەقیدی کوردا بە ٣سی شت نوسراوەتەوه أزایی- راستی-ثبات- بەو ٣سی تیرانه لەمیدانی أزادی کوردا جنگاوم اگر هەدەفە پیسەکانی ایرانی بوگەنم بەو تیرانه پیکابایه نەئەکوژرام مانای کوشتنم شاهدی ئەوەیه کەلەری

أزادیخواهیدا دەستی خوم وەشاندوە بەافسرە پیسەکانی ایرانـی رابگەینـە ئـەوان امـرو بەلاشە هلاوەسراوەکەی من پی‌ئەکـەنن هینـدەی پینـاچی کـەلاوانی خویـن گـرم وتولـە استینی کوردیشم بەکلاکە بوگمنەکەی ئەمان بازی ئەکەن بەتنافی انتقامـەوە لەکوشـتن ناترسیم چونکە لاوانی کورد خوینم وون ناکەن. أی چند خوشە کە بەکوژرانی من پیران وگنجـانی ولات تـأمینی ژیـان وسـەربەخویەتیان بکـری ئـەو کوچـەم بـەکوچیکی شرافەت‌مـندانە ئەزانم. چونکە ناو وشەرەفیکی گەورەم لەدواوەیە.

شعر

سەری لەسەر کورد بەدارا نکری	حیفە بەرۆلەی کوردان ناوبری

برایانی زندانی خوا حافظ ئەوا من رویشتم بو پای دار ایوە ونیشتمان‌خوش.

## شیخ صدیقی اسعدی (١٠) یازی بلاغی سقز

امـام جمعە-أغـای صدیقی اسعدی-زور بەپەروشم بو ئەمانت چونکە امشەو ساعەت ٩ لەدارئەدری وصیت بکە هەتا بوت بەانجام بەگینم.

شیخ صدیق-أغای امام جمعە-راسپاردەی من هـەر ئەوەیـە کەبەناویکی شـەرەفەوە ئەروم بو لای خوا وبەکفنی خویناویمەوە مغدوریـەتی کـورد عرضـی بارەگـای بـەرزی خداوندی ئەکەم. وپی ئەلیم غایە لەدروسـتکردنی کـورد چی‌بـووە. کەئـەم هـوزە جوانـە لەهەمولایکـەوە وکـو حیـوان خراونەتـە بەردەسـتی ناحەزانـەوە. تـاقم بـەتاقم لەهــەمو لایکەوە لەری أزادی خواهیدا سەرئەبرێن. وخوم ئەکەم بەنمونـەی مسـال بـو ئـەو کـوردە سەربڕاوانە. وبەکفنی سورمەوە لەموزێخانەی أزادیخواهیدا داوایەکەم اپبات ئەکەم.

من بەو مردنە زور مسرورم. بەطبیعەت هەر ئەمردم ممکن بو ئەگەر وها نـەمردبام لەپەنایکی چەپەکی بی‌ناویدا بەگوللەیکی ویلّ لەناوچوبام. بـەلام خوشـبختانە کـەامرو بەعظمت واحتشامیکی هـەرە بـەرزەوە بـەرز ئەبمەوە وئـەو چونـە سـەر سیدارەیەم بـو ئەبی‌تە شاهدی ئەوەی کەلەری أزادیخواهیدا ئـەو فیضـەم چنـگ کـەوتووە. بی‌گومـان ئەو تنافەی کەئەمشەو ئەخریتە ملی‌منەوە. لەدوای چنـد سـالیکی‌کە گـەورە کچـەکانی کـورد (بـو رمـزی شـەرەف) وشـعاری خنکـاندنی أزادیخواهـانی کـورد میخکبنـد وبەروبەرمور بەو دەستوری تەنافەی ملمان دروست بکەن. بوبەزمی دلداری بی‌خنە ملی خویانەوە.

شيعر

لەسيلەی پنجره اهلی سقز سيری جنازەم كەن

جلوسی پادشای كورده كەئيمە بوينە قوربانی

برايانی زندانی خواتان لگل سعات ٩يە ئەوا من ئەبەن بو سەرداری سياسەت. ايوە ونيشتمان‌خوش.

## شيخ امين اسعدی-كەس‌نەزانی سەرشيو (١١)

امام جمعه-أغايای شيخ امين اسعدی امشەو سعات ٩,٣٠ صلب اكری وصيت بكە بوت ئەگەينم-

مايور شيخ امين اسعدی-اصلاً من كورم نيە كەوصيتيان بو بنيرمەوە تنها دوكچی بچكولانەم هيە كەهتيو بكەون وجيگای مراقی بی. ئەمانيش هتيو ناكەون چونكە ٩,٥٠٠ مليون كورد پشتيوانيانە. وخوشيان تا اندازەيك لەدی كەسنەزان خاوەنی ملكن. بەلام تو بەدەولەتی خوينخواری مرتجعی ايران رابگەينە كەمن خوم بەقارەمانی كورد ئەزانم مادامیكی واجباتی ملّی خوم بەانجام هيناوە. ئەو تنافەی كەئەمشەو اكريتە ملمەوە. ئەوا لەجياتی اجری شيری دايك. دايكی نيشتمان لی قبول كردم. ئەو تنافە ساموتاسی لەدلی ئەو گنجانە لابرد كەلەبەرترسی ئەو تنافە پرهيزيان لە پركيشی هينتی ايرانی كوشتن ئەكرد. فرشتەی گيان كيشانم البتە امشەو ئەو گيانە پاكەی من بو شكايەتی مغدوری كورد ئەبەنە لای باری تعالی‌وە هيچ گومان نيە كەاشلين. ئەو كوردە فداكارە. بەاختياری خوی تسليمی نفسی بەحكومەتی مرتجعی ايران نكردوە. وغفلتاً لەلاين أغاصالحی سگانپناە وشيخ اسعد وحاجی شيخ عبدالحميدی كەس‌نەزانەوە دەردەست وتسليمی افسرانی دكتاتوری ايرانی كراوە. بو ئەوەی كەبەم جورە لەداری رسوائی ايرانی بدەن. بەری نيروی ظالمی ايران. وەرگەری دەرباری شاهنشاهی مرتجع

شعر

زەماوند و خنەبندانە ئەی دايكی وطەن ئەمشەو

بەخوينی رولەكانت سوراكەی پنجە ودهنی امشەو

أی-جاخو نازانم من خوا حافظی لەکی بکەم خو براکانم هەمویان شهید کراون زندان چول بووه. أخ بوچی منیان پاش هەمو براکانم خستوه. أی کەس گوی لەدنگم نیە

فرشتەی کردەوەکانم-خوات لەگەل

## شهیدکرانی علی‌بگی شیرزادی فیض‌اللەبگی لەبوکان (۱۲)

ملا عصام‌الدین لەبوکان-أغای علی بگی شیرزادی بەنهایەتی تأثرەوە پیت رائەگەینم. امشەو أوالەکانت هەمویان لسقز خنکاون توش امشەو سعات ۱۰ صلب اکری وصیتت چیە بیفرمو هەتاوەکو پیت پیت بەخوین گرەکانتی رابگەینم.

علی بگی شیرزادی-چون چون من اعدام اکریم.

ملا عصام الدین-بەلّی بەلّی

علی بگی شیرزاد-فرموت احمد خانو هەمو أغایان اعدام کراون.

ملا عصام الدین-بەلّی بەلّی

علی بگی شیرزادی-بەخوا حیف وخابنیکی زور بو ئەو شورەسوارانە بو ئەوقارەمان ودلیرەلیدەرانە. جاماموستا گیان لەدوای نەمانی ئەو لاوانە من ژیانم بو چیە وژیان بەچە کلکیکی من دی.

مامۆستا پلەبکە کەزو منیش بەرن بو ئەو دارەی کەاحمدخانی پی‌خنکاوە ژیانیکی أوا ذلیلو بی‌دەسەلاتانە ئەوندە ناهینی کەانسان تأسف بو فەناو نەمانی بخوا. زور بەو روژە ئەنازم کە لەکوچی ئەو برایانەم هەل نەبڕاوم. هەروکو لەجهانا أموزابوین. وا لەقیامەتیشا هەروا پشتیوانی یکترین وبەیك تناف وبو یك بیر وبەیك شەو لەناوچوین.

ماموستا گیان خواحافظ- کور کوردوستان خوش-

شعر

بەڕیسمانی نەزانن طوقی فخرە چوتە گەردن‌مان

وطەن فرمویە ئەم ئەمرە ارادەی ئەولسەر سەرمان

جالە شەوی ۱۵/ بهمنی ۳۲۵ ئەو ۱۲ أغایانە لەلاین جلاد (الشکری) لەسقز وبوکان اعدام کران. قضیەی أزادی‌خواهی تشکیلاتی قاضی محمد بەوخوین کاریە دوایی هات. داری سیاسەت بەوپی‌یە ئەو أزادی‌خواهانە بداری دەولەتی مرتجعی فاسدی

ایران لەداردا. ومنیش هەر ئەوندەم لەدەست دی کەبەو قلمەی پر لەفرمیسکی زاری ئەو معرەضە خوی‌نینە. هاوار وشیوەنی خوم بەپیشگای بارەگاهی خوای بی‌هاوتا رابگەینم. کە تاکەی ئەو ملّتە زوردارە خوین‌خورانە سەرەوبن ناکەی. کەوا هیچ شەرم وحیا ناکەن لەبەرچاوی تو وبەاتکی اوامری عدل وانصافی-بلاوکراوەی جل جلالە- لگل ئەو کوردە هەژارەدا ئەو وینە کردارە بی مروەتانە ئەهینّەرو وەهەر بەتەرزی زندەگانی حیوانی لگل ئەوکومەلە بی تاوانەدا ئەجولینەوە. خوای بەرزی یگانە بەهەمو معنایکەوە چاوت لەکردەوەی ئەو خائنانە بو کەبەچە وینەیك ئەو أزادی خواهانەیان لەسەر حقیکی شەرعی وقانونی بەو حقارەتیە لەناوبرد.

جاکەی تختوبختی ئەو زوردارانە بەلافاوی غضبی خوت لەناو ئەبەی وکەی انتقامی خوینی ئەو شهیدانە لەو ریگرو گیرفان برّانە استینی کەلەپیناوی شەریعەت وانظمەی عالمیدا پەلاماری سلبی سەربەستی ئەو کوردە هەژارانە ئەدەن کەلەهەمو لایکەوە مستحقی چاکە وپیشخستنن.

برایە شهیدکراوەکانم بەخواتان ئەسپیرم. بەناویکی بەرز وشەرافەتەوە ئەو جهانە پر افسونەتان بەجی‌هیشت کە بەهەزاران افسوس امرو بوتان پشیمان بوتەوە. ایوە واجباتی ملی خوتان بەانجام گیاند. بەژیانیکی دلیرانەی سەربەستی ژیان وبەکوچیکی قارەمانانەش کوچتان کرد.

نا نا نەکوژراون هەر زندو ولەبەر دلانن. ایمەش بەهەمو لایکمانەوە. ئەو رەوی‌یە جوانەی ایوە أگاداری اکەین. هەتا خوینی ایوە لەناحەزانی نیشتمان نەستینین أرام ناگرین. ایمەش دی‌ین بولای ایوە چونك جیگایکی بەرزی میژوتان چنگ کەوتووە. هەمو کوردیك لەمولا ئەیەوی بەو شەرەف ومرکزە شادمان ببی. ایوە زور بەپاکی ومردی ژیان. وزور بەجەرگ وأزایش لەناوچون. لەچاکەی ئەو هنگاوە بەرزەتان. داوای شادبون‌تان ئەکەم لەبهشتی شهیدانا. داوای اگاداری وپاریزگاری‌تان لەفرشتەی هاورازی نیشتمان وأزادی پرستی ئەو کوردوستانە ئخشینە ئەکەم. وبەبراوەشی خاوینی ئەو نیشتمانە سازگار ونازدارەتان ئەبخشم هاوبیرە پیشکەوتو وسەربەرزەکانی أزادی‌پەرستم.

منگوری

دانەر

فصلی (١٠)

# *نتیجەی قراردادەی نەوتی ایران وروس
# *وخسارەتی کورد لەریگای ازادیخواهیدا
# *علاقەی قاضی محمد وحکومەتەکەی لگل عراق

لەپاش استقراری امنیەت لەهەمو منطقەیکی ایرانەوە انتخاباتی دەورەی ١٥هەم دەستپیکرا. لە٢٥ مانگی تیری ١٣٢٦ کەمصادفی تموزی ٩٤٧ اکات مجلسی ١٥هەمی پرلمانی ایران کوبووە لەأبانماە ٣٢٦دا. لایحەی نەوتی (سادچیکوفی) روس سفیری شورەوی خرایە لیژنەی پەرلمانەوە.

بە١٠٤رئی مخالف و٢ رئی موافق کەنەوت بدری بەشورەوی لایحەی ناوبراو رفض کرا.

لەجیاتی ئەوەی کەنەوت بدەن بەروس. قانونیکیان خستە مجلسەوە وبەاتفاقی أرا قبولیان کرد. کەدەولەتی ایران مکائن وادەواتی پیویستە لەامریکا بکری وبەشرکەتیکی ایرانی بسپیری. کەلەداخلی ایرانا ئەو شرکەتە نەوتی شمال دەربینی. وبەأزادانە بیفروشی لەبازاری عالمیدا. وئەو شرکەتەش لەدوای پینج سالیتر دەست بکات بەایشکردن. انجا بەتعریفی خوارەوە سفارەتی شورەوی انذاری حکومەتی ایرانی کرد. وداخی ئەو هەمو تەپوتوزەی کەبو نەوتی ایرانی نابووە. بەو چند کلیمەیە هەلرشت.

سفیری کبیری دەولەتی شاهنشاهی ایران

١-برخلافی قراردادی أوریل ٩٤٦ معاملەتان لگل دەولەتی جماهیری اتحادی شورەوی کردوە. حقوابو لەپاش ٧ مانگ لایحەی نەوت تقدیم بەلیژنەی پرلەمان بکەن. بەپیچەوانە لەپاش ١٥ مانگ لایحەی نەوتتان دا بەشورای ایران. و لەپاش ١٢ مانگ دەستتان دایە شورا کوکردنەوە.

٢-ئەو اتفاقە شکلیکی نهائی ورگرتبو چونکە لەلاین رئیس الوزراوە امضا کرابو وبەنظری شاش گیشتبو.

٢٩/أبان/٣٢٦ سفیری اتحادی جماهیری شوروی

سفیری کبیری جماهیری اتحادی شوروی سوسیالیستی

١-امتيازى نەوت خارجى صلاحيەتى شخصى رئيس الوزرايە. چونكە لەقانونى ايرانا رئيس الوزرا تنها اتوانى ريگاى اتفاق وقرارداد امضا بكات. بەلام او اتفاق وقراردادەيە ئەبى بەرئى مجلس خاتمە بدرى هەرگاه مجلس بو ئەو اتفاقە موافق نەبى. ئەو قراردادەيە حائزى قيمتيك نابى لەموافقەت نكردنى مجلسا بودانى نەوت بو جماهيرى شورەوى.من مقصر نيم چونكە من واجباتى خوم پيك هيناوە بەلام مجلس لى قبول نەكردوم

٢-بو تأخيربونى كوبونەوەى مجلس. لەبەرئەوەى كەوضعيتى داخلى ايران استقرارى نگرتبو. هەتا ئەو تأريخە بومان نكرا مجلس كوبكينەوە.

٣-ايمە اتوانين لەپاش دەرهينانى نەوت بەهوى شركەتيكى اهلى ايرانەوە. نەوتتان پى بفروشين.

٤-روحى برادەرى ومسالمەتى هامجواريش ئەوەيە دەولەتيكى گەورەى وكو اتحادى جماهيرى شورەوى غدەر لەملەتيكى هەژارى بچكولانەى وەكو ايمە نكات. چونكە ايمە هميشە أمادەى اقداماتى برادرى وژيانى هاوسايە ودراوسيەتين.

٣٠أبانى١٣٢٦ احمد قوام

نخست وزير ايران

اجا بو ئەوەى كەايران لەهلمەتى روس محافظە بكرى. امريكا دەستەبەربو كە ١٠٠مليون دولار بەقرض بدا بەايران بەمدەى ٢٣ سال. بەشەرتى ئەو پارەيە لەژير نظارەتى امريكادا صرفى مشروعى انسانى بكرى ولشكر وپوليسى ايرانيش بخريتە ژير تربيەى چند فرماندەيكى امريكانى وبەتجهيزاتى جنگى امريكاش تجهيز بكرين. بەلام هەتا ايستا ئەو دو قراردادەيە بعواملى ظواهر لەترسى حملەى روسەكان تطبيق نكراوە. الاّ خريدى هيندى اسلحەى جنگى ومكائنى زراعى نەبيت چونكە روسەكان لە ٢١ فوريەى سالى ١٩٢١دا اتفاقيكيان لگەل حكومەتى ايرانا بستوە. هەرگاە حكومەتيكى بيگانە پى نايە اراضى ايرانەوە بەشەرتى مصلحەتى روسى تيا نهيتە وجودەوە. بو روس جائز بى كەئەويش داخلى ايران ببيت.

جالەترسى ئەو اتفاقنامەيە هەتا ايستا ايران نەيتوانيوە. لەحدى رغبەتى روسەكان لابدا. ويەتەواوى دەستى مساعدات بو هيچ خاريجەيك دريژبكات. جا

لەبەرئەوە زور قضایای مهمّی ایران هیە کەبرامبر بەو اتفاقە لەژیر تەهدیدی روس‌دا ماوەتەوە.

بو توازنی نخشەی سیاسی بەتأریخ ١٩ مانگی دی ١٣٢٦ قوامی زورزان استقالەی کرد. ولەجیگای ئەو حیکم الملك أغای کشاوەرزی-بوبەرئیس الوزرای ایران. وقوامیش بەتهمتی خیانەتی شعب مدەتیك فرێدرایە ولاتانی امریکا وسویز وسویسرە وبەتأریخ ١٠ بەهمن٣٢٦ کەمصادفی ٣١ ژنویە ١٩٤٧ اکات سفارەتی روسیا خطاب بەسفارەتی ایران ئەو یادداشتەی گیاند.

## یادداشتی روسیا بەایران

حضرەتی اشرف أغای حکیم الملك رئیس الوزرای ایران

جنابی‌أغای رئیس الوزرا بنا بەدەستوری دەولەتی شورەوی موضوعی خوارەوەتان عرض اکری.

١-وەکو بیستراوە دولەتی ایران بتأریخ ١٦ اکتوبر ٩٤٧ لگل دەولەتی امریکا موافقەتنامەیکی امضا کردوە. بو تنظیم‌کردنی هیئتیکی نظامی بو همکاری لگل وزارەتی جنگی ایرانا بو تقویە وتربیەکردنی قشونی ایرانی. لەموافقەتنامەی ناوبراوا دەرکەوتووە. کەئەو هیئتی نظامی امریکایە تداخل بەهەمو عملیاتی وزارەتی جنگ وقوات وتأسیساتی جنگی ایران اکا نظر بەعملیاتی وزارەتی جنگ وقوات وتأسیساتی جنگی ایران اکا نظر بەتعلیماتی ناوبراو هەمو قواتی ایران ئەخریتە ژیر تصرّفی ولایاتی متحدەی امریکاوە. بەپی‌اتفاقنامەی کونی ایران وامریکا ئەو اتفاقنامەی اخیرە ممنوعە. چونکە بەو دەستورەی کەقرار دراوە دەولەتی ایران حاکمیتی استقلالی خوی ضایع ئەکات. وبو امریکاش جائز نیە تداخل بەاستعماری ایران بکات. جادەولەتی شورەوی بەلزومی ئەزانی کەحقائقی دەولەتی ایران بەمطالعاتی خوارەوە رەوشەن بکا.

١-لەژیر نظارەتی مستشارانی امریکایی قشونی ایران بەاسلحەی جنگی امریکایی تسلیح ئەکری. هیچ فەرقی اسلحەی امریکا لگل اسلحەی کونی ایرانی ناکەین.

٢-ژنراڵ گرۆ-لەئەوەلی سالی ١٩٤٧دا منهجی تازەی سازمانی سپای ایرانی ترتیب کردوه وئەو برنامەیەش بتصویبی شا گیشتوه.
٣-لەستادی أرتشی ایران هیئتی مخصوصی مستشارانی نظامی امریکایی تداخلیان کردوه ونظامی سەرباز وقشونی ایرانیان گوریوه.
٤-امریکا برنامەیکی راجع بەتغیراتی صنایعی جنگی ایران داناوه فکر وایه لەسەر صنایعی نظامی امریکا شکلی (تاکتیك) ایران بگۆڕێ. بو ئەوەی بتوانن اسلحەی امریکا تعمیر وتغیر بکەن.
٥-بنا بەمقتضای مستشاران. امریکا طیارەخانەیکی گەورەی لەشاری (قم) دامەزراندوه. ئەو فروكخانەیه لەپێویستی ایران بەدەرە. وچند عمباریکی ژیر زەمینی نەوت وبنزین لەناحیەی (دلیجان) لەبینی قم واصفهان دروست کراوه کەئەوەش شایانی توجه وتعجبه.
٦-لەسالی ١٩٤٧دا دەستە دەسته مستشاران ومامورانی امریکایی واردی ایران ئەبن. چین چین داخلی بانك وفروکەخانه وادارەجاتی ایران بوون. باخصوص طیارە (خانەی ایران تور) پربووه لەافرادی امریکایی.
٧-قەرارگای پیشوی نظامی وچوار سەربازخانەیتر لەتارانا بەرەوڕوی هیئتی نظامی امریکایی کراوەتەوە. بەوپێیە وادەر ئەکەوی کەافسر وقشونی امریکا واردی ایران ببی.
جابەو حسابە وادەرئەکەوی کەامریکایەکان ایران بکەن بەجیگای حرەکات ولشکرهینانی خویان. ئەو باسەش اگر تطبیق بکری خطری مەرزی دەولەتی شورەوی تیا دیتەرو.
لەسبتامبری ١٩٤٧دا لەستادی أرتشی ایران کمیسونیکی مخصوصی مشترەك لەمستشارانی امریکا لەتارانا گیراوه. بەرنامەی ئەو کمیسونه ایجادی (فروکەخانەیك) گەوره لەناوچەی مەرزی. وچند مستشاریکی امریکایی بەسواری هەواپیمان- بەهەمو مەرزی ایرانا گەڕاون بەناوی بازرەسی سپاه وژاندارمەری ایرانەوه. بەرەو قەزوین رویشتوون. بەلام بەراستی فلسفەی ئەو گەڕانەیان بو کشفی قواتی جماهیری اتحادی شورەوی بووه لەحدودا.

اجا دەولەتی شورەوی بەپێویستی ئەزانی توجهی ایران بو ئەو بابەتە وربگری کەپیمانی ١٦اکتوبری ٩٤٧ لەبینی ایران وامریکا. بەعلاوەی مصلحەتی قراردادی بینی شورەوی وایرانی تأریخ ٢١فوریەی ١٩٢١ ئەگەینی. جا لەبەرئەوە دەولەتی شورەوی انتظاری هیە کە بەعجلە دەولەتی ایران تدابیری رفعی ئەو نقاطانەی غیرە اعتیادیە بکات. بەو مناسبتەوە احتراماتی فائق تقدیم ئەکەین.

سیاد

چیکوف

سفیری اتحادی جماهیری شورەوی

لەتاران

وایرانیەکان بەنظریەی (جورج ألن) سفیری امریکا لەتاران بەموضوعی خوارەوە وەلامی یادداشتی روسیان نوسیەوە.

أغای ساد چیکوف سفیری کبیری شورەوی

نامەی موریخەی ١٠بهمن ٣٢٦ جنابتان واصل بو احتراماً جوابتان عرض اکری

١-ئەو خبرانەی کە لەلاین دەولەتی شورەویەوە وەرگیراوە. بکلّی خلافی حقیقتە.

٢-ئەو موضوعەی کەباسمان کردوە هەموی شکلی داخلی ایرانن. علاقەیکی بەدەرەوە نیە. ملەتی ایران میدان نادا دەولەتیکی بیگانە دست بخاتە ناو ایشوکاریەوە. بەلام لەبەرئەوەی کەدەولەتی شاهنشاهی أرەزوی یکیەتی ودوستی وهامجواری شورەوی اکات بەنقاطی خوارەوە. هەمو گومان ورابەریکی بی‌اساستان رفع ئەکەین لەموافقەتنامەی ٦ اکتوبری ٩٤٧ لەبابەت تازەکردنەوەی قراردادی استخدامکردنی عدەیك لەافسرانی امریکایی. ئەو تاقمە قطعیاً سیمەتی فرمانداری ومستشاریان نیە. لەمسائیلی نخوش وهیندی ادارەی بچوکدا اشتراك ئەکەن. هەرگیز علاقەیان بەشئونی عسکریەوە نیە.

الف ــ مطلقاً افسرانی امریکا تداخلیان بەتسلیحی جیشی ایرانەوە نیە بەلام دەولەتی ایران هەر وکو دەولتانی جهان پێویستی بەتازەکردنەوەی اسلحەیە. دەولەتی ایران لەپیش جنگی ئەوروپادا. لەممالکی مختلفی اورویا چەکی کریبو بەلام جەنگی روژأوا ایرانی لەو پیشکەوتنە نامید کرد.

دەولەتی شورەوی باش ئەزانی کەتسلیحی ایران لەروی جنگی ئەوروپاوە تاچە اندازەیك دوچاری ندامەت بووە. لەدوای کوتاهی جنگ دەولەتی ایران ناچاری خریدی چەك بووە. بەدەولەتی شورەوی مراجعەتی خریدی چەكمان کرد. بەلام لەبەرنرخی ناموافق امکان نەبو کە کەموکورتی چەکی ایران لەدەولەتی شورەوی بکری. بو مصلحەتی خزینە وجنبەی اقتصادی نرخی امریکامان بەموافق هاتە بەرچاو. قەرارماندا مقداریکی کەم اسلحە لەامریکا خرید بکەین.

٢-ژنرال گرو-هیچ مداخلەیکی سازمانی أرتشی ایرانی نیە. افسرانی ارشدی ایران لەتەوانایانا هیە کەبرنامەی أیننامەی قشونی ایران تصلیح بکەن.

٣-ضرورەتیکمان بەافسرانی امریکایی نیە بو تغیردانی أیننامەی دەولەتی اگەر هاتو تغیراتیکی پیدرا. افسرانی ایران اتوانن تأمینی ئەو نقصانیەتە بکەن.

٤-افسرانی امریکا لەخزمەتی أرتشی ایرانا هەن. بەلام مطلقاً حقی تداخلی کارخانەی جنگیان نیە.

٥-دەولەتی ایران خودمختاری تأسیساتی هەمو وینە تصرفاتیکی طیارەخانەی هیە. بەپی ضرورەت ئەتوانی لەهر جیگایك کەبیەوی فروكخانە دروست بکات بەلام هەتا ایستا هیچ مطاری تازەی دروست نکردوە. وفروكخانەی (قمیش) زور بچوکو کونە. هیچ اصلاحاتیکی تازەی تیانکراوە. چە جای ئەوەی کەامریکایەکان تعمیراتیان تیا کردبی.

٦-هیزی أرتشی وژاندارمری لەوە زیاتر نابی کە بەتصویبی پرلمانی ایران گیشتوە وافسری ئەمانەش هەرئەوندە ئەبی کە لزوممان پی هەبی. ایستا موجودی افسرانی ایران نگیشتوتە ئەو قراردادەیە کە لەوختی خویا تصویب بووە چەجای ئەوەی کە لەخاریجەوە افسر وەربگرین.

٧-سەربازخانەی ایران معلومە کەچندە. وهیچ کامیکیان لەژیر تصرفی امریکادا نین ویك نفری سەربازی امریکا لەوسەربازخانەدا موجود نیە. چونکە دەولەتی ایران میدانی خاریجە نادات کەتداخل بکاری سەربازی وقشونی بکات.

لەکلیمەی-شاری نظامی-کەلەبیاننامەی باسکراوتانا ذکرکراوە ممکنە مطلبتان-امیر أباد-بی کە لەوختی خویا قشونی امریکای تیابووە. ایستاش ئەو

شوینه جیگای دانشمندان ودانشجویانه هرگیز افسر وسربازیکی امریکای تیا موجود نیه.

وأمرو شدی فروکه وافرادی امریکایی بو سمتی مەرزی ونخشەکیشان یان بکلّی یاساغه. هەتا میدانی دانیشتوانی ایران بو ئەو جهته نادری چەجای کە بەامریکایی خاریجه ئەگا.

بەلام متأسفانه دەولەتی شورەوی کەخلافی پیمانی ۳سی گانەی ۹بهمن۳۲۰ میدانیدا کەدەستەیك خیانەت کار بەتحریکاتی افرادی شورەوی لەضدی مصالحی دەولەتی ایران لەأزربایجان وکوردوستان تمرد بکەن. دەولەتی شورەوی لەو جهتەوه هیچ کومەگی دەولەتی ایرانی نکرد. لە ۱۹أزرماه ۳۲۵ لەمقابل رقو غضبی دەولەتی شاهنشاهی ئەو خیانەتکارانه فراریان کرد. دەولەتی شورەوی ریگای مەرزی بو چول کردن. وبو خاکی شورەوی قبولکران. وامرو ئەو شخصانه لەخاکی شورەوی موردی احتراماتی هەمو لایکتانن.

لەموسکو وباتکوبه بەرادیو دعایای مضرّه لەضدی ایران بلاوئەکەنەوه. وهیچ وینه جلەوگیریکیان لینـاکری. وبەناوی رادیوی حزبی توده ودیمکرات لەقەوقازا رادیویکی سرّی تأسیس کراوه. کەکاری منحصر بوته سەرتشویشاتی افکاراتی ایرانی ومتمادی افرادی شورەوی لەمەرزا هاتوچو وتحریکات ئەکەن لەضدی امنیتی دەولەتی شاهنشاهی.

دەولەتی ایران طبقی نوسراوی ژماره (٤٨٢٥) وروژی ۳۲٥/۹/۲۷ بو استردادی ئەو عناصره بدخواهانه مراجعەتی بەدەولەتی شورەوی کرد. دەولەتی شورەوی اهمیتیکی بەو مراجعەته ندا.

لەوختیکا کەتاقمیکی تالانگر وچته لەژیر ریاسەتی ملا مصطفی بارزانی کەلە دەوری قاضی محمدا بەروتبەی ژنرالی مشهور کرابو. لەپاش خسارات وزیانیکی زوری کەبەدەولەتی شاهنشاهی وارد کرا هاته روسیا. دەولەتی شورەوی پناهیدەی کرد. لەرغمی ئەوەی کەبو استردادی ئەو تاقمەی شرارەجویه لەدەولەتی شورەوی طلب کرا. کەمیدان نەدا ئەو دەستەیه واردی خاکی شورەوی بن کەچی متأسفانه لەروژی ۲۱ خردادی ۱۳۲٦ لەحدودی (قراقون) لەقولّی آرازه- وه بەکمالی احتراماتی افسرانی شورەوییەوه-واردی اراضی شورەوی بون.

انکار ناکری کەدەولەتی شورەوی لـەقبول‌کردنی خیانـەتکـارانی ١٩ أزرمـاه ٣٢٥ جعفر پیشـەوەری وغـلام یحـی وهاودەسـتانی. ولـەقبول‌کردنی تـاقمی مـلا مصطفـی لە٢١ خردادی ١٣٢٦دا منظوری هەرئەوەیە. بواسطەی ئەمانەوە دوبـارە دەسـتەیکی مخالفین ومتشردین بقصدی اشغالاتی خـاکی ایـران پیکبی‌نی. ولـەخاکی شاهنشـاهی ایراندا اشغالیەت بنیتەوە کەئەمەش خلافی پیمانی مودەتی فصلی (٥)مە کەبـەتأریخ ٢١ فوریە ١٩٢١ لەبینی دەولەتی شورەوی ودەولەتی ایران بەانجام گیشتووە.

دەولـەتی شاهنشـاهی مطـابقی قـراردادەی نـاوبراو همیشـه حـاضری تیکلـی وحسـنی تفـاهمی هـامجواری دەولـەتی شـورەوی ئـەبی. مـو قعـم بەفرصـەتزانی کەاحتراماتی حیمانەی خوم تازە بکەمەوە.

حکیمی
نخست وزیری ایران

## دەمانچەی أژاوەی سیاسی لەایرانا

انجـا روسـەکانلەدوای نـاامیدیـان لـەخیر وخوشـی ایـران. ویسـتیان بەهـەرنوعی کەبویان بکری دار بەداریك لگل حکومـەتی انگلیس بکەن وخویان لەحکومـەتی ایـران نزیك بکەنەوە. بـەو نـاوەوە احزابـە سیاسـیەکانی سـەر بـەجماهیری شـورەوی‌یان لـەایرانا خستە فعالیەت بو استقرار نگرتنی امنیەتی ایران. ولەهەمو لایکەوە. پنجەیان خسـتە تشویشـاتی فکـری حکومـەتی مرکزیـەوە. حکومـەتی ایرانیـش بـو تسـکینی أسـایش واستقراری ایران پەلاماری هەمو وینە تجرەبە وعملیـاتیکی‌دا. ئـەوەل عملیـاتی ئـەوەبو کە ئەو مهاجرانەی لەروسیاوە تبعەتی ایرانیان قبول کردبـو. بەمناسـبەتی اختلاطـی عنصری قوقازی وأزربایجانیەتەوە افکـاراتی ایرانیـان مسـموم کردبـو وحزبـی تودەیـان لەهـەمو ایرانـا انتشـار دابـو. ئـەو تاقمـەی لگـل ئـەو ارمنیانـەی کەبـەناوی تبعـەتی ایرەوانی- روسیا هەمو ملکو علاقـەجاتیکی خویـان هـەراج کردبـو. وأمـادەی سفری روسـیا بوبـون. ئـەو دو دەسـتە مبـادی بلاوکەرەوانـەیان بـو منطقـەی مـەرزی شـیراز-اصفهـان-مشهد-قم-دورخستنەوە. بەلام سازمـانی تودە بەو کردەوانـەش هـەر تسـکینی نهات. بەتأریخ ١٦بهمنی ١٣٢٧ لەلاین چند نفریکی أزادی‌خواهـەوە لەنمایشـگاهیکی

عسكريدا لەشاری تاران چند دەمانچەيك بەشاهەوە نرا. تأثيری ئەو دەمانچەيە بوبەهوی ئەوەی کەحکومت اعلانی ديوانی عرفی بکاتەوە و ۵۰۰ نفريکيان لەافرادی تودە خستە زندانەوە.

اجا هەرلەتنشتی حزبی تودە ودیمکرات حزبی اخوان المسلمين لەژير رئاسەتی سيدآيةالله کاشانی لەايرانا هاتە وجود. وبەتأريخی ۹٤۹/۱۱/٤ لەلاين أزاديخواه نائب صفوی رئيس الوزرا أغای حسين هژيری کوژرا. ولە جيگای ئەم حاجی علی رزم‌أرا کەمرکزی ثقەتی شابو کرا بەرئيس الوزرای ايران. وئەويش بەتأريخ ۷ مارتی ۹٥۱ بەدەسائسی أغای کاشانی لەلاين نائب صفوی قاتلی أغای حسين هژيروە کوژرا. وأغای سيدحسين علاء بەتأريخ ۱٤/مارتی۹٥۱بو بەرئيس الوزرای ايران.

بەلام لەبەرئيك‌چونی وضعی احزاب وسيطرەتی حزبی اخوان المسلمين بەسەر حکومەتی مرکزيدا. ودعايە وتأثيراتی روسەکانيش لەو ظروفی تشويشەدا. أغای حسين علاء نەی‌توانی وضعی أسايش واستقرار تأمين بکات. لەروژی ۲٦نيسانی ۹٥۱ استقالەی کرد لەروژی ۲۷نيسانی ۱۹٥۱دا أغای دوکتور مصدق کەمربوطی حزبی أزاديخواهی سازمانی اخوان المسلمين بو کرا بەرئيس الوزرای ايران وبەو مناسبتەوە روسەکان هليان لی‌نزيك بووە. سياسياً دەستی يارمەتی وتحريکاتيان بو أغای دوکتور مصدەق دريژ کرد ولەضدی انگليس هينايانە سەرشك. ولەرغمی ئەوەی کەنائب صفوی قاتلی دو رئيس الوزرای ايران بو لە۲٥مانگی تموزی ۹٥۲دا بەرەلا کرا.

## تميمی نەوت ودەرکرانی انگليس لەايرانا

حکومەتی ايران قانونی تميمی نەوتی بەتصديقی پارلەمانی ايران گياند الغای ئەو معاهدە واتفاقنامەيەی کرد کەحکومەتی رضا شا لە۹۳۲ لەگل شريکەی انکلو بريطانيادا بستبوی. شەريکەی انکلو دارسی انگليسيان ناونا انکلو ايران. نەوتی ايران کرا بەملکی ملەتی ايران وقانوناً سيطرەتی هەمو اجانبيکی لی دورخرايەوە. أگری دسائس واحزاب لەايرانا شکليکی زور بەاهتمامی ورگرت. وروسەکانيش بەمناسبەتی ئەو فرصتە مبارەکەيان ايرانيانيان وادار کرد کەبو وقفەنکردنی مصالحی اقتصادی ايران ئەو ۱۱طن ألتونەی کە لەاحتلالی ايرانا برديويانە بو ايرانی اعادە بکەنەوە. وبو فروشتنی نوتەکەشيان مساعداتيکی زور گەورەی ايران بکات. بەلام هەتا

ئەو تأریخە هیچ لایکیان بەانجام نەگیاندووەو پیاوی بەرزی ئەو حرەکاتەش لەایرانا آیەت‌الله کاشانی ودکتور مصدق وأغای فاطمی وەکی-متین- بیاتی- ناوان بون. بەجوشی ئەو اقداماتی قومیە لەروژی ۲٤/مایسی۹٥۱ ایران انذاری انگلیسی کرد کەهەتا روژی ۳۰ مایسی۹٥۱ هەرچیکی کە لەایرانا هیتی اگر نەی‌گویزیتەوە بلاقید ومسئولیەت حکومەتی ایران مصادرەی أکات.

بەتأریخ ۱٦ خرداد ۱۳۳۰ ایرانیەکان هیئتیك کەعبارەت بون لەأغایانی دوکتور متینی دفتری ودکتور علی أبادی ومهندی بیات وأغای بازرگانی وەکی واردەلانی. نارد بو اهواز وأبادان بو ورگرتنی نەوت لەمدیری شرکەتی سابق انگلیس (دریك) ناو. وبەتەواوی هەمو اساساتیکی شریکەی نەوتیان لەانگلیسەکان ورگرت وکاربەدەستانی شەریکەی انگلیزی‌یان هەمو دەرکردن.

انجا انگلیس هیئتیکی لەمانگی حزیرانی ۹٥۱دا نارد بو ایران بو تفاهم لگل حکومەتی ایرانا بەلام سودیکی نەبو. هیئتی ناوبراو کەعبارەت بون لەأغایانی سدان-گس-جاکسون-اکلینگتن- ناوان لەپاش محرومیەت گرانەوە بو لندەن. ومستر موریسنی-وزیری خارجەی انگلیس بیانیەیکی بلاوکردەوە اگر ایرانیەکان لەو فکرە بازگەشت نەبن دوچاری خطریکی گەورە ئەبن.

رئیس الوزرای ایران لە ۲۹ حزیرانی ۹٥۱دا بلاوی کردەوە اگر موظفینی بریطانیا چیکە ایران چول نکەن ولەشەریکەدا بمی‌نەوە قانونی مکافحەی تخریب تطبیق اکەین انجا حکومەتی انگلیس دەولەتی هند وپاکستانی کرد بەواسطەی تفاهم لگل ایرانا. ولەدوای یأسی امانیش انجا لەسەر تشبساتی انگلیس رئیس جمهوریتی امریکا ترومان-هاریمان سکرتیری خاصی خوی نارد بو ایران ونامەیکی تای‌بەتیشی پیانارد بو محمد شاهی پەهلوی. بو ریککەوتنی لگل انگلیسا روژی ۹٥۱/۷/۱٥هاریمان واردی تاران بو نامەکەی روژی ۹٥۱/۷/۱٦ بەذاتی شاهانە گەیاند-و بەمناسبەتی هاتنی هاریمان- لەروژی ۱٥دا مظاهرەیکی زور عظیم لەبینی احزابی تودە واخوان المسلمین لەتاران دەست پی‌کرا ۸۰ نفریك بریندار وکوژراویان بو. وسفارەتی امریکا بەهیزی پولیس محافظە کرا لەدەست مظاهرەچیەکان.

هاریمان لپاش چاوپی‌کەوتنی شا ورئیس الوزرا وکاربەدەستانی حکومەت لگل سفیری بریطانیادا چو بو لندەن.

ایفریل هاریمان-لەگەل هیئەتی مذاکرەی نەوتی انگلیس-ریچارد ستوکس-هاتەوە بۆ تاران. هیئەتی ناوبراو لەپاش چەند کوبونەوە وملاقاتیك لەگەل کاربەدەستانی حکومەتی ایرانا لەروژی ۱۹۵۱/۸/۲۳دا بەبی موفقیەت گەرایەوە بۆ لەندەن چونکە ایرانیەکان لەقراردادەی شریکەی نەوتی ایرانی نەهاتنە خوارەوەوانگلیسەکانیش داوای ئەوەیان اکرد کەئەو ناوە ئەبی تبدیلبکری بەشریکەیکی مشترکی انگلیس وایرانی بەقراری ۵۰٪ لەصدا. انجا انگلیس قضیەی نەوتی بەشکایەتەوە دابەسازمانی امی متحدە. لەنتیجەی محاکماتا. سازمانی امی متحدە لەمحکمەی عدلی دوەلیدا طلبەکەی انگلیسی رفض کردەوە بەحجەتی ئەوەی کەئەو شکایەتە شتیکی داخلی‌یە لەبینی ایران وشرکەتی نوتی انگلیسا علاقەیکی بەتجاوزی انگلیسەوە نیە کەسازمانی امی متحدە تداخلی تیا بکات. ولە۱۹۵۱/۱۰/۱۰دا دوکتور مصدق برایە امریکا بو ئەوەی لەسازمانی امی متحدەدا جوابی شکایتی بریطانیا بداتەوە. فعلاً رفضی هەمو طلبیکی انگلیسی لەو مجلسەدا کرد. ولەشباطی ۹۵۲دا دیسان دکتور مصدەق برایەوە بو لاهای-لەویشا بعینی عبارەت رفضی هەمو مطالبیکی انگلیسی کرد بەحجەتی ئەوەی کەقراردادی رضا شاە شتیکی استبدادی بووە بەحریەتی شعب ومجلسی پرلەمان نەهاتوتە وجودەوە. ولەلاین شعبەوە الغا کراوە.

ایرانیەکان فروشتنی نەوتی ایرانیان بەهەمو عالما اعلان کرد. هیچ حکومەتیك لەبەر تأثیراتی انگلیس هەتا ئەو تأریخە حاضر نەبون کەنەوتیان پی بفروشن. لەبەر وەضعی راهنی اقتصادیات لەبینی بلاط ودکتور مصدەق-دا مخالفاتیکی فکری هاتە وجود. دوکتور مصدەق لەشای داوا کرد کەمجلسی پرلمان سلطەی استثنائی وسلطەی تصرفاتی لشکری بداتی ومالا یسئل بی بەرامبەر بەهەمو فرمانیکی لشکر. وشاە بو تداخلی بەقضیەی لشکر موافقەتی نشان نەدا. ودوکتور مصدەق بەتأریخ ۹۵۲/۷/۱۹ استقالەی کرد.

شاش بەتأریخ ۹۵۲/۷/۲۰ ارادەی درکرد بو تعیینی قوام السلطنە بەرئیس الوزرا. فعلاً قوام السلطنە هاتە سەر حکم. حالاً اعلانی دیوانی عرفی کرد. حزبی تودە وکاشانیش بو خستنی وزارەتی قوام دەستیاندایە غوغای مظاهرات وفوضاء. پەلاماری مجلسی وزرا وهیندی دوائری اهمیتداری حکومتیاندا ۱۰۰ نفریك شهدا لە متظاهرین هاتە دفترەوە ئەو حالەتە هەتا روژی ۲۲ دەوامی کرد.

وجماهر ومتظاهرين داواى سقوطى قواميـان اكـرد. لـەروژى ٢٢/٧/٩٥٢دا جيش وشرطه نەيان توانى محافظەى وضعيت بكەن. قـوام السلطنه فـرارى كـرد ودكتـور مصـدەق بـەاحتفاليكى زور عظيمـەوە هاتـەوە سـەرحكم ئجا لـەلاين شـاوە سـلطەى مطلقى درايى وكراش بەوزيرى جنگ بـەعلاوەى رئيس الوزرايەتكەى. وغـلام رضـا واشـرف پـهلوى بەتـهمتى ئـەوەى كـە لـەضدى حزبـى كاشـانى اشـتراكيان بەكوشـتنى متظاهرين كردوە لـەروژى ٢٢/٧/٩٥٢دا. لـەلاين دوكتـور مصدەقـەوە قـرارى نفـى وتبعيدى خارجى ايرانيان درا وهردوكيان فعلاً لەايران دركران لەئەوەلى مـانگى تشرين اوەلى ٩٥٢ بەپنجەى انگليس لەژير قيادەتى جنرال حجازى وزاهدى واحمدى انقلابيكـى عسكرى لەايران روىدا بەلام تاقمى مصدەقى پيش دەستيان كرد جنرالـەكانيان گرتـن حرەكاتەكيان كوژاندەوە. بەلام لەرغمى ئەوەى كەحكومەتى عراق هيچ گونه مظـاهرە وقتاليكى بـو الغـاكردنى معـاهدەى شـركەتى نوتـى عـراق وانگليس نكـرد. كـەچى استفادەيكى باشى لەظروفى ايران كرد. ولەسەر داخوازى حكومەتى انگليس قـازانجى نەوتى كركوك وخانقين وبصرا گياندرايە ٤٩% لەصدا. بەوپىيـە اتفـاقى نـاوبراو لگـل انگليسـا لـەمانگى شباطى ٩٤٢دا لەمجلسـى پرلمـانى عراقيـدا بـە تصويـب گيشـت ولـەعينى مـانگدا تقديمـى ارادەى ملكـى كـرا وبەوپىيـە وارداتـى عـراق روى كـردە مستوايكى زور بەرزەوە.

بەلام ايرانيەكان هەتا ايستا نەيان توانيوە گـالونيك نـەوت لـەايران اخـراج بكـەن. ونشيانويراوە كـەدوبارە لگـل انگليس ريـك بكەونـەوە. لـەرغمى ئـەوەى كـەانگليس بەهەمو قوەتيك وتفننيكيەوە خەريكى ريككەوتن وهاتنـەوە سـەركاريەتى لـەعملياتى نەوتى ايرانا. بەلام هەتا الحال نتيجەيەكى حاسمى چنگ نكەوتووە. وحكومەتى روسـيش لەغيراز تحريكـات هيـچ گونـە معاونـەتيكى مـادى ايرانـى نكـردوە. وبلكـو لـەاكثرى مناسباتا بەگوى ايراندا ادا بو تطبيقى ئەو قراردادەيەى كەوختى خـوى لەگـەل رضـا شادا كراوە لە٦شهرىوەرى سـالى ١٣١١ بـو نـەوتى (سمنان وخوريـان) لـەشمالى ايرانـا كەشركەتيكى مركب لەروس وايرانى ايجاد بكەن لەدواى هەمو مصارفـاتيك بـەنيوەيى قازانجەكەى بـەش بكـەن. و ئـەو اتفاقـەيان هتـا ايسـتا لەمجلسـى پرلمانـا رسميتيكـى وەرنگرتوە. تنها لەلاين رئيس الوزرا مخبر السلطنه هدايـەت-فروغـى وزيـرى خارجيـە-منصور وزيرى كشـوەر-اسـعدى وزيـرى جنـگ-قرەگوزولـو وزيـرى فرهنـگ-بـهرامى

وزیری پەست وتلگراف-سرتیپ فیروز وزیری راه-داوەر وزیری عدلیە-یاسائی رئیسی کلّی تجارەت-تقی زاده وزیری مالیە-فرضی رئیسی کلّی صناعەت وفلاحەت. بەامضا گیشتووه. وئەو اتفاقنامەیه لەلاین تیمور تاشی رئیس دەرباری شاهنشاهی وەلەژیر نمره ۳۷۲۲دا لگل سفارەتی شورەوی (پیتروفسکی-رد وبەدەل کراوه واکثری وزرای ئەو هیئتە مخالفی ئەو قرارداد واتفاقە بوون.

وبغیری ئەوەش قراردادەکەی ساد چیکوفیش-هەروا موردی باسکردنی حکومتی شورەوییە.

بەلام لەرغمی ئەو هەمو مخالفاتەی کەایرانیەکان برامبر بەحکومەتی انگلیسیان نشانداوه. من شخصاً لەو اعتقادەدام کەایران بەمجبوری خوی بخاتەوه باوەشی انگلیس وامریکا. چونکه بەهەر نوعیك کەامکان بی حکوماتی روژأوا ایران ئەگرنەباوەشی خویان بو ئەوەی کەبیکەن بەقاعدەیکی عسکری وفروکەخانە. بەهوی ایرانەوه لەتجاوەزاتی حدودی روس نزیکببنەوه. ایران بەتفاهم ومصالحەت دوبارە خوی اخاتەوه باوەشی انگلیس وامریکا. بەلام روسەکان بەتجاوەز وپەلاماردان لەئەوّەل دەستپیکردنی جنگی ۳سیهەما ایران لەباوەش انگلیس وامریکا دەراهینن بوئەوەی کەاستفادە لەنەوتی عبادان وسیطرەتی خلیجی فارس بکەن وقاعدەی بردومانی روژأوایەکان لەخویان دوربخەنەوه-پردی شەرق لەاوروپا جیابکەنەوه. بەلام لەبەرئەوەی کەئەو موضوعە شتیکە لەتەرزی تکنهات دوایی پیئەدری ودیسان پرّیشە لەأژاوه وبسەر هاتیکی گرنگی سیاسی ئەمەوی لەوباسە چاوپوشی بکەم. بلکو زەمان بەطبیعەت ئەو عملیاتانە نشان بدات نەوەکو من بەتکهنات وخیالیکی مقصّرانە بوی بچم.

## *خساراتی کورد لەری أزادیخواهیدا

ملەتی کوردی ایران هەرچندە بەظواهر لەجنگی هتلری ۹۳۹ پاریزراوبون بەلام معناً دوچاری زیانیکی زور گەورەبون. لەدەوری شهریوەرا کەأغای حمە رشیدخان پینایە ایرانەوه. لشکری حمە رشیدخان عبارەت بو لەجوتیار وفلاح ورەشاییی-وئەو هەمو لشکرچیانە بەراووروت وتالان وچکمەرەقی-خویان بەاهالی ئەژیان.

تالانیکیشیان کەچنگ بکەوتایە ئەبو بەرزامندی أغاکەیان بشبکرایە ورزمندای أغاش هەرخوا ئەزانی چند بەبیوجدانا پیکدی. زورجار تصادف اکرا. شخصیك یا کور

یا برا یا أموزایکی اکوژراویا خوی بریندار اکرا وئەو تفنگ ویا ئەو ولاخەی کەلشکرچیەکەی لسر کوژراوە ویا بریندارکراوە. ابوایە یابە کاملی بدری بەأغاکەی ویا کە هیچ نبوایە نیوەی هر بەأغا ببخشری. واگەر خوانەخواستا کابرای سەرشکاو وقون دراو لوتچرچیکی نشاندابایە. لەدوای تالان‌کرانی ۱۰۰ جوت شەقی مزری بو تەواواکراو لەودی‌یەش دیبەدەر اکرا.

بو نمونەی مثال-بەتأریخ ۱۲/۱۰/۹٤۱. انگلیسیك لەلاین لشکری سلیمان‌خانی جافەوە لەریگای منطقەی دیواندەرە ئەکوژری. وقماندانی لشکری انگلیس لەسنەوە دی بو ئەو ناوچەیە. تبلیغ بە حمە رشیدخان اکات ئەلی نابی لشکری ایوە لەأوی خورخورە بپریتەوە هەتا خومان لی‌تان ئەگیرینەوە.

حمە رشیدخانیش بەلشکرەکەیەوە ئەگەریتەوە. وایرانیەکانیش ئەو خبرە وەراگرن لە (دەشتی هوبەتو) بەتانك وماشین زری پوش هلمەت ئەبنە سەر لشکری أغای حمە رشیدخان لەدەشتیکی وا کاکی بەکاکی وبی پنچك ودەوەنا-نازانن چی بکەن.

استناد بەاتفاق وسویندخوریکی کەلەمو پیش بویانە روئەکەنە ناودیهاتی تی‌لەکویی. تیلەکویەکانیش کەوکوژی لەو هەمو لشکرچیە باوان شیواوانە دائەنیشن ودەست ئەکەن بەکوشتاریان بەراستی فضیحەتی أوا بی‌ناموسانە هەتا ایستا هیچ کوملیك بەسەر هیچ دوژمنیکی نەهیناوە. هەتا رادەی خطر لەورووژەدا گیشتبو درەجەیك دمانچەی برنەو تفنگ لەبەر سواری پەریوە کەس نەی‌توانیوە دابەزی هلی‌بگریتەوە. سوار بەبای گوللە گلاوە نەی‌توانیوە سوار ببی‌تەوە وەلاخەکەی بی‌هیشتوەبەپی‌یان هلاتوە. عشیرەتی تیلەکو لەپیشەوە. لشکر وتانکی ایرانیش لەدواوە. وقماندانەکانی انگلیسیش لەبەرزایەکانەوە. بەدوربی‌نی بەحکم تەماشای ئەو ڕاوە بەراز وسیرانوسینمایەی أغای حمە رشیدخان وتیلکو ایرانیەکانیان اکرد.

جالەو شەرە پیسەی مختنانەی کەعشیرەتی تیلکو وایرانیەکان لگل بانەی‌دا کردبزیان تقریباً ٥٠ نفریکی لشکری أغای حمە رشیدخان کوژراو وبریندار هەبو ولەلاین ایرانی وتیلکویەکانیشەوە ۱۰۰ نفریك کوژراو وبریندار روی‌دابو وهەتا ٤ نفری کوردیان بەاسیری برد بو دیواندەرە. لەلاین سەربازە داخ‌دارەکانی ایرانیەوە ۳یان سەر برابون ویکیکیان کەئەو مشاهداتە بەسامەی بەرچاو ئەکەوی لەترسی گیان خوی لەپنجرە فری‌اداتە خوارەوە دەرباز ئەبی. جالەو حادثە خطیرەدا پیاویکی (کانی

گویزی بانه) دو کوری اکوژری. وکوری ۳سی‌هەمی افسریکی ایرانی لەتانکیکا اکوژی دەمانچە وتفنگیکی چنگ ئەکەوی ورزگاریش ئەبی. أغایەکەی هڵی‌پی‌چابو یا ئەبی دەمانچەکەی بداتی یاخود تفنگەکە. باوکە پیرەمیدە پشت کوماوەکەشریان ایگوت أغا دوکورم کوژراوە. وتفنگ واساسیەکەشیان فەوتاوە. تو هیچ نەبی رحم بەمنالە بچکولانەکانیان بکە ئەو تفنگ ودەمانچەیەیان لی‌مەستینە. فایدەی نەبو پارانەوە وسڵکسوتان لەلای أغاکە دەمانچەیکی نەئەهینا. دەمانچەکەی هەر لی‌ساندن.

جا ئەو قضیەی شت لەلشکرچی ساندنەوە بو بەباعثی ئەوەی کەترەقی حمە رشیدخان وەکو بفر بتویتەوە. وهیچ لشکرچیەك دلسوزی وفداکاری نکا. لەجهت استفادەیکی بەدەوام. نەأغا ونەلشکرچیو نوکەر استفادەیان نەکرد. أغا وبگزادەکان هیوایان وابو هەتا نهایەت ئەو خەرمانی تالانو رەوتەیان هەر لەبەردەم ئەبی. بەو امیدە دەستیان دابو سفاهەت وبادەنوشیو شتی ناشیرینتر. هەرچیکی کەچنگیان کەوتبو بفدای چاوی رەشی نازدار وخانم نازیان-کردبو أغایك بو ئەو بەزموسفاهەتە تفنگیکی تالانی ادا بە ۱۰۰تومان وایستریك بە۷۰ تومان. وباری توتنی تالانی بە ١٤ تومان. ولە مقابل ئەوەدا کورتکو پانطولیکی فاصونی گبردینییان اکری بە۷۰۰ تومان وقاتیك لباسی پارچەشریان بو خانمەکەیان دروست اکرد بە۵۰۰ ترمان جا فرمو بەوپی‌یە حسابی أغا وأغاژنم بو بکە وقازانجو ضرەریانم بو لیك بدەرەوە. مخارجی آرەقو تریاك وپوسطو ادارەی (دیزە بورە-ناوی جولەکەشی علاوە بکە.

خساراتی روحی کوردەکان لەقضیەی شەریوەر وە قاضی محمدا تقدیر اکرا بە ٤۰۰ نفر کوژرا ولەمنتهای حدودی سەردەشتەوە هەتا ئەوپەری دیواندەرە. ژیانی ئەو هەمو عشائر ولشکرە لەسەر کیسە وحسابی جوتیار وفلاحەکانی لادی وچەقالو بقالەکانی شاری تأمین اکرا. ئەو أغاو لشکرچیانەی کەلەمالی خویانا نانی گالیان چنگ نەئەکەوت بەهوی ئەو لشکرچیەتیەوە. قوزە دەماخیکیان پیا کردبو. خانەخوی‌یە هەژارەکانیان هەڵئەپی‌چا بو (فروجی سورکراوەی ژیر حلوا) وهەتا ئەو تأریخەش کەس نەی‌دیبو فروج بخریتە ژیر حلواوە. ویا حکمیان لەخانە خوی‌کەیان اکرد برنجی صدری نەبی برنجی رەسمی گردە-نەخون چونکە سەری خانەوادەیان بەبرنجی گردە ئەهیشی. وئەگەر کابرای جوتیار لوتچرچیکی برامبر بەامری ئەو أغا تازە پیاکەوتوە اظهار کردبایە لەبەرچاوی ژنو منالەکانی ساپ ساپی‌نەی شەقی پی‌ئەکرا. لەپاش ئەو هەمو

دەرد وجفا واختیاری زور شتی ناشیرنتر. جولەکە واهالی سقز لەلاین لشکری أغای حمە رشیدخانەوە تالان کران. وبەتالانکراوی سقزیان بەجیهیشت. وشاری بانەش لەپیناوی ئەو کوردیەت وملیەتەدا سوتا.

لەبەرتأثیراتی ئەو لشکرچیەتیە ملهتی ئەو ناوە کسابەتی بو نەاکرا هاتوچوی شارەکانیان لیقدەغە کرابو. هیچ پولداریك نەیاتوانی لەهەزار تومان زیاتر خوی بەخاوەن پول نشان بدات. لەهەمو شتیك سیرتر وناخوشتر ئەوەبو. هیندی لەبگزادە وأغازادەکان. لەدوای پزیرایی ومیوانداری ودلنوازیکی زور لەلاین خاوەن منزلەکانی شاری بانە وسقز ویا دیهاتیەکانەوە. لەجیاتی ئەو خذمەتو قدر زانیە لەوەختی رویشتنیا. قوری وپیالە وسەماوار وفرشوفروشی بەکەلکی ئەو مالە خانەخوی هەژارەیان ئەپیچاوە بەلوتچرچی ورەویکی أمالٌ توراو وگرژەوە بوی دەرئەچون ومالەکەی بەچولی بسەرخاوەن مالا بەجی اهیشت. جا منالی خانە خوی هەژار ئەجا لەچیا چا ئەخونەوە. وبەچی اژین وبەچی ئەنون.

## ادارەی سەردەشت

ادارەی سەردەشت لەادارەی شاری سقز وبانە زور خرابتر بو. چونکە سەردەشتیەکان وەکو شوینەکانیتر گەورەی تایبەتی ومعلومیان نەبو. هەر روژە یکیك أغایەتی وگەورەی سەردەشتی اکرد. بینیك ادارەی سەردەشت بەدەست بانەیوەبو. ولپاشان کەوتە دەست تاقمی قومیتەی پژدری هەر بەدو مانگ جاریك حاکمیکیان بو ئەگورین. لپاش حکّامی بانەی وگەورك وسویسنایەتی وپژدەری. حاکمیتی سەردەشت کەوتە دەست شیخ لطیفی کوری شیخ محمود کەفراراً لعراقەوە چوبو بو ایران.

وبەتوسطی سلیم خانی کیوەروی بانە وبەیاریدەی بابکر أغا وعباس أغای رووسای عشیرەتی پشدەر. بو شکاندن ودەرپەراندنی (تاقمی قومیتەی باپیری بابکری محمود أغا لسەردەشتا. شیخ لطیف کرا بەگەورەی سەردەشت وئەو ناوچەیە.

شیخ لطیفیش شاری سەردەشتی تسلیم بەامرو ارادەی-ملا اسعدی محوی‌و شیخ رضای گرەدی وکریم چاورەش ومحیالدینی چنارە. وکویخا کریمی وەلانە وقادر أغای سپیارە-کردبو کرامەتی ئەوشارە بەو ذاتانەی سرەوە بخشرابو. انجا لەدوای گەرانەوەی شیخ لطیف بو عراق. دوبارە ادارەی سەردەشت کەوتەوە دەست أغایانی ملکری

وبراجی-سویسنایەتی. وکاك الله أغـای پاراستان. وەکو پشتە مـالی حمام هـەر روژە أغایك ئەو شارە جوانکیلانەی بە..... خویەوە ئەبەست.

هەمو کاربەدەست وأغایك ئەبوایە لەو مدەتی حکمدار ودەستر ویشتن یەیدا خوی دەولەمند بکردایە. ولەهەمو شتیك سیرتر ئەوەبو ئەبو هـەمو حـاکمو کاربەدەستیك لەمدەتی حکمداریەکەیا بەزور یابە خواهش ژنیکی لەخلکی ئەو شـارە بهانیایـە. هـەتا شیخ لطیـف وهینـدی لـەپیاوەکانی لـەو رسمیاتـە جیانەبونـەوە ئەوانیش سـەرو ژنیـان لەسەردەشت هانی. بەلام هینەکەی شیخ لطیف لەسەر اسـرار والحاجی بابـەعلی بـرای هەر لەسەردەشت طلاقدرایەوە داخەکەم آووهوای عراقی بەنصیب نەبو.

### تەرزی اقتصادیات یان

لەو شارانەدا حقو عدالەت شتیکی زور نادیتە بو. بەقولغ وسور وساتی-٧ تومـان حقیکی مشروعی هزار تومانی ضایع اکـرا وبـە١٠توامانی أغـا سـلامەتانە خوینـی مقتولیك لەناوابرا. لەبەرئەوەی کەمترسـی سـوئی عاقبـەت وتعقیبـاتی دادگـا نـەمابو کوژران دزی سوتان تعدا لەهەژار بوبو بەصنعەتی زوردار بیجگە لـەوەش قـاپی قاچـاغ وشت بەرێکردن کرابووە. گمرگ ودخانیـات شـتیك بـو اسمـی. خواردەمنـی وحیوانـات وپوشاکی ئەو ناوچەیە بەهەرزانی مبایعە اکرا وابرایە عـراق. ولەعراقیشـەوە شـتی زور گرانبها واردی ئەو ناوچانە اکرا. وبەسەر کوردەکانیانا ساغ اکردەوە لەمقابل رون وگنـم وخواردەمنی.

چـەوەندەر وتوتـن کـەمادەیکی رئیسـی ژیـانی ئەو ناوچەیـە بـو لـەعراق وایـران وەرنەاگیرا وارداتی ئەو دو محصولاتە مهمەیان پەکی کـەوتبو. لەبەرئـەوەی کـەفرمـاندەی ئەو شارانە عراقی بون. بەگلوزیك جگرە وچنـد شوشـەیك عطـر ومشـروباتی افرنجـی ویك دو توپ شیرداخ. فتوایان ادا کەکابرایکی عراقـی بـای ١٠ هـەزار دینـار مـوادی روحی لەایران اخراج بکا.

جاهـەر تـأثیراتی ئـەو بـی موازەنەیەتیـە بـو لەسـالی ٩٤٣ و ٩٤٤دا ایرانیـەکان دوچاری مشکلاتی گرانیکی زور گەورەبون. ئەهاتنە عراق پوتی گنمیان بە ٢٠ تومـان اکـری. هەرئـەو گنمـەیان ئـەبردەوە بـو ایـران کەلـەوختی خویـا پوتیـان بـەدو تومـان بعراقیەکان فروشتبو. وهەر گا و گولیکی کەهەیان بو هینایانـە عـراق دایـان بەگـەنم.

وبصدهاشيان لەبرسان هەرمردن. لەهەمو منطقەی شارەکانی ایرانا هەتا نهایەت قند وچا وکوتال بەکوبون- هەمو مانگیك بەپی‌نفوس ادرا بەاهالی شارەکان. بەلام بەهوی تأثیراتی ئەو حرەکاتە ئەوشارانە محروم کرابون لەهەمو استحقاقیکی تخشائی وخواربارییان. هەرچندە بەناوی شاری بانەوە هەمو مانگیك مقداریکی کافی شکر وچا-بو حمە رشیدخان حوالە اکرا بەنرخیکی هەرزان. بەلام أغای حمە رشیدخان لەوشکر وچایە غرامیکی بەسەر اهالیدا توزیع نەاکرد. تنها بەسەر بگزادەکانا بەپی نسبەت بلاوی اکردەوە. بەلام خوا تۆلەی ئەو غدرەی لەأغای حمە رشیدخان کردەوە. أغای حمەرشیدخان ١٥ هەزار تومان لەکیسەی خوی ادا بەمیرزایەکەی کەناوی (میرزا سعیدی حمەدیز-ئەبی کەبچی لەسقز جیرەی شکر وچای دو مانگی بانە وریگری. لەو وختەدا انقلابی بانە بەسەرادی. میرزا سعید اگریتەوە پارەکە تسلیم بەایرانیەکان ناکا. وهەم ناشگەریتەوە بو لای حمەرشیدخان وهەر لەبانە ئەمی‌نی‌تەوە. چونکە شخصی میرزا سعید بانەی ئەبی وئەو ١٥ هەزار تومانە ئەخوا. وا اعتقادە کەأغای حمە رشیدخانیش هەربایی ئەو ١٥ هەزار تومانەی استفادە لەشکری حکومەتی کردبی.

## خسارەتمندی کوردی ایران لەدەورەی قاضی محمدا

قاضی محمد باشتر لەحمە رشیدخان تقدیری موقفی اقتصادی اکرد. حمە رشیدخان لەشاری سقزا ١٤ هەزار تنەکە نەوتی حکومەتی چنگ کەوت. بەپەلە تنکەی بەدو تومان فروشت وهەر لەدوای ٣ مانگ تنکەی نەوتیان بە ١٠ تومان اکریەوە.

دەهەزار فردە توتنی لەدائرەی دخانیاتی سقزا چنگ کەوت لەجیاتی موچە وخەلات بەسەر أغوات ولشکرچیەکانیا بلاوی کردەوە ئەوانیش فردەیان لەوتوتنە جوانە ئەدا بە ٧تومان. کەبالعکس لەنتیجەدا فردەی گیشتە ١٠٠تومان. ئەو هەمو تالانەی حکومەتیە نەبو حمە رشیدخان ونەبو تبعەکەی قازانجیکی وەهای تأمین نەکرد.

کەچی لەعینی وختا قاضی محمد ئەو توتنەی کەلەدوخانیاتی سابلاغا چنگی کەوتبو محافظەی کرد هەتا لەدواییدا بەروسەکانی فروشت بە ٦ملیون تومان واکثری کاروباری جنگی بەپولی ئەو توتنانە پیك هینا.

دیسان لەدەوری قاضی محمدیشا منطقەی سرا وسقز وسەردەشت دوبارە دوچاری لشکرکەشی شکاك وبارزانی وبانەی بووە. رزقو روزیکی کەپیکیانەوە نابووە. ئەو

کوڵلە-بی باڵانە دیسان خواردیانەوە. ولەکشانەوەی بارزانیدا. هەردیهاتی کەبارزانی بەسەرا تیپر ئەبو وەلاخەکانیان لیبەسوخرە اگرتن ودوایش بویان ردنەاکردنەوە.
ولەروی لشکرکەشی بارزانیەوە منطقەی شنو ولاجان دوچاری خطریکی گەورەی سرومالی بوبون هەر زخیرە وخوراکی کەهەیان بو بەشەق لیڕیان ورگیرا.

## تشددآتی حکومەتی ایران لەدوای نەمانی کوردوستانی قاضی محمد

لەدەوری ۳سی هەما کەحکومەتی ایران هاتەوە سەرکار وکوردوستانەکەی قاضی محمد لەناوچو. افسرەکانی ایرانی تاویاندایە قمچی غرض کاری وداری کلاوسازی. ئەو کوردە هەژارانەیان هینانە ژیر فشار وأزار هەرچیکی چوار تومان پارەیان پیوە شك ببردایە. کلاویكیان بو سازئەکرد. انجا کابرای هەژار هەرچیکی که شکی ببردایە لەناوی ادا وخوی پیاکریەوە. ئەوەی دەنگە جویکی پاشای دیمکرات وکوردوستانی قاضی محمدی خواردبو وبەژیر سیبری ألای ازادیدا رویشتبو گیرا وخرایە زندانەوە.
ئەو کسەی کەلەدەوری دیمکراتا تالان کرابو وتیهەلدرابو. لەو شخصە باشتر تعقیب وتعذیب اکرا کەشەری لگل هیزی دەولەتیدا کردبو. ژنومنالی گوناهبار وبیگوناە بو تشبسات وگیاندنی پارەی رشوەت وبەرتیل بەروی سورەوە رویان کردە مالە سەرلشکر وسەرتیپ وفرماندە وافسران وکاربەدەستانی حکومەتی ایرانی لەهەمو منطقەی مهاباد وقلەمرەوی قاضی محمدا رشوەت لەمباغیکی زورکەمەوە گیشتە ٥٠و٦٠ هەزار تومان.
محکمەی دادگا ودادستان داخرا. محاکمات برایە مالانی سپاه وسرلشکر وسەرتیپ وأستاندارەکان. محاکمات هەموی بو بەجرائمی دادگای زەمانی جنگ. هەتا رەشوەت گیشتە درجەیك رشوەت ابوایە بکرایە بەألتون واسکناسی ١٠٠تومانی.
عینی ئەو دەوری ألتون ومجوهرات بخشینەی کوردەکان بەدەوری هانپیال-وروماییەکانی لیهات. کەزەلامیان بەألتون هەڵاکیشا لەجزیەی نەکوژرانا. هەتا قاضی محمدیش شخصاً ١٠ هەزار تومانی رویشت. قەرار وابو اگر محامیەکەی سروان منصور پورناو-تبریەی بکات ٣٠هەزار تومانی بداتی. پیشەکی ١٠ هەزار تومانی دابویی. وختی کەقاضی محمد اعدام کرا عائلەکەی داوای ئەو ١٠ هەزار تومانەی کردەوە. حکومەت ئەو پارەیەی لەمنصور پور استرداد کردەوە بەحسب ئەوەی

کەموظفە حقی بها واجرەتی وەکالەتی نیە. بلام بو عائلەی قـاضی محمدیـان استرداد نکردەوە. ئەو ١٠ هەزار تومانەیان بو خزینەی دەولەتی محسوب کردبو.

اجا لەترسیی ئەو تشدوداتەی أغایەکانی ایرانـی پرستیش ترسیان لی‌پیدا بو دەستیان کرد بەدیاری ناردن بو فرماندەکان. میلاً احمدأغای حجی بایزأغای ایلخانی‌زادە کەروحاً وجسداً پیاوی حکومەتی ایران بو. بەبی ئەوەی کەهیچ اشارەتیك بکری لەترسی گیانی خوی ١٣٠ هەزار تومانی لگل دەمانچەیکی پەراشوت لەجیاتی خویو خزمەکانی بە(خانمی)سرلشکر همایونی بخشی. وکریم أغای قونقولاش--٥٠-هەزار تومانی دا هەتا جعفرأغای کوری لەبندی رزگار کرد. بەلام لەدوای ٢٠ روژ اجا دوبارە جعفرأغا گیرایەوە لەسەر غرضی کە لەبینی جعفرأغا ورئیسی ستادی أرتش رەزمأرا ناوا هەبو. اجا محکوم کرا بە ٢٠ سال حکم وبە(٦٠) هەزار تومانی‌کە اجا أغای جعفری کریمی لەدوای دوسال حکمی افراجی بو درهینرا.

ئەوەی زور سیربو ئەوەی کەامرو بەرشوەت افراج اکرا لەدوای چند روژیکی‌کە بەعینی تهمت اگیرایەوە بعینی دەستکاری بو رشوت دەست کاری اکرایەوە اجا برەلایان اکردەوە. ویا محکومیان اکرد راپوردان وروحی تجسس لەناو کوردەکانی ایرانیدا بوبو بەپیشە. بوئەوەی کەامنیەتی شخصی لەنظر کاربەدەستانی حکومەتی تأمین بکەن. گەورە وبچوکی منطقەی مهاباد وأزربایجان دەستیاندایە راپور وگزاریشات‌نوسین درحق بەیکتر. وبەناوی صداقەت ودەولەت‌پەرستیەوە لەهەمو لایکەوە. أگری اغراضی شخصی تینی ساندبو. گوناەبار وبی‌گوناە بەبی‌غائلە واندیشە نەمابو وە کابوسی ترس سواری‌شانی هەمولایك بوبو.

بو نمونەی مثال ئەمەتان بەعرض ئەگەینم. روژی ١٧بهمنی ١٣٢٥ لەدی نموتە)ی دولی میرەدی لەتعزیەی علی أغای جوانمردی ورسولی محمودی-دانیشتبوین تقریباً ١٠٠ نفریك لەأغاوات وپیاومناسبی ئەو ناوچەیە لەو ساتەدا لەدیوانخانەی ناوبراوا اشتراکی تازیەیان کردبو ئەوەندەمان زانی دونفری آژان) خویان کرد بەژورا. ودانیشتن تقریباً هەتا ٢٠ دقیقە هیچ کەس زمانی نەبو نە بەخیرهاتنیان بکا. ونەهوشی ئەوەشیان مابو کەبەس بەپی‌وە رابوستن هیچ نەبی دابنیشن اجا آژانەکان-بەفراصەت تی‌گیشتن کەهاتنی ئەمان سامەتاسیکی بەسەر ئەو مجلسەدا هیناوە.

ئمجا گوتیان أغایان فرمون دابنیشن ایمە بو شتیکی زور بسیگ هاتووین. لەوختی خویا کەختی تلفونی بینی بانە وسقز لیكدراوە عجباً تلەکانی کەوتوتە کوی. وایمە بو پرسیاری ئەو تەلانە هاتووین. وبو جوابدانەوەی عینی موضوع أغای فارس أغای بلجر لگل خومانا ئەبەین بو سقز چونکە بلجر لەودیهاتانە زیاتر نزیکە بەختی تلفون توضیحاتی ئەو خەتە لەم استفسار ئەکری.

ئمجا خلکەکە کەوتنە گالەگال وقصەکردن. بەلام نازانم فارس أغای بیچارەچون گیشتبو سقز وچون وەرامی ئەو پرسیارانەی دابووە. جا محاکمات ورزگاروبندی ئەو روژە بو بەپارە ئەوەی پارەی دابایە رزگار ئەکرا. مشمولی عطفی شاهانەیان اکرد. وئەوەی پارەشی نبوایە هەتا دو ۳سی سال هەرلێیان نەئەپرسی. نسبەت بەأغایانی حمە رشیدخان بگی بلکی ونصراللەخانی روستمی وقادرخانی أرمردە وعبداللەخانی شهیدی.

أغای حەمبگە رەقەی شوی.- بانە هیچ گوناهیکی نەبو . کەچی ئەمانیان کرد بەنگهبان وسەرپەرشت وأغای حەمبگە رەقەیان مدەتیکی زور زندانیکرد وبە۹ هەزار تومان مشمولی عطفی شاهانە کرا. کریم أغای محمدی کوندەلان- مصطفی أغای معروفی کیلەشین خان- سیدکاملی گردی گلان-نسبەت بەحاجی بابەشیخ وقاسم أغا وسید محمدی زنبیل وعزیزأغای کولتەپە مجرم نەبون- ئەمان کەپارەیانداو هەرزو بەرەلا کران ئەمان کەپارەیان ندابو یکی دوسال لەزندانا مانەوە.

أغایانی مازوجی-نغدەی-ناظمی-عبدالله خدر حیران- برامبەر بەوهابی بلوری- سیدە پیرە-منافی کریمی- احمدی اللهی-دارای جرمیك نەبون ئەمان پارەیاندا بەرەلا کران. ئەمان بیپارەبون اعدام کران سرانسەری کوردی ایران دوچاری ئەو فلاکەت وجزبەیەبون. لەعشائری بختیاریوە هەتا ئەگا بەمنتهای أزربایجان لەئەوەلی شهریوەری ۱۳۲۰دا دوچاری عینی حملە وحرەکاتی حمە رشیدخان وقاضی محمد بوبون. هەمو رئیس وسرکردەی عشائیریکی کورد لەمنطقەی نفوذی خویدا پەلاماری حکومەتی ایرانی دابو. لەاعادەی تشکیلات ونفوذی حکومتیدا دوچاری هەمان لطمە وفلاکەت بون.

هەتا محمودخانی کانی سانان کەیکەم دوستی حکومەتی شاهنشاهی بو لەپاش استقراری امنیەت لەمریوانا. لەسەر قضیەی رسوماتی گمرگی لەوضیفەکەی عزل

کراو خرایە زندانی تاران ولەنفسی تارانا گیانی تسلیم بەرحمەتی قمچی سەربازان کرد وهەریە ومناسبتەوە لەلاین حکومەتی ایرانەوە لەایلولی ۱۹۵۰دا عشیرەتی جوانرو تذیق کران بو تسلیم کردنی چکەکانیان و عشیرەتی ناوبراو زور بەپیاوانە پەلاماری عشیرەتی هەورامی ولوند وحکومتی یاندا. چند بگزادەیکی هەورامی وافسری ایرانیان بەاسیر گرت. بەلام لەنتیجەدا بشروط لگل حکومەتی ایران ریك کەوتن وبەغیرە چك کراوی مانەوە.

جا انکار ناکری حکومەتی ایران بەحکومەتیکی زور پاشکەوتوو بی نظام تەماشا اکری لەرغمی ئەو هەمو بسەرهات وقائعی سیاسی جهانی. ولەرغمی ئەو تشکیلاتە کونەی شاهنشاهیدا کەایران بەاقدەم حکومەتی جهان اناسری کەچی ایستاش لەشکلی عشائری وبربریەتی جیانەبوتەوە.

وتفسخی اخلاقی ئەو حکومەتە گیشتوتە مرحلەیك کە انفجاریکی زور بەدهشەت بکات. وسەرزمین بەو انفجارە پیسەیان بلەریتەوە. لەحکومەتی ایرانا گەورە وبچوکی موظفینی دزی وکلاوسازی ورشوەت پەرستی کردوە بەصنعەت. حیا عفەت عاطفە ضمیر صداقەت لەناو حکومەتی ایرانا بوتە شتیکی اسمی.

بەاعتقادی من ئەو حکومەتە لەأخر مرحلەی انحطاط وپەستی دایە ومحتاجی تربییەیکی زور بەاهمیتە لەلاین حکومەتیکی استعماری وکو روس انگلیس وامریکا. وبەهەرچونیکی کەبی دەوری استعماریەکەی لەو نهضەتەی ایستایەی باشتر جیگای امیدەواری وپیگەیشتنی ملەتەکەیەتی. بو نموونەی مثال چند بسەرهاتیکی راستی پولیسی ایرانتان بو ئەگیرمەوە کە لەدەوری رضا شادا وقوعی کردوە. ودەوری ایستای محمد پهلوی لەپاش ئەو هەمو بسەرهاتو تقلباتەی کەباسکرا فرقیکی نکردوە وبلکو لەدەوری رضا شاە زورپیس تر ئەبزونەوە. وکوردەکان لەئەوەلی هەتا أخری بو جیابوونەوەیان لەاستبداد وسیطرەتی ئەو حکومەتە فاحشەیە مغدور بوون وبەمعذور ئەزانەرین.

## امر مخفری چمپاراو مجید تنگی‌سەری

لەسالی ۱۹٤۱مجید تنگی‌سەری ناویك امر مخفری چمپاراوی ایران ئەبی لەمنطقەی بانە شەو میوانی کابرایکی خلکی دی کندە سورەی بانە ئەبی. وبەکابرا ئەلی اسپەکەم

هەمو شەویك هیلكەیكی مرواری اكات. ئەبی نوبەت لەو اسپەم بگری نەوك هیلكەكە بكات وبیخواتەوە. كابرای سادەی هەژار هەتابەیانی ژنەكەی لای مجید تنگی‌سەری بجی اهیلی وبەدیار پیرە اسپەوە لەناو گەوڕا هەل ئەتروشكی. بیانی، مجید ناو داوای هیلكەكە لەكابرای خانە خوی اكات. اویش سویندی بو ئەخوا ئەلی لەتەرس زیاتر هیچ هیلكەی نەكردوە. ئەویش ئەلی اسپەكەم هیلكەی كردوە بەلام شاردوتەوە. بەهەزار كیشمەكیش اجا بە ٥٠تومان جزای خیانت الأمانت وازی لی‌دی‌نی. وئەو روژەی كە حمە رشیدخان ئەچیتە سەر ایرانیەكان ئەو پوسطە خریك حمل ونقلی بانە ئەبن. كابرای كندە سورەی داخدار فرصەت ئەبی‌نی تاوئەداتە ساچمەزەنیكی راوی. لەپشتی دی (بلەكە) مجید ناوی خاون اسپ وهیلكەی مرواری ئەكوژی وخوی لەوسەر شوریە رزگار ئەكا. أیا هیچ كەس ئەبی كەئەو كابرایە بەمعذور نەزانی لەكوشتنی ئەو أمر مخفرە بدسزایەدا ؟.

## گروبان رفیعی لەكیلەشین‌خان

نزیك بەدی كیلە شین‌خان گورك میرەدی-گروبان رفیعی ناو توشی كابرایكی ری‌بوار ئەبی كسەری شكاوە وسواری كەریك بووە. لەكابرا ئەپرسی كی‌سەری شكاندووی. كابرای كەرسوار ئەلی كەس سەری نشكاندوم لەكەرەكەم بەربومەوە سەرم بەر بەرد كەوتووە. گروبانی ناوبراو ئەلی ورە بەردەكەم نشان بدە. كابرای سەرشكاو نیو سعاتە ری لگل امنیەكە ئەگریتەوە بەردەكەی نشان ادا.

كابرای امنیە دائەبەزی ٦و٧ قمچی لەبردەكە رائەكیشی. اجا ئەلی برادر. من واهەقی توم لەوبەردە ساند. توش بدە قولفەكەم-كابرا ناچار ئەبی پنج تومانی ئەداتی-.

## استوار اشقی لەچیچورانی بانە

استوار اشقی ناو افسری حكومەتی ایران لەسالی ١٩٤٠دا ئەچیتە دی چیچوران لەمالی كابرایك چاوی بەجاجمیك ئەكەوی لەپینج تختەی بچكولانە، دروست كراوە.

لەکابرای خاوەن جاجم ئەپرسی جاجم چوار تختەیە. تو بوچی پینج تختەت کردوە. کابرا ئەلی ریسەکمان وای هیناوە. استواری ناوبراو ئەلی نەخیر ئەمە دەستوری عراقە عراقیەکان جاجمی پینج تختەی ئەکەن. وادەرئەکەوی تو علاقەت لگل چتەکانی عیراقیدا ببی اجا بەهەزار زحمت بە ۲۰تومان واز لەکابرا ئەهینی.

## چند أمنیەیک لەگلولان

چند امنیەیك لەگلولانی سەرو نشان دائەکەن. تفنگیکی زوری ئەتەقینی بەلام لیٰنادەن. کابرایکی روتەلەی خلکی گلولان ئەلی فیشکیکم بدەنی. امنیەیك تفنگو فیشەکیکی اداتی بەاوەل تقە نشاکە ئەشکینی اجا امنیەکان کابرا هەل ئەپیچن ئەلین تو چتە بووی بویە وا تفنگ چیت بەتکای خدرأغا اجا بە ۵۰ تومان وازی لیدینن.

## تورکمان کندی ومحمودخانی شجیعی

چند امنیەیك لە ۱۳۱۸دا ئەچنە دی تورکمان کندی میوانی محمودخانی شجیعی ئەبن. بەدزیەوە چند قاپورە فیشەکیك ئەخنە ژیر دوشەکی محمودخانەوە. دوایی ئەلین أغای محمودخان متهمە بەوەی کەهەر راو و رووتی لەوناوە اکری ئەوە. چونکە اسلحەی ناری هیە. وئەو قاپورە فیشەکانەش اثباتی چکداری وپیاو خراپیەتی اکا اجا بەهەزار گوی کیشەکی بە۱۰۰ تومان رازی ئەبن.

جالەدەورەی شهریوەرا کوردەکان ناحق نەبون هەر تعدایکی کەلەایرانیان کردوە وجگریان بەو وینە سیأتانەی سەرەوە کون کون کرابو. بەلام داخی گرانم لەدەوری قاضی محمد وحمە رشیدخانا شتیکی وهانکرا. کەئەو محکومیەت وجفایانەی حکومەتی ایرانی فەراموش بکەنەوە. بلکو ئەمان ئەو سوکیو حقارەتیەیان بو ئەو ملتە هەزارە زیاد کردبو.

جا اقتصادیات وامنیەت وعدالتی ایران لەدەوری حکومتی ۲۰ سالی رچا شاە ودەوری اخیری محمد پهلوی وبەسەرهاتی حمە رشیدخان وقاضی محمد بەوپیریە دوایی هات. لپاش استقراری وضعیەت اجا بو دلنوازی ودعایەی ناوعشائری حکومەتی ایران لەمانگی اسفندی ۱۳۲۵دا پیاوە ناودارەکانی کوردیان لەهەمو لایکەوە کوکردنەوە وبردیانە تاران وبەپی‌نسبەت لەپاش دلنوازیکی زور هەریکەیان یا

بەتفنگیك ویا انگوستیلەیکی الماس- ویا مدالیەیك-خەلات کردبو ومحترمانە بری‌یان کردبونەوە. یکیك لەوخلات‌کراوانە ملا خلیلی گورەمەر بو کەلە ۱۱فروردینی ۱۳۲٦ لەدی میراوای منگورایەتی بەخذمەتی گەیشتم وبەتفصیلاتی خوارەوە ۳ روژ لەمالی خویانا دەمەتەقی‌مان بو.

س-جنابی ماموستا ملاخلیل چون بو لە۹۲۹دا لەسەر مسئلەی کسوەتی زنّاری شبقە ٦مانگ لگل عشیرەتی گەورك وسویسنایەتی ومنگورایەتی بگژ حکومەتی تارانا چوی. أغای بایزی- وجاخی کا خدرت لگل چند أغایکی منگور بەایرانیەکان بەکوشت دا. کەچی ایستاش کومەگ بەو حکومەتەی کەوختی خوی بەکافرت ئەزانی.

ج-من ایستاش هەرلسەر ئەو اعتقادم کەلباسی گاوران حەرامە. بەلام لەبەرئەوەی کەشیعە لەروس باشترە مجبوری ئەوەم لگل حکومەتی ایرانا متفق بم. وئەو شەری کەمنیش لەو دەورەدا کردم غذا بوبەلام هی ایستا جزایە. چونکە بەضعفی ایران روس سیطرەت پیدا اکا. انکار ناکری هردولایان هەر پیسن بەلام ایرانیش لەروس باشترە.

س-تو بوچی لەضدی ئەو کوردوستانە بوی کەقاضی محمد دروستی کردبو وبوچی شاهدیت لەصدری قاضی دا

ج-من لەئەوەلەوە لگل قاضی محمدا زور متفق بوم. کەچی کەهاتە سەرکار کوردوستانەکەی لەمن شاردەوە. لەخویەوە سلبی اعتمادی لەمن کردبو. چونکە بیستبویەوە کەمن لەضدی ئەوەم کەخاریجە پیشەوا ورهبرمان بی. پیشەوا ورهبر ئەبی مسلمان بی. قاضی محمد بو تحقیر حمە ووردی-معلمی مهابادی لی هاندابوم کەئەبی فتوا بدەم کەخویندن بو کچان حلالە. وکتمانی شهادەت پیاوی پی رورەش ئەبی من چون لەترسی خوا ئەویرام ئەو اقرارە گەورەیە بو صدری قاضی بشارمەوە وخوم خجالەتی سویند و قورآن بکەم.

س- تو لەبەهاری ۹۲۹دا کەفراراً هاتیە عراق. عراقیەکانت چون هاتە بەرچاو لەقضیەی اسلامو جل لەبەرکردنی گاورانا.

ج-والله فلانی ایران وعراق هەردوکیان لەجهت متجددی وکافرەتیەوە جاشی یك ماکەرن. من لەکولکە) رەوی بومەوە بەسەربەرازی‌دا کەوتبوم-من وام ئەزانی هەر ایران

بەجلی زناری ئەیەوی خوی کافر بکا. کەچی عراقیەکان لەپیش ایرانیوە خویان لەدین وەرگیرا بو.

س-تو ایستا هیچ عصبیتی قومی کوردت هیە. وهیچ تأثر بو قاضی محمد ئەخوی

ج-بەخوا ئەمن خوشم اگەر لەرێ کوردیەتا سەربریم پیم خوشە. بەشەرتی لەسەر منهجی اسلامی ئەو کوردوستانە بی‌تەوجود. ئەگەر باری بی دەسلاتی نەبی ایستاش حکومەتی فارسی هەریەکافر ازانم. بو قاضی محمدیش بەپەروشم چونکە مقتضای سیاسەتی بیگانە مجبوری کردبو. کەحکومەتەکەی لەسەر بنای بی‌دینی دابمزرینی.

## شمس اشرف پهلوی

بو دل‌نوازی ملەتی هەژاری أزربایجان ومهاباد بەتأریخ مانگی ازەری ٣٢٥ خوشکەکانی ملك شادوختی وشمس اشرف پهلەوی بەناوی سەرپەرشتی دانشگاه وسازمانی شیر وخرشیدی سرخی ایران هاتنە أزربایجان وگوزارشاتی خوارەوەیان تقدیم بەمحمد رضای پهلوی کرد

اعلیحضرەتی محمد پهلوی

بەکمالی احترامەوە نتیجەی مأموریەتی کە لەروی رەحمەتی اعلیحضرەتی برای تاجدارم بەمن سپیەرابو. بەشەرحی خوارەوە تقدیم اکری.

لەمنطقەی تەوریز واردەبیل وزنگان تنگدەستی وهەژاری بەاندازەیك زورە تعریف ناکری. بەلام لگەل ئەو تنگدەستی وهەژاریەدا وطنیتی خویان لەدەست نداوە بەتأثیری راووروتی دەستەی دیمکراتیەکان بەتەواوی مدارس وخستەخانەکانیان ویران کردوە. مطلقاً دوکتورو معلمیان نەهیشتوە.

ئەو البسە وخواردەمنی وفرشو پارەی کە لەلاین اعلیحضرەتەوە خرابو ژیر تصرفی منەوە فعلاً هەمویانم بەسەر مستحقینا دابەش کرد. بەلام برسیایەتی وپەریشانی بەاندازەیك هجومی کردوتە سەر ئەو شارانە. اگر اعلیحضرە بعجلەیکی زور همت بەعطف ونوالیکی واسع نکات ئەو ملتە میهن‌پەرست وأزیزە لەدەست درچووە.

٣٠أزری ١٣٢٥ — شمس اشرف پهلوی

حقيقتاً دەولەتی ایران لپاش ئەو تقریرە بو یارمەتی هەژارانی أزربایجان دەستی یارمەتی دریژ کرد. بەلام هەتا نهایەت منطقەی مهاباد وکوردی رضائیە استفادەیکیان لەو یارمتی دەولەتیە نکرد. تنها عائلەی علی اشرەفخان وافتخاری قلاگاهی هەوشار-نەبی چونکە ئەو دو أغایانە کوردبون بەلام کەوتبونە منطقەی تورکەکانی أزربایجانەوە. بەتهمتهی ئەوەی کەگوایا مربوطی حزبی عدالەتی سید ضیای طباطبائین وئەو حزبەش گوایە سەر بەانگلیسە تنها بە مجرەدی ئەو تهمتە خالیە. ئەو دو أغا بیچارانەیان بەمالو مندالەوە بردبو بو تەوریز. بەشیوەیکی زور مفتضح ئەو دو أغایانەیان خنکاندبو. ٣ کور چوار برا و٧ نوکەری ئەو أغایانەیان محکوم کردبو لە ٣ سالەوە هەتا ٢٠ سال محکومی. وهەرچی اسیاسیە وتجمیلاتیکی بیتیەشیان هەبوبو بەتالانیان بردبو. ئەو عائلە نازدارانە سەرەرای کەدارای ٣٠ دی بون. لەتەوریز سوالیان اکرد. پیشەوەری بد اطوار دەرحق بەو کوردە، هەژارانە لەپیش هەمو تشکیلات وعملیاتی‌کی استقرار ئەو کارە ناشیرینەی بەانجام گەیاند.

قاضی محمد بو ئەو جهتە زور کوششی کرد. بەلام لەبەرئەوەی کەخنکاندنی ئەو أغایانە لەسەر اشارەتی روسەکان بو. قاضی محمد هیچ نەیتوانی ئەو کوردە بی‌گوناهانە دەرباز بکات. وتحدیدی حدودیش نکرابو کەهەرچیکی کوردنشین بی لەادارەی قاضی محمد مسئول بکری. جا لەحقیقتا کوشتنی ئەو أغایانە تأثیراتیکی زوری کردە ناو کوردەکان. ئەو قانون ونظامە فاشیستە بو بەسببی ئەوەی کەسی کەنەختی دارای سابقە بوایە نویرابا اعتماد بەحکومەتی روس وأزربایجان بکات ولەوناوچەیە دابنیشتایە.

لە ٥/مارتی ١٩٤٦دا کەحمە رشیدخان چو بو سەرا (اسماعیل أغای) کوری حما أغای عباسی لەسرا بو. حمە رشیدخان وعدی دایی کەهەمو املاکەکانی لە قاضی محمد بو وریگریتەوە وامری عفوی باوکیشی بو لەقاضی محمد وریگری ودەرجەی افسریش بو اسمعیل أغا استحصال بکات.

اسماعیل أغاش بەم عطفە زور مسرور بو بەلام بەئەوەل بیستراني خنکاندنی ئەو أغایانە ترس وە واهمەیکی زور گەورەی لی‌پیدا ئەبی. هەر ئەوساتە لگەل قادر أغای مامی فراراً ئەچی بو سقز. لەرغمی ئەو هەمو اعتماد ودلنوازی کە حمە رشیدخان

درحق بەم کورەی هەبو. ئەو خبری وحشەت انگیزە سلبی هەمو اعتماد ودلنوازیکی لی‌کرد.

جا لەئەوەلی ورودی نیروی دەولەتی شاهنشاهی بەأزربایجان عوائلی ئەو دو أغا شهیدکراوە اذن درانەوە وبندیەکانیشیان بەرەلا کردن. واملاکەکانیشیان بو اعادە کردنەوە. ولەتعاون وبخشندەگی خوشکەکانی شاش بشدارکران. لەغیراز ئەو دو عائلەیە نەبی هیچ کوردیکی‌کە استفادەیان لەبخشینو چاکەی هلالی احمری ایرانی نکرد.

## قرّەی بینی مالك و رعیەت

وختی کەدەولەمند وخاوەن ملکە فراریەکان لەتاران گەرانەوە بوسەر ملکە غصب کراوەکانیان. رعیتەکانیان بو حصّەی مالیکانە هەل پیچا. لەبینی رعیەت ومالکەوە هاوار وقیژەیکی گەورە بەرپابو.

چونکە رنجبر وجوتیار ورعیّەت رسوماتی مالیکانەیان دابو بەتاقمی دیمکراتیەکان. مالك وأغاش ئەو معذەرەتەیان قبول نەاکرد. هەر داوای رسمیاتی أغایانەی خویانیان لی‌اکردن هەتا لەلاین قوام السلطنەوە امر بەأستانداری تەوریز (أغای پیرینا) وفرماندەی لشکر هاشمی درا کەمالك هەرحقی ادعای مالیاتی تازەی لەرعیت هیە. هەرچیکی کە لەمو پیش دفع کراوە بەچاوی تصدیق تماشا اکری. بەلام دەولەتی ایران ئەو مضمونەی تنها بو حصەی مالك وزارع تصویب کردبو. بەشی عائدات ورسوماتی مالیەی دەولەتی کسبی مروری نکردبو. لەرغمی ئەوەی کەمأمورینی دیمکرات بەفضلە ئەو رسوماتانەیان تحصیل کردبو.

اجاحکومەتی ایران رسمیات وضریبەی چند سالەی لەناوچوی خوی کردبو بەبقایە ودو چند لەأغوات ومالکیان سند. حقیقتاً لەو جهتەوە ملەتی أزربایجان ومهاباد زور مغدور بون خلاصە هەرچیکی کەخلکی لەوناوچانە لەدەوری ژیانیانا کویان کردبووە یا بەتالان‌ورەو یا بەناخواردنی لشکرچیەتی ویا بەتەشقەلەی امنیە ورشوەت ویا بەروسومات ومالیاتی چند قاتی حکومەتی لناویاندا وخویان (کما خلقتني ربي) بەرەشوروتی مانەوە.

## محافظەی امنیەت لەایرانا

اجا لەدوای استقراری أسایش بو اقتصادی خزینەی حکومەتی ایران تشکیلاتی غیرە نظامی لەهەمو حدودی ایرانا دامەزران. پاسگای امنیەتی بەبی پولو درامەت بەسەر عشائرەکاندا دابەش کرد. هەر أغایەی چند تفنگیکی لەو تفنگە شکاوانەی کەلەوختی خویا لەعشائرەکانی ورگرتبونەوە تسلیمکردن. سەرەڕای ئەوەی کەبرامبر بەو محافظەی پوسطی حدودەش هیچ هیچ پارە ومخارجیکی نەادانی. هەم رەشوەت وبرتیلیشی برامبەر بەو تفنگانە لیاستاندن. ولەمەرز وسنوری هەر أغایکیش جریمەیك رویدابایە. چنگ لەسەرشان ئەو أغایەیان بەبال بستراوی ئەبردە شارەکان هەتا سەری خوی زور بەباشی بەسرلشکر وفرماندارەکان نەقبلاندبا اجازەی گەرانەوەیان نەئەدایی.

| عددی تفنگ | ناوی أغا | ناوی عشائر | ناوی منطقە | ملاحظات وئاگاداری |
|---|---|---|---|---|
| ٥ | قادرخانی أرمردە | بانە | بانە | |
| ٥ | حمە رشیدبگی بلکی | بانە | بانە | |
| ٥ | نصرواللەخانی روستمی ساوان | بانە | بانە | |
| ٥ | احمدبگی حاجی نائب نیزەرو | بانە | بانە | |
| ٥ | عزتخانی نمشیر | | | |
| ٣٠ | محمدی جونمردی تموتە | گەورکی میەدی | سقز | مع العلم باوکو مامی اعدام کرابون |
| ١٥ | أغا صالح سلطانپناە | تالەجر سرشیو | سقز | |
| ١٠ | محمودخانی ملە | خرخرە | سقز | |
| ٤ | محمدی حاجی وکیل قباغلو | وکیلی | سقز | |
| ٥ | رشید الدیوان | سرشیو | سقز | |
| ٤ | أغا رشید | سرشیو | سقز | |
| ٣٠ | مظفرخانی علی جیسیی | تیلکو | سقز | |
| ١٥ | علیخانی حمەویسی | گلباخی | سقز | |
| ١٥ | حمە علی فیضە | گلباخی | سقز | |

| | | |
|---|---|---|
| ١٥ رضاخانی کلهر | گلباخی | سقز |
| ١٠ حاجی حمەخانی دایەسلیمان | خرخره | سقز |
| ٥٠ عبداللەخانی بایز پاشا | منگور | سابلاغ |
| ٣٠ سلیم أغای بایز أغا | وجاخی کاخدر | سەردەشت |
| ٥٠ مامعزیزی قرەنی أغا | مامش | لاجان |
| ١٥ حاجی بایزأغای ایلخانیزادە | دیبکری | بوکان |
| ١٥حاجی محمودأغا ایلخانیزادە | دیبکری | بوکان |
| ١٥ کاكالله أغای حسنأغا قلقلە | گەورك | بوکان |
| ١٥ بایزی عزیز أغا | گەورك | سابلاغ |
| ٥ عبداللەخانی شهیدی کانیگویز | بانه | بانه |
| ٥محمودخانی روستمی شیخ چوپان | بانه | بانه |

جابەو دەستورە لەکافەی مناطقی مەرزی تشکیلاتی پاسگاە وسەرپەرشتی لـەلاین عشائرەکانەوە بەشکلیکی اجباری هەتا ئەو تأریخە کراوە. وفخریاً أغواتی ئـەو ناوچانـە ئەو واجباتە گرنگەیان بەانجام ئەگەینن.

## *علاقەی قاضی محمد وحکومەتەکەی لگل عراقا

کـە قضیـەی کوردوسـتانی قـاضـی محمـد بلاوکرایـەوە. لەهـەمو لایکـەوە ازادی خواهانی کورد رویان کردە ئەو قبلەی ازادی و سەربەخویەتیە. لایان وابو کـەروس وکـو انگلیس سیاسەت ناکا وروحی استعماری تیـا موجـود نیـە. جـا سـابلاغ وکـو مسـجد الأقصای لیهات. چە بـەمخابرەو چـە بەمعاوەنـەت وچـە بەاشـتراکی شـخصی لەهـەمو لایکەوە اشخاص وجمعیات اعتمادیان خستەسەر قاضی محمد وملا مصطفی وئـەو ضابطانەی کـەفراراً چوبـون بـو نـاو کوملـە لەهەمولایکەوە احزابـەکان پارەیـان کـو اکردەوە ئەیان نارد بو خزینەی قاضی محمد. و بعضاً هەر مباشـرەتاً بـو بارزانیـەکان وهیندی اعانە رئساً بو ضابطە فراریەکان روانە اکرا.

منطقـەی کویسـنجق ورانیـە هـەر اعانـەیکیان کەناردبایە بـو مـلا مصطفـی وبارزانیەکانیان ئەنارد. بالخاصـە کاکـە زیادأغـای کویـی بـو تعـاونی مـلا مصطفـی وخیلی بارزانی زور بەپەروش بو. هەتا لەوختیکا کە ملا مصطفی لەبارزان مشـغولی

حرەکات بو. لەو وختە راهن وخطرەدا پارەیکی زوری بو ملا مصطفی ناردبو. ولەسەر ئەو موضوعە لەمانگی تشرین الّوەلی ۱۹٤٥دا حوالەی دیوانی عرفی کرا لەهولیر بەلام خوشبختانە رزگاری بو.. وقضای قلادزەش هەر اعانەیکی کەکویان بکردایەوە یکسر بو قاضی محمدیان ئەنارد. واعانەی سلیمانیش بعضاً بە ملا مصطفی وضابطەکان وبعضاً بەخزینەی قاضی محمد اگیشت. ومبلغیکی زوریشی هەر لەسلیمانیە دەرنەئەچو ئەخرا ولەلاین ابراهیم احمدەوە ادارەی حزبی پارتی دیمکراتی کوردستان ادارە ئەکرا. منوەرەکانی سلیمانی هاتوچوی سابلاغ وتوریزیان اکرد. ترتیبات وأرای احزابەکانیان لەمرکزەکان تسجیل اکرد. لەبهاری ۱۹٤٥دا اسمعیل شاویس-چو بو تەوریز لەتەوریزا چند خطبەیکی بەسامی خوینەدەوە. وخوی بەاهالی مهاباد وئەو ناوچەیە ئەناسی کە من (هتلری) کوردم. هتلر لەالمانیا چە مرکزیکی هەیە منیش لەناو کوردەکانا ئەو مرکزەم هیە. لە ۱۹٤٧دا ملاقاتی حسنخانی بداقیم کرد گوتی عراقیك ناوی (ماموستا شاویس بو هاتە مالی ایمە لەبوگەبەسی ئەو شخصە کردەوەکانی زور سیربو. لەلایکەوە بەایمەی ئەگوت کەمن بەقدەر هتلر لەناو کوردەکانا اهمیت دارم. لەلایکیشەوە ایگوت من لە(پاریس خویندومە. تربیەی بەراز دوشین-باش فیربووم. أیا شخصیك کەئەوندە عالم بی وبقدەر هتلر لەبەرچاوی شعبا خوشەویست بی چون ئەبی لەپیش هەمو تشکیلات وانظمەیکی عقلی وعملی. تەرز ورەوشتی بەراز بەخیوکردن بەقومەکەی نشان بدا. کەئەم پیرەویەیان مطلقاً مخالفی ادابی اسلامیە. اگر لەناو مسیحیەکانیش شیری بەراز وتربیەی براز شتیکی باش بی. هەرچند کەکورد پیشکەوتوبی دیسان آدابی اسلامی براز هەربەپیس ئەزانی. منیش گوتم بلیم چی فیلسوف وپیاوە تی‌گیشتوەکانمان بو اقتصادیاتی وەلات هەتا چاوپوشی لەتربیەی برازیش ناکەن (جانازانم لەپاش گەرانەوەی لەسابلاغ وتەوریز ماموستا شاوەیس بو بەانصاری سلام وتحرر ویا پارت. ویا هەر بیطرەفانە مایەوە.

هەتا تشرینی اولی سالی ۱۹٥۰کەبەناوی انصاری سلامەوە لەگەل ٥۰ نفریکا مضبطەیك لەبابەت شەرنکردنی کوریا امضا اکات. وبەو تهمتە دور روژ توقیف کرا. ولەبەرەلاّبونیا هەتا ئەو تأریخە مسلکیکی نهینی بیطرفانەی بو شخصی خوی انتخاب کردوە.

حزبی پارت وتحرر علاقەیکی زور گەورەی لگل حکومەتی قـاضـی محمـدا هـەبو عاملی رئیسی ئەو حزبانە. عبارەت بون لەابراهیم احمد محامی وهمزه عبدالله محامی فراری وامین‌أغای حاجی ملا محی‌الدین ومحمـود احـمـد وجلیـل هوشـیار وکمـالی مـیرزا کریم حاجی شریف وزور لەمنورانی. کەبەباشی موقفیان لەلای ایمەوە رەوشن نیە. ئـەو حزبانە بەهوی اختلاطی کە لەبینی‌یانا موجود بـو. هـەر نفری کەویستبای اشتراکی کوملە بکات ابوایە اجازەنامە وشهادەتی حسنی سلوکی لەوحزبانـە وەربگرتایـە انجا لەساباڵغ را اگیرا والاّ مدەتیکی زور لەزندانا ئەمایە. هەتا محمـدی کریمـی قـادر-نـاوی سلیمانی کەلدائرەی عسکریدا مضمـدی صحـە بـو. بـەچند دەرماناتـەوە فـرار اکـات ئەچیت بو ناو کوملە. بەلام لەرغمی ئەوەی کەچووە خذمت بکات نـازانی کـەمراجعت بەحزبەکان بکات بو کارتورگرتن.

لەساباڵغ گیرابو ٣ســی مـانگ بـو توقیفکرابـو. نوسـرابو بـو عـراق بـو تحقیقـی هویەتی هەتا تێکچونی ساباڵغ هویەی هەر نگرابووە. بەهوی انقلابی سـاباڵغ لـەزندان رهایی‌کرا.

فـراری ضابطـەکان عراقـی تـأثیراتیکی زوری کردبـو سـەر روحـی جیـش. اگـر مدەتیکی کە ئەو حکومتە تیك نچوایە. اکثـری ضابطـە کوردەکـانی جیشـی عـراق فراراً ئەچون بو ایران. نوری ملا حکیم بهجت عونی لەوافسرانە بوون کـەفکریان وابـو بەچند مهماتیکی جنگیەوە لەهاوینی ١٩٤٥دا التحاق بـە مـلا مصطفـی بکـەن. اگـر تجسّـسـی أوالـە ضـابطـەکانی رفیقـی خویـان نبوایـە. ئـەوانیش اقدامـاتیکی زلیـان پیکئـەهینا. فـائق. رئـوف-خسـرەو-پاشـا-مـانعـی ئـەو خذمتـە بـون هـەروکو مـلا مصطفی لەدوری ایرانیا اتصال وکومـەگی پی‌اکـرا. لـەدەوری عصیـان وشەرەکەشـیا لەلاین عشائری لوای هەولیر یارمـەتیکی زوری درا. بـەلام لـەلوای سـلیمانی لـەدەوری حرەکاتەکەیا هیچ کسی یارمەتی نەدا. تنـها بابـەعلی حفیـدزادە وشـیخ رئوفـی حفیـد نەبی مضبطـەیکیان کردەوە بـو حکومـەت بـەناوی هـەمو روسـای عشـائری پشـدەر ومجاوری واشرافی شاری سلیمانی. کەمفـهومی ئـەو مضبطـەش ئـەوەبو کـەهیچ نـەبی حکومەت ئەو تعدا بی انصافەی کەلەبارزان ایکـا چاوپوشـی لی‌بکـات. بەشـکلیکی‌کە تسکینی وضعیتی ئەو ناوە بکا.

لەدرجەی دوهمیشا بلکو بەهوی ئەو نیم‌چە انذارەوە حکومەت ضغط لسەر بارزانیەکان هلبگری شکلیکی تفاهم ومسالمەت وربگری. بەلام لەئەوەل درەجەدا پشدەریەکان ولەدرجەی دوهەما اشرافی سلیمانی نەمضبطەکەیان امضا کرد ونەمعاوەنتیکی مادی وعملی ملا مصطفی‌ش‌یان کرد. بەلام مجلەی أزادی لەرغمی ئەوەی کەتنها بابەعلی وشیخ رئوف مائل بون کەیارمەتی بارزانیەکان بدری. ئەو چوبو لەضدی شیخ محمود وألی‌حفیدان زور تجاوەزاتی کردبو. لەسەرئەوەی کەهیچ معاونەتیکی عملی ملا مصطفی نکراوە. وتکذیبی هەمو قومیەت وحرەکاتیکی شیخ محمودی کردبو حقیقتاً لیرەدا شیخ محمود برامبر بەم سکوتەی کەکردبوی مسئول بو. چونکە ئەی‌توانی بو رفعی ئەو حرەکاتە عظیمە نمایشیکی سیاسیانە برامبر بەحکومەت بکا وتسکینی ئەو أژاوەی رواندزە بەباریکی مسالمەت وأشتیا ریک‌بخری بەلام داخەکەم کەی لەناو کوردکان ئەو عاطفەیە برامبر بەیکتری بووە کە لەبەسەرهاتیکی أوا گرنگا یارمەتی یکتر بدەن. لەهەمولایکەوە هەردار بەدار وتعقیباتی غرضکاری بووە) بەرغمی ئەوەی کەبارزانیەکان لەوختی خویا هیچ کومگیکیان بەشیخ محمود نکردوە. ئەویش لەو فرصتەدا گوی خوی لەقضیەی بارزان کەڕ کردبو وتولە بەتولەی لەگلا کردن.

## اتصالی شیخ محمود لگل کومەلەدا

شیخ محمود شخصاً جنبەی تفاهمی لگل قاضی محمد وروسەکان کردبووە بواسطەی (شامە بورەکی) پیاوی کەشارەزای زمانی روسی بو دەرگای مخابراتی لگل روسەکانا خستبو سەرپشت. لە ١٩٤٥دا بەشدەت مخابراتی شیخ محمود بو بنای شورشیک لەشمالی عراقا لگل روسەکان لەجرایانا بو. بەلام هەردو تەرەف بەگیانی سیاسەتکارانە یکتریان تفرەئەدا. شیخ محمود بەو ناوەوە داوای اسلحە و قورخانەیکی زوری لەروسەکان اکرد بو مباشەرتکردنی بەبنای حرەکات لەکوردوستانی عراقا.

روسەکانیش ئەیانەویست شیخ محمود اثباتی صداقەت بکا. لەضدی حکومەتی عراق قیامیک وخوین‌رێژیک بکات انجا کومەگی اسلحەی پی‌بکەن بەناوی قاضی محمدو حرەکاتی ایرانەوە. انجا کە شیخ محمود بوی ثابت بو کەروسەکانی بو اخفال‌نابن و قاضی محمد وملا مصطفی مائلی پیشکەوتنی ئەم نابن. وخویشی حرەکات وأژاوەی

لەو وختەدا بو ناکری. ناچاری بادانەوە بـو وخـوی بەانگلیسـەوە هەلاوەسیەوە. دەستی کـرد بەدعایـەکردن لـەضدی قـاضـی محمـد وتشـکیلاتەکەی. بـەو عبارەتـە دعایــەی لەضدی قاضی محمد اکرد (گا کردی کەر خواردی یعنی من رنجـم دا کـەچی قـاضـی محمد استفادەی لی‌کرد.

شیخ محمود هەروەکو بەحرەکاتی قاضـی محمد مخالف بو لەضدی حرەکاتەکەی حمە رشیدخانیش بو.هەتا لە١٩٤١دا لەسقز حمە رشیدخان پی‌گـوتم کـە بواسـطەیکەوە لگـل شیخ محمودا اتصال بکەم کەئەوندە لەعلیە حرەکاتی حمە رشیدخان نەبی گوایـا بـەدایمی درگای مخابراتی لەضدی حمە رشیدخان لگل حاجی بابەشیخ ترجان وشیخ جلالی خانقـا وشیخ عبدالقادری دوزخدەرە کردوتەوە کەمیدان نەدەن حمە رشیدخان لەخطّە وفکرەیـا ناجح بی.

منیش بەحمە رشیدخانم گوت هیچ گونـە تشبسـاتیك بەشـیخ محـمود مکـە. چونکـە بەتشبسەکانت شیخ محمود تشجیع ئەبی واستمرار لەسەر ضدیاتەکەت ئەکا. اگەر بوت اکری اظهاری اکراهیەت برامبر بەشیخ محمود بکە چونکە لەو وختەدا باشـتر اسـتفادەی دوستی لی‌ئەکەی. چونکە ألی حفیـدان بـەصدق واخـلاص وەفـاوە کەسـیان نـاوی. هـەتا درگای ضدیەتیان لەرو نکەیەوە. ویانە لگل دوسـتەکانی ئـەو ریك‌بکـەوە دعایـەکانی بەبی قیمەت ئەمەنی‌تەوە. فعلاً حمە رشیدخان نقطـەی دوهەمی لەأموژگاریەکەم پسـند کرد وشیخ محمودی بەبی تأثیر هیشتوە.

اجـا شـیخ محـمود استفادەی شـخصی لـەظروفو زەمـان کــرد جنبــەی زراعــەت وفلاحەتی بو خوی هلبژارد. ناحیەی بازیــان. قـرەداغ. سـورداش. شـارباژیر. شـارەزوری بەتەواوی خستە ژیر نفوذی خویەوە. وبو کوژاندنەوەی هیزی کوملـە وتـأثیراتی هاتنـە عراقی. بـەدوربی‌نی انگلیـس شـیخ بابـەعلی حفیـدزادە لـەدورەی ارشـد العمـر ونـوری سعیدا لە ١٩٤٦دا کرا بەوزیری اقتصاد. بەلام داخەکەم وزیریەتی ئەو گنجـە تی‌گیشـتوە هەر ئەوندە دەوامی کرد هەتا حکومەتی قاضـی محمد لەناو هلگیرا. ومترسی حرەکـاتی کوملە لەعراقا نەما. اجا بەاشارەتی انگلیس بابەعلی لـەوزارەت درهـاویژرا وبوئـەوەی کەلەو ظروفە نزیکانەدا داخلی وزارەت نەبی‌تەوە متهم کرا بـەوەی کـە ١-اغراضـی شخصی تعقیب اکات.-٢-انتسابی عشائری ترجیح ادا بەسەر احوالاتی سـکونەتا-٣-

برامبر بەو اجانبانەی کە بەعقدی موقــەت لـەعراقا ایش ئەکـەن تحقیرات وتعصیبـات نشان ادا.

هـەتا عمر نظمـی لــەوختیکی تشـیکلاتی وزاریــدا لەســالی ۱۹۵۰دا اعــترافی بەومادانەی سرەوە کردوە. کەگوایا عبثی نصایح. هتا وصـی عراقـی لەشیخ بابـەعلی متأثر کردوە. لەتغیری سیاسەت وظروفا نەبی شیخ بابەعلی ناکریتەوە بەوزیر.. بـەلام فعلاً معالی بابه علی مسلکیکی بی طرفانه وشـریفانەی بـو شـخصی خـوی اختیـار کـردوە. وهـەرچیکی هـەتا ئەوتأریخــه کردبــی لــەریگایکی زور عـاقلانــه وأرامیــەوه کردویەتی. حەزی بەنمایش وخو دەرخستنیکی دروزنانه نکـردوە. وشیخ رئوفـی براشـی لەپاش نیابەتی ٩٤٤یـەوه جـداً طریقـەیکی مسـالمەت أمـیز وانصافکارانـەی اختیـار کردوە. ئەویش رەویەیکی شریفانه ومخلصانەی قەومی بــو خـوی انتخـاب کـردوە. وبـو اکثری معالجەی فکری وقومی له اختلاط وأرایشی شیخ محمـود خویـان بـەدورگرتوه. وبو أزمایشی عملیاتی رابوردوی شیخ حدیکی فاصلیان بو خویان هەلبژارتووه.

## عشائری پشدەر لەدەوری قاضی محمدا

للاین عشائرەکانی عراقەوه اتصـالاتی کلّـی لگـل قـاضـی محمـدا دەسـت پـی‌کـرا، بالخاصه عشیرەتی پـژدەری بـەاندازەیکی بـەرز داخلـی تفکراتـی قـاضـی محـمـد بوبـون. وهەتا ئەو اغواتی خوارەوه بەروتبەی ناوزدیان امیدەوارکرابون.

بەلام هەروەکو لەبینی روس وشیخ محمود حیلەیکی فکـری هـەبو. لـەبینی قـاضـی محـمـد وپژدەریـەکانیش حیلـەیکی بـارز هـەبو کەهـەمو کـەس ایتوانـی بی‌خوی‌نی‌تـەوه پژدەریەکان بەمناسبەتی ئەوەی کەلەسالی١٩٢٤دا لەدیهاتی کلوی هەتا اگاته (پاراستان (ونواوی (ودەشتی) وشیسلمان)و میرگانو-و منطقــەی سویسـنایەتی وربـط وألانـی بایپرأغـا-املاکاتیکی زوریان خستبو ژیـر تصرفـاتی خویانـەوه بعضـاً بـەناوی خرید وقباله وبعضـاً بەتأثیراتی کوشتن. ولولەی تفنـگ هەتا لەدی (نەلاسی) کلوی خـدری بابکرأغای سلیم‌أغا پینج کـوری حـاجی احـمـد نـاوی کوشـت لەسـەر تمرد و اطاعـەت

نكردن. له۱۹۲٥دا حكومەتى ايران قسميكى لەأغاياىانى پژدەرى گرت ومقابل بەچند پارە وجزايك لەتارانەوە اذنى دانەوە. وپژدەريەكانيش لە ۱۹۲۷دا شەريكى زور مەردانەيان لە (منطقەى بيوران‌و قلەرەشە ودرماناوى) لگل حكومەتى ايرانا كرد [1] سلطان اصغر ناوى فرماندەيان بەاسيرى گرت‌و بەكوشتاريكى فاحشى طرەفين سەردەشتيان بەحكومەتى ايران تخليە كرد. وەهتا سلطان اصغر لگل ۳٦ نفرى اسيرا بواسطەى شيخ محمودەوە تسليم بەحكومەتى عراق كران. انجا حكومەتى ايران لسر تشبساتى كە بواسطەى عراقەوە پيكى هانى‌بو. املاكاتى ايرانيان ماعداى قلەرەشى وە وردە وبنەخلف لەأغاياىانى پشدەرى كريوە بە ۱۹ هەزار ليرەى عثمانى. واحمد تقى- عمولەى- ئەو اتفاق وريك‌كەوتنە بو وا اعتقاد اكرى كە احمد تقى‌ش لەو رهبر وممثليەتەيا هەزار ليرەيك استفادەى كردبى هەرچند كەپشدەريەكان قصەى زورتر لەوخيانت الأمانەتەدا ئەكەن بلام احمد تقى هەرپى لە ٥۰۰ ليرە ئەنى كەئەمەش برامبر بەو رنج ومحاولەى وەكالەتەيدا شتيكى كەم بووە وحق الزحمە ئەو لقمەيە هەڵ‌ئەگرى.

جا پشدەريەكان بەاميدى استردادى ئەو ملكانە بەناوى خذمت وفداكارى كوردوستانى أزادى قاضى محمد خوريان ئەخستە لاى قاضى محمد وبەدليكى پر لەتعصب وچاويكى پر لەفرميسكى نيشتمان‌پەرستى صلوات‌يان لەديدارى قاضى محمد وألاى بەرزى كوردوستان ادا. بەلام قاضى محمد فلسفەى شيطەنەتى راستەقينەى پشدەريەكان تى‌گيشتبو كەغايەيان تنها ئەوەيە بەدارى حكمى قاضى محمد پشتى عشائرى كلوى وسويسنايەتى بشكينن. كالسابق ئەو عشائر وديهاتانە بخەنەوە ژير

[1] حسن بايز پاشاو همزاغا ناوانى منگور شەريكى باشيان بو پژدەريەكان كرد.

سیطرەت واستعماری بی وجدانیەوە. جا قاضی محمد مائلی ئەوە نەبو کەپشدەریەکان بچنە ایران بلکو ئەیەویست لەعراقدا ئەوانیش اقدام وحرەکاتیك بکەن.

وبواسطەی زیرو فرماندەی لشکری سەردەشت روتبەی فخری ئەو أغایانە تبلیغ کرا. بەلام پشدەریەکان نەیان أویست لداخلی عراقا هیچ أژاوەیك لەو وختەدا بنیـنەوە هەر بو سیوی سەردشت ورونەکەری) دارمی-بەپەروش ودل گەرم بون. جابەو مناسبتەوە هەتا نهایەت هردو طرف استفادەیان لەوجودی یکتر نکرد. بەلام لەو أخرەدا هیندی لەأغاواتە روتەلەکانیان هاتبونە سەر حرەکات وأژاوەیك لداخلی پشدرا.

ئەگەر لەو چندانە وضعیتی کومەلە تیك‌نچوایە. لەضدی حکومەتی پژدەرا اقداماتیکی عملیان اکرد ناوی ئەو أغا پشدەریانەی کەلەلاین قاضی محمدوە درەجەی دیمکراتیان پی‌بخشرابو

| روتبە | ناوی أغا | | ناوی دی |
|---|---|---|---|
| ملاحظات | | | |
| پولکونیك | باپیری بابکری سلیم أغا | گردە سپیان | مع العلم بابکر أغا سەریە انگلیسەکان بو. |
| پات پولکونیك | شیخ محی‌الدین | صندولان | بو استفادە لەوملکانەیان. باپیری کوری |
| پولکونیك | محمودی حاجی رسول أغا | هیرو | کردبو بەقاضی محمد پەرست. |
| پات پولکونیك | سلیم حاجی رسول أغا | گرمکان | |
| پولکونیك | باپیری بابکری محمود أغا | نورەدین | رئیس قومیتەی پشدەر |
| پات پولکونیك | ابراهیم عباس أغا | بیکلو | |
| پات پولکونیك | عبدالله أغا حمەی رسول قادرأغا | کوخەلیز | |
| پات پولکونیك | خدری حمەی قادرأغا | کوخە لیز | |

| مايور | بايزى بابكرى سليم‌أغا | گردسپيان |
|---|---|---|
| روتبـــــــه | نـــــاوى أغـــــا | نـــــاوى دى |
| ملاحظات | | |
| مايور | برايم حمدأغاى برايم‌أغا | ديرى |
| مايور | كاكه مەرى أمين‌أغا | گرد ميتر |
| مايور | برايم رشيدأغا | پيمالك |
| مايور | بابكرى حمه رشيدأغا | پيمالك |
| كبتان | حمسورى كورى حجى أحمدأغاى باپيرأغا | هلشو |
| كبتان | باپيرأغاى قرەنى‌أغا | بيشير |
| كبتان | كاكه مەرى حماأغاى برايم‌أغا | ديرى |

خلاصه اراضى حكومەتى عراق بويــو بەملعبــەيكى سياســى قــاضى ومركـزى مخالفاتى ايران روى‌كردبو عراق. وهەر فرده وكومەلەيك بەوينــه نغمــەيك خــوى نشـانى قاضى محمد ئەدا. بعضاً بەحقيقەتى قوميـــەت وهينديـك بـەبونى تفنـگ ودمانچـەى برنەوەوه. وهيندى بەهيواى نائيل‌بونى دەرەجاتى كوردوسـتانى قـاضى محمـد. دەرگـاى مخابراتيـان بـو قــاضى محمـد خســتبو سەرپشــت. هــەتا علــى حسـن‌أغاى رئيســى منگورى‌زودى پيش شكستى ديمكرات بەهەمو معنايكەوه پياوى قاضـى محمد وكوملە بو. بەلام كەكومەلە نەما. بەبى‌مناسبەت لەسنگان شەرى لگل بارزانيەكانا اكرد هــەتا لەتموزى ١٩٤٦دا حمەى شيخ ئەلى سەركار بەنمايندەى حفصــەخان وشيخ قـادرى حفيـد- بەهەراهى عبداللەخانى شهيدى هاتە ســرا. لەســرا ملاقـاتى مـلا مصطفـى‌ى كـرد وبـەفكرى سـابلاغ وچاوپيكـەوتنى قـاضى محمـد چـو بـو بوكـان. بــەلام لەبەرئــەوەى كەلەعراقەوە بەقاصدى مخصوصاً لەحزبى پارت وشيخ لطيفــەوە. مخـابراتيكى دورودريـژ درحق بەحمەى شيـخ عــەلى بـەحزبى بوكــان‌و ســابلاغ گيشـتبو كەئـەو شـخصە بـەچاوى جاسوس تماشا بكەن وتمثليەكەى خاليە لە هەمو طريقــەيكى انسـانى وقومـى. وئـەو شخصە تمثيلى هيچ كسيك ناكا لەشيخەكان. جالەبەر ئەو تقريرە پر شخصيەتە ميدان ندرا كەأغاى حمەى شيخ على بچـى بـو سـابلاغ ومراسـيمى نمايندەيەكـەى پيكـابى‌نـى. تحت المراقبه تسليم بەسەرزى عراق كرايەوە.

## مهاجرینی کوردوستانی قاضی محمد لەعراقدا

اجا کەحکومەتی قاضی محمد تێكچو عراقیەکان هەریەکەیان بەفیلیك هاتنەوە عراق بعضاً محکوم وبعضاً بەبهانەیك رزگاریان کرا. مثلاً قانع کە لەنغدە معلمی مندالان بو. لەقلادزە لەلاین قائیمقام عبدالرحمن شەرف- مضبطەیکی بەناوی دی (دارەشمانە) بو کرایەوە کەئەو قانعە دوسالە لەدی دارەشمانە توتنەوانە. وبو عثمان دانشیش-مضبطە کرایەوە کەدوسالە ئەو شخصە کاتبی أغایك بووە لەمنطقەی پشدەرایەتیدا. عراقیەکان بەو تەرزە هەریەکەیان بەفیلیك هاتنەوە بو عراق. بەلام ئەو افسرانەی خوارەوە کەلەلاین حکومتی قاضی محمدەوە خویان بەخاوەن درەجە وگوناە ئەزانی لەأقار حکومەتی ایرانا بعضاً بەمالەوە وبعضاً بی ژنومال هاتنە عراق. هیندیکیان لەدوای استقراری امنیەت گرانەوە بو ایران وبعضاً هەتا ئەو تأریخە هەر لعراق ماونەوە.

| ناوی أشخاص | رینەی وظیفە | لەکوی دائەنیشی | چی لی‌هات |
|---|---|---|---|
| ١-سید محمدی حمیدی | مدیری روژنامەی کوردوستان | لای شیخ علاءالدین زینوی شیخی رواندز | |
| ٢-دلشاد رسولی | معاونی وزارەتی معارف | کویسنجق | توبەی کرد |
| ٣-ذبیحی | ممثلی سیاسی سقز | لای شیخ لطیفی حفیدزادە | مستعاراً کراوە بە میزا قادر |
| ٤-ابراهیم نادر کرماشانی | رئیسی محاضراتی علمی | چو بو سوریە | |
| ٥-هەژاری شاعر | شاعری ملی کوردوستان | چوبو سوریە بو تداوی سیل و لەتجوالا ماوەتەوە | |
| ٧-هیمن | شاعری ملی کوردوستان | مجهول | |
| ٨-عبد الرحمن امامی | معاونی شعبەی تحقیقات مهاباد | بغداد | |
| ٩-محمدی مولود | افسری حرەکاتی | پشدەر قلادزە | |

| | | |
|---|---|---|
| | سردەشت | لپاش مدەتیك گرایوە |
| ١٠-خانانی أردەلانی | کبتان لەحرەکاتی سردەشت | تسلیم نفسی کرد. بەأسیری برا بو تاران لەدوای دوسال أزاد کرا |
| ١١-صدیقی حیدری | وزیری اقتصاد (لەقلادزە) | |
| ١١-حمدی | مأموری اسلحەی مهاباد | لای شیخ لطیفە لەسلیمانی |
| ١٢-ملا عبدالله حصار | معاونی حزبی بوکان | لای شیخ لطیفە لەسلیمانی |
| ١٣-شیخ محسن | رئیسی حزبی بوکان | لای شیخ محمود |
| ١٤-ملا سعیدی محسن | بازرەسی حزب | لای شیخ لطیف اقامەت اکا |
| ١٥-میرزا ابراهیم | مفوضی تحقیقاتی زندان | گرایەوە بو سابلاغ |
| ١٦-زیرروی هەرکی | فرماندەی هیزی سەردشت | مدەتیك محکوم کرا وایستا لەناو عشیرەتی هرکیە |
| ١٧-سید عبدالله سید طە | فرماندەی نغدە | لەمنطقەی رواندز اقامەت اکا |

بەلام احزابەکانی عراق هەتا نهایەت هیچ گونە یارمەتیکی ئەو اشخاصانەیان ندا. انکارناکری کەشیخ محمود وشیخ لطیف بۆ یارمەتی ونوای ئەو لیقەوماوانە بون بەقەلات وسدّیکی زور گەورە. و بەهەمو مقدەرتێکیانەوە امادەی یارمەتی ژیان وخوشی ئەو پناهیدانەبون.

هەتا لە ٢٧کانونی اولی١٩٥٠دا کەلەلاین جلال خالد متصرفی سلیمانیەوە شیخ لطیفی حفید بەتهمەتی یارمەتی شقی مشهور خلەپیزە گیرا وروانەی ناصریە کرا.

لەلاین رئیس الوزرا نوری سعیدەوە بواسطەی سیداحمدی برزنجی کاغذیکی شیوە انذار درا بەشیخ محمود. کەلازمە ئەو چتە وقاچاخانەی کەلەایرانەوە التجایان پی‌کردوی یا تسلیم بەحکومتیان بکەی ویا اذن‌یان بدەی کەلەلات نەمینن.

لەرغمی ئەوەی کە بابەعلی کوریشی موءیدبو بو دەرکرانی ئەو پناهیدانە بەلام شیخ محمود محافظەی ئەو لی‌قەوماوانەی کرد. هەتا نهایەت دەستبەرداریان نەبو. وبەعینی دەستوری رابوردو لەسەرپەرشتی ژیانیان دریغی نکرد. جا قضیەی تشکیلاتی قاضی محمد وأژاوە وبەسەرهاتی کوردوستانی ایران لەایلولی ۹٤۱وە هەتا نهایتی ایلولی ۹٥۲ بەوپی‌یە دوایی هات کەبەعرضم‌گیاندن. بەلام لەرغمی ئەو هەمو دەرد وجفایەی کەکوردەکانی ایران وعراق وتورك لەریگای قومیدا چیشتویانە. بصورەتی قطعی روحیەی ملیەت وسەربەخویەتی‌یان دەستنەدەدە نەبووە. وبەم هەمو أزار و بی‌حرمتیەی کەدرحقیان کراوە لەهەدەفی قومی بازگشت نین. لەهەمو دەوروساتیکا چاوەروانی هەل‌وریکەوت ئەکەن کەپەلاماری دوژمنە خوی‌نیەکانیان بدەنەوە. سیأتی دەوری مصطفی کمال ورضا شاە شتیکی ئەوندە پیسی نشانی ئەو ملتە نازدار ونجیبەی کوردە داوە کەهەتا أخر هناسەی کور وکچیان ئەو بەسەرهاتە بی‌ناموسەی دکتاتوری‌یە فراموش نەکەن.

جەوری بی‌اندازەی استبدادی تورك گیشتوتە مرحلەیك هەتا زمانی کوردی کەزمانیکی مادرزادی ئەم قومەیە ولگل ورودی بەشەرا. بوتە راویژی حسّاسی هوزی کورد. لەو زمانە بەمیرات بەجی‌ماوەی چند هەزار سالانە محروم کراون. ئەوکسە جزا ادری کەبەوزمانە لەتورکیا قصە بکات وبعینی دەستوریش لەخاکی ایرانا تطبیقاتیکی سیاسیانە لەدەوری رضا شادا کرابو کەهەتا ایستا تأثیر وأثارەکەی لەدەوائری دەولەتی ایران پایەدارە. بو اثباتی تفرەقە ونظامی استبدادی ایرانیەکان ئەمەوی بەانواع وثائق ووسائل بدویم بەلام لەبەرئەوەی کە لەوە زیاتر لەشهامەتی خویندەوارە هەژارەکانی کورد زانابینم. کەلەوە بەتفصیل‌تر دەستەبەری چاپکردنی ئەو بەسەرهاتەیان ببن. جا ئەمەوی چاوپوشی لەهیندی وثائقی موضعی ومحلی ایران بکەم وتنها بەعبارەت وحقائقی خوارەوە کفایەت نشان بدەم. لە ۹٤۱دا کەدەولەتی روس وانگلیس وامریکا احتلالی ایرانیان کرد. لەأستانەکانی ۳و٤و٥و ورمە.

سنه.كرماشان ئەو بيان‌نامەيە كەدرحق بەكوردەكان خرابو دائرەكانی دەولەتی دوزرايەوە.وينەی ترجمەكەی

نظر بەنهادی پيسی كورد وخيانەتكاری اثباتيەيان. راجع بەداواكردنی حقی أزادی خويان. پی‌ويستە لەهەمو لايكەوە جلەوگيری لەفكری سەربەخويەتی وانتشاری احساساتيان بكری. لەلاشەی هەر كورديك ئەو نخوشيە پيسەی قوميەتە احساس كرا ئەبی بەفوری ئەو شوينەيە ريشەكيش بكری. واحياناً لەمنطقەی نفوذی هەرفرماندەيك ئەو نخوشيە انتشار بكات. ئەو فرماندەيە برامبر بەو بەسەرهاتە خوی بەتيرەبارانی شاهنشاهی ئەبی‌نی.

رئيسی ستادی أرتشی كل شاهنشاهی

وغيری ئەم رسمياتە أشكرايە تعدايكی زور ظالمانەی‌تريان لەپيش قضيەی شهريوەر لەكوردەكان كردوە.

ايرانيەكان بو مبايعەی اسلحە ابراهيم ارفع يان-نارد بو برلين. لگل كارخانەی (كردوب) كەوتە مذاكرەی خريدی اسلحە. بەلام لەبەر سعری ناموافق لگل كارخانەی (شكودا) ريك كەوتن. كەمقابل بەخريدی اسلحەی جنگ گنم بدەن بەالمانيا. چونكە لەو وختەدا چيكوسلوفاكيا لەلاين المانياوە احتلال كرابو. فابريقە شكودا بچنگ المانيەكانەوە بو. اجا لەهەمو منطقەی كوردنشينی ايرانا نانی گەنم خواردن منع كرا. لەپيش حاصلات ودرەوا. بەاندازەيكی فضلە لەحاصلات مزرعەی گنمی فلاحەكان تخمين اكرا. ئەبوايە بەكاملی ئەو موجودە گنمەيان تسليمی بەدائرەی مخصوصی دەولەتی بكردايە مقابل بەنرخيكی فاحش. لەغيراز نانی جو وگال وزرات. بەقراری قطعی نانی گەنم بو كوردەكان قاچاغ بو. جا سيّاتی دەوری رضا شاە بەهەزاران لكی لەوەپيستر دوايی هاتوە.

وتەرزی بی نظامی دەوری محمد رضای پهلوی ديسان زور لەدەوری گزشتە متأثرتر بی‌فەرتر ئەجوليتەوە. نمونەيك لەأدابی بی نظامی دەولەتی ايران ئەوەيە كە لەخوارەوە بعرض اگەيندری. كەئەم مخابراتەيان بەتەواوی اثباتی ئەكا. كەتطبيقاتی قانونی واصولی حكومەتی مطلقا لناو حكومەتی ايرانا بەانجام ناگيندری. هەتا ايستا ئەو حكومەتە زلە هەر بەتەرزی عشائری ودرەبەگيەتی اژی طريقەی رەن وبارمتەی حيات-تفضيل ادەن بەسەرهەمو وقايەيكی شەرت وعاطفەی نهضەت وانسانی.

لەرغمی ئەو هەمو بەسەرهاتە داواری سیاسی ومدنیەتەدا. هەروکو ٢٠٠ سال پیش امرو بەنظامی بربریەت وبارمتەگری ئەژین. لەمەوپیش عرضم کردن کەلە٢٧/٤/٩٤٨دا لەمنطقەی بانە لەلاین مفرزەیکی ایرانیەوە شش نفسی عائلەم لگل بابە شیخ ناوی هنگەژالی لەحدودی دی هنگەژالی بانە اسیر کران. ولەلاین حکومەتی عراقەوە قائیمقامی هلبجە رشید صدقی مأذون کرا کەبەصفەتی قومیسری حدود درگای مخابرات لگل سلطاتی بانەدا بکاتەوە بو استردادیان. ئەو دو نوسراوەی سەرهنگی بانە لەمقابل دو احتجاجی قائیمقامی هلبجە رشید صدقیە. کە لەفارسیەوە بو کوردی ترجمە کراوە.

أغای قائیمقامی هلبجە ومرزبانی دەولەتی علیەی پادشاهی عراق

لەدوای مراسمی احترام عطفنامەی ژمارە ٧٨١ وروژی ١/٥/٩٤٨تان دائر بەاستردادی خانوادەی میرزا محمدأمین. بەهوی موافقەتنکردنی مأمورینی عراقی لگل مأمورینی دەولەتی شاهنشاهیدا بو هیچ گونە راپەراندنی کارو فرمانیك.

هەروەکو کە لەوختی خویا بەژمارە ٥٠٠ و ١٣/٢/١٣٢٧دا عرضی أغای مدیری پنجوین کراوە. کەتاقمیك لەاشراری اتباعی حمە رشیدخان لەشەوی ١٣/٢/٣٢٧دا هجومیان کردوتە سەر مخفری بیاندرەی سقز. پاسەوان محمدأمین ناویان کوشتوە و٣سی نفری کەشیان بریندار کردوە. وکچی فقی محمودی بیاندرەیان بەحجّەتی مارەبڕانی ابراهیمبگی برای حمە رشیدخان لگل محمد صدیقی برای کچەکە. وشش تفنگی حکومەتی ودو اسپ ومقداریکی زور لەکەلوپەلی أوایی هلگرتوە وهاتونەتەوە بو عراق. وغیری ئەوەش أغای میرزا محمدامین لەخاکی شاهنشاهیدا دارای سابقەیکی زورە. بناءً علیە بو استردادی اسلحە واموال ومسببینی فاعلی ئەو حرەکاتە لەمقابل استردادی عائلەی میرزا محمدامین. ایمە أمادەی تبادل واستردادین. تکایە کەبو ئەو جهتە اقداماتی فوری بأنجام بگەینن. با تجدیدی احترام

هادوی

ژمارە ٧٨٩ مرزبانی دەولەتی

شاهنشاهی

روژ ٥/٣/٣٢٧ لەبانە

سرهنگ

ژماره ٣٤٦٧

روژ ٣٢٧/٦/٣

جنابی أغای قائیمقامی حلبچه مزربانی دولت علیەی پادشاهی عراق

لپاش تقدیم مراسمی فائقه نامەی ژماره ١٢٩٠ وروژی ٩٤٨/٨/١٣ تان بو تحویلی خانوادەی میزا محمدامین لگل مقاماتی بەرزا اتصالم کردوه جواباً وام امر پیکراوه. هەتا خانوادەی فقی محمود لگل ٦ قبضه تفنگ ودو اسپ وقاتلی محمدأمین ناوی پاسەوان لگل اساسیەیی که لەأوایی بەتالان براوه تسلیمی بەایمه نکریتەوه. خانوادەی میزا محمدأمین تحویلی حکومەتی عراق نادریتەوه. جابو ئەوجهته تا زوتر خاتمه بەموضوعی باسکراو بدەن باشتره.

هادونی

رئیس مزرەبانی وپادەگانی بانه سرهنگ

جا بەسەرهاتی کوردوستانی ایران. وکردەوەی روسەکان برامبر بەمقتضای سیاسی خویان. ورەوییەی بی‌نظامی خائنانەی ایرانیەکانیش- لەهەمو نقاطیکی احساسیەوه ئەوەبو کەبعرضم‌گیاندن. ولەمولا باسی ئەو تشکیلات وکوردوستانه ئەکەین کەلە ٩١٨وه انگلیس لەسلیمانیه بو شیخ محمودی دروست کرد وهەتا امرو بوته موردی بهانه وسەرزەنشتی شیخ محمود-برامبر بەرانگرتنی تەرز ورەوتەکەی. ئەو کتیبه لەوثائقی خوارەوه وەرگیراوه-

١-لەمشاهداتی شخصی واشتراکی هیندی اموری فعلی هەتا ٩٥٢

٢-مخابراتی بینی ستادی لشکری قاضی محمد لگل فرماندەکان وستادی کلدا.

٣-جرائدی أسیاه گروه اطلاعات- صدای مردم-ایرانی ما-خواندینها-له ٩٤٥هەتا ٩٤٧

٤-مجلەی أرتشی ایران-نخشەهای أرتش ٩٤٦

٥-گزارشاتی سالیانەی پاریس له ٩٤٤وه هەتا ٩٤٦

٦-أرتشی ایران ازکوههای باختر ٩٤٢

٧-روژنامەی کوردوستان لەژماره ١-وه هەتا ١١٢

٨-مذکراتی هتلر ١٩٤٨-مطبعة الاعتماد-د.تقی‌الدین هلال ٩٤٨

٩-مقدرات العراق السياسية ١٩٢٥

١٠-قضية العراق-بلو جو شيركو ٩٣٢

١١-تكوين العراق ١٩٣٥

١٢-خلاصەی قضيەی كورد لەعصبت الامم ١٩٣٤

١٣-مذكراتی موسبيل ٩٤٩

١٤-اوروپا الحديثة ١٩٣٥

١٥-كوردو كوردستان واماراتی كورد ٩٤٥-٩٣١

١٦-مذكرات القادری ١٩٢٣

١٧-المصور ٩٤٩

١٨-لەمختلفی جرائد ومطبوعاتی عالەمیەوە استنباط كراوە. بە علاوەی هيندی استفساری وقائعی كەلەاشخاصی ذوی خبرة وەرگيراوە. وبەتأيدەوە قبولمان كردوە.

١٩حقائق التأريخ فی الحرب الآوروبية العمومية ١٩٢٧

٢٠-مذكراتی لورانس ١٩٥٠

٢١-مذاكراتی رضا شا

٢٢-أزمهابادی خونين تا كرانهايی أرس چاپی تهران ١٣٢٨ أزەری

٢٣-شيخ محمود وكوردوستانی سليمانی اسراری بارزانيها

ئەو کتێب و بڵاوکراوانەی وەزارەتی رۆشنبیری لە ساڵی ١٩٩٩ داچاپی کردوون و هاوکاری کردوون

| ژ | ناوی کتێب | ناوی خاوەن کتێب | جۆری کتێب | جۆری چاپ |
|---|---|---|---|---|
| ١ | سێدارەکانی بەهەشت | قوبادی جەلی زادە | هۆنراوە | چاپکردن |
| ٢ | کورژنی خوێن | غەفور ساڵح | رۆمان | چاپکردن |
| ٣ | مەرگی سوشاب | عەلی کەریم | شانۆیی | چاپکردن |
| ٤ | بەسەرهاتی کەڵەپیاوێك | وەرگێرانی حسێن عوسمان نێرگزەجاری | رۆمان | چاپکردن |
| ٥ | مێژووی هۆزی جاف | حەسەن فەهمی جاف | مێژوویی | چاپکردن |
| ٦ | ژوورەکەی دەلیا | ئاکۆ کەریم مەعروف | کورتە چیرۆك | چاپکردن |
| ٧ | سەرەتایەکی زمان ناسی | میدیا | زمانەوانی | چاپکردن |
| ٨ | بیبلۆگرافیای کورد وکوردستان | ئەکرەم قەرەداخی | رۆژنامەگەری | چاپکردن |
| ٩ | کورد | و . د. عیزەدین مستەفا رەسول | مێژوویی | چاپکردن |
| ١٠ | نامیلکەی چالاکیەکانی وەزارەتی رۆشنبیری بۆ ساڵی ١٩٩٩ | ئامادەکردنی فەرید زامدار | رۆژنامەگەری | چاپکردن |
| ١١ | حەپسەخانی نەقیب | پەخشان جەلال حەفید | مێژوویی | چاپکردن |
| ١٢ | وتنەوەی بیرکاری پۆلی یەکەم و دووەمی سەرەتایی | عەلی ئەحمەد | زانستی پەروەردەیی | چاپکردن |
| ١٣ | ئینسکلۆپیدیای کیمیا | جەمال عەبدول | زانستی | چاپکردن |
| ١٤ | کورتەجوگرافیای کوردستان | کەریم زەند | جوگرافیا | چاپکردن |
| ١٥ | دەفرە فڕیوەکان چین لەکوێوە هاتوون | ساڵح محەمەد | زانستی | چاپکردن |
| ١٦ | مردووەکان بنێژن | و.یاسین بەرزنجی | شانۆگەری | چاپکردن |
| ١٧ | میرزا مارف | ئومێد ئاشنا | ژیان و بەرهەمەکانی | چاپکردن |
| ١٨ | هاواری دڵ | بوار نورەدین | مەزهەری خالقی | چاپکردن |
| ١٩ | بابەتەکانی پەروەردەی نوێ | فواد قەرەداخی | پەروەردەیی | هاوکاری |
| ٢٠ | وێنەکەی خوشکت | رۆوف حسن | کورتە چیرۆك | چاپ کردن |
| ٢١ | کلوە بەفرەکانی خۆر | هوشیار بەرزنجی | هۆنراوە | یارمەتی |
| ٢٢ | گوناهەکانی بەفرو سێبەر | محەمەد کاکە رەش | هۆنراوە | چاپ کردن |
| ٢٣ | گوێرایەڵی بۆ | و. حەسەن عبدالکریم | چیرۆکی منداڵان | چاپ کردن |

| ژ | ناوی کتێب | ناوی خاوەن کتێب | جۆری کتێب | جۆری چاپ |
|---|---|---|---|---|
| | ئامۆژگاریەکانی دایەو بابە | خانەی منداڵان<br>ب.گ.رۆشنبیری و هونەر | | |
| ٢٤ | گوێ درێژ و پاشا | و.لەتیف هەڵمەت<br>خانەی منداڵان<br>ب.گ.رۆشنبیری و هونەر | چیرۆکی منداڵان | چاپ کردن |
| ٢٥ | جوان وچۆلەکەکان | و.نوری سەعید قادر<br>خانەی منداڵان<br>ب.گ.رۆشنبیری و هونەر | چیرۆکیمنداڵان | چاپ کردن |
| ٢٦ | گێڕاوی پۆڵەندە | و.بورهان قانع | مێژوویی | چاپکردن |
| ٢٧ | گۆڤاری دایەلۆك | ژمارە(٤) ی گۆڤار | رۆژنامەگەری | هاوکاری |
| ٢٨ | گۆڤاری شانۆ | ژمارە(٩) ی گۆڤار | رۆژنامەگەری | هاوکاری |
| ٢٩ | گۆڤاری ئاران | گۆڤار | رۆژنامەگەری | هاوکاری |
| ٣٠ | دیاریەك بۆ یادی سەدویەك ساڵەی رۆژنامەگەری کورد | ئامادەکردنی ئومێد ئاشنا | رۆژنامەگەری | هاوکاری |
| ٣١ | کۆمەڵزانیو کورد | فۆاد گاهر صادق | کۆمەلایەتی | چاپکردن |
| ٣٢ | باخچە رەژووەکانی حەقیقەت | شازین هێرش | هۆنراوە | چاپکردن |
| ٣٣ | ئاوییەر | صدیق بۆرەکەیی | هۆنراوە | چاپکردن |
| ٣٤ | هەناسەیەك لە تەنهاییدا | بەناز کوێستانی | پەخشان | چاپکردن |
| ٣٥ | دیوانی رەمزی مەلا مارف | رەمزی مەلا مارف | هۆنراوە | چاپکردن |
| ٣٦ | حەپسەخانی نەقیب لە ئاوێنەی مێژوودا | رۆوف عیمان | مێژوویی | چاپکردن |
| ٣٧ | چارە نووس | صابرگرد عازەبانی | رۆمان | چاپکردن |
| ٣٨ | مدن کوردیە قدیمە | مەلا جەمیل رۆژ بەیانی | مێژوویی | چاپکردن |
| ٣٩ | خۆزگەکانی بەرد هەڵکەنێك | ئا : جمال عارف امین<br>ب . رۆشنبیری وهونەر | چیرۆکی مناڵان | چاپکردن |

## ئەوکتێب و بڵاوکراوانەی وەزارەتی رۆشنبیری لە ساڵی ٢٠٠٠ دا چاپی کردوون و هاوکاری کردوون

| ژ | ناوی کتێب | ناوی خاوەن کتێب | جۆری کتێب | جۆری چاپ |
|---|---|---|---|---|
| ١ | مناڵ و شیعر | محمد کەساس | هۆنراوە | چاپکردن |
| ٢ | رۆژنامەگەری | و . مجید صالح | رۆژنامەگەری | چاپکردن |
| ٣ | ئافرەت لەمۆسیقاو گۆرانی کوردیدا | سەردار خدر حسین | کۆمەلایەتی | چاپکردن |
| ٤ | ئۆزدەمیروکورد | ئەحمەد باوەر | مێژوویی | چاپکردن |

| ٥ | دەچڵ نێرگز | محمد رحيم رمچان | چيرۆكي منالآن | چاپكردن |
|---|---|---|---|---|
| ٦ | مێژووی کتێبخانەکانی سلێمانی | مارف ناسراو | مێژوویی | چاپكردن |
| ٧ | شايەت | و ، ئاشتی عوسمان دانش | شانۆيی | چاپكردن |
| ٨ | هەقتەبزانی | و . شێرزاد حسن | رۆژنامەگەری | چاپكردن |
| ٩ | چەند گیروگرفت ودیمەنێکی دەروونی | و . جلال خلف ژاڵەيی | زانستی | چاپكردن |
| ١٠ | فەرهەنگی زەوی زانی وێنەدار | كمال جلال غريب | فەرهەنگی زانستی | چاپكردن |
| ١١ | لەبازنەی شانۆدا | عەلی کەریم | شانۆيی | چاپكردن |
| ١٢ | بووژاندنەوەی رۆشنبیری ونەتەوەیی‌ی‌کورد | و . صدیق صالح | مێژوویی | چاپكردن |
| ١٣ | چەند بابەتێك دەربارەی کەلتووری نەتەوەی کورد | سەلام مەنمی | کەلتوری | چاپكردن |
| ١٤ | مەرگی وەنەوشە | ياسين قادر بەرزنجی | چيرۆكی رۆژنامەنووسی | هاوكاری |
| ١٥ | زوبدەی عەقیدە | مەولەوی | شیعر | چاپكردن |
| ١٦ | گۆڤاری شەهید | بنکەی شەهید رێباز | گۆڤار | هاوكاری |
| ١٧ | گۆڤاری پەلکە زێرینە | بنکەی ئەدەبی منالان | گۆڤاری منالآن | هاوكاری |
| ١٨ | گۆڤاری دیلانێ | مناڵیارێزی بەریتانی | گۆڤاری منالآن | هاوكاری |
| ١٩ | خونچە گوڵ | عوسمان هەورامی | شیعری مندالآن | چاپكردن |
| ٢٠ | سەمای لاولاو | ئەژی گۆران | هۆنراوە | چاپكردن |
| ٢١ | گۆرستانی ئەپیکۆرۆس | هاشم سەراج | هۆنراوە | چاپكردن |
| ٢٢ | ماچی باران و خاك سروەو پەیامی کوردایەتی | ئەحمەد هیرانی | هۆنراوە | چاپكردن |
| ٢٣ | شۆرشی ئاگری داغ | کاوە بەیات | مێژوویی | چاپكردن |
| ٢٤ | ورچی میهرەبان | حسەین ی نەجاتی | چيرۆكی منالآن | چاپكردن |
| ٢٥ | رێبەندان | تەها ئەحمەد رەسووڵ | رۆمان | چاپكردن |
| ٢٦ | قوتابیەکی تەمەڵ | سۆران حەمەد | چيرۆكی منالآن | چاپكردن |
| ٢٧ | جولەکەکانی کوردستان | ئەحمەد باوەر | کۆمەڵایەتی | چاپكردن |
| ٢٨ | عندما تتكلم الارقام | الشيخ عطا الطالباني | سیاسی | چاپكردن |
| ٢٩ | نەخۆشییە دەروونییەکان و دەروون لەشییەکان (سایکۆسۆماتی) یەکان | محەمەد کەریم شەیدا | زانستی | چاپكردن |

| ٣٠ | هۆنراوەو چیرۆکی فولکلۆریی کوردەواری | محەمەد حەمە صالح تۆفیق | فولکلۆری | چاپکردن |
|---|---|---|---|---|
| ٣١ | رۆي كردية بكلمات عربية | ستران عبدالله | سیاسی | چاپکردن |
| ٣٢ | ئەجلیکا | و.جەمال جامی | کورتە چیرۆك | چاپکردن |
| ٣٣ | قەفەزی زێرین | و. یاسین قادر بەرزنجی | چیرۆکی منالان | چاپکردن |
| ٣٤ | میهرەجانی مەولەوی | وەزارەتی رۆشنبیری | بابەتەکانی میهرەجان | چاپکردن |
| ٣٥ | دەروێشەکان بەدوای راستی‌دا دەگەرێن | و. مەحمود مەلا عزەت | شانۆگەری | چاپکردن |
| ٣٦ | شتە سەیرەکان | و. نوری سەعید قادر | چیرۆکی مندالان | چاپکردن |
| ٣٧ | گۆڤاری هەزارمێرد | وەزارەتی رۆشنبیری | شوێنەوار | چاپکردن |
| ٣٨ | پەیامبەرو کلاو | و. خەبات عمر | شانۆگەری | چاپکردن |
| ٣٩ | گۆڤاری ئاران | | گۆڤار | هاوکاری |
| ٤٠ | رۆژنامەی بەدرخان | | رۆژنامە | هاوکاری |
| ٤١ | گریانی گوڵە غەریبەکانی دۆزەخ | جوان هیدایەت فارس | کورتە چیرۆك | چاپکردن |

## ئەوکتێب و بڵاوکراوانەی وەزارەتی رۆشنبیری لە ساڵی ٢٠٠١ دا چاپی کردوون و هاوکاری کردوون

| ژ | ناوی کتێب | ناوی خاوەن کتێب | جۆری کتێب | جۆری چاپ |
|---|---|---|---|---|
| ١ | گـوڵفـرۆش | جەزا عەلی ئەمین | چیرۆکی منالان | چاپکردن |
| ٢ | بنەما تیۆرییەکانی جوگرافیای عەسکەری کوردستانی باشوور | خـەبات عـەبدوڵا | جوگرافیای عسکەری | چـاپـکـردن |
| ٣ | کاریگەری کەلتوری ئەوان لەسەر کورد | عەتا قەرەداغی | لێکۆڵینەوە | چاپکردن |
| ٤ | سێ رۆژنامەی سەردەمی شێخی نەمر | ئا. رەفیق سالح | رۆژنامەگەری | چاپکردن |
| ٥ | رابەری رۆژنامەگەری نهێنی کوردی | ئەوزاد عەلی ئەحمەد | رۆنامەگەری | چاپکردن |
| ٦ | پلاتۆنۆڤە شێت | و. هیمدادی حسین | شانۆگەری | چاپکردن |
| ٧ | کوردی تورکیا | و. جەلال تەقی | مێژوو | چاپکردن |



## ئەم بەرهەمەی میرزا مەنگوڕی

بایەخی بەرهەمەکە هەرلەوەدا نییە کەچەند لاپەڕەیەکی شاردراوەی مێژووی سەردەمێکی زێڕین لەژیانی سیاسیی کوردو دەسەڵاتی خۆمالیی جەمهوریەتی کوردستانە کەمیرزا مەنگوڕی تۆماریکردو نەیهێشت وەك زۆرێتر لەو بیرەوەریی‌و زانیارییانە بکەونە ناو بازنەی لەبیرچوونەوەوە، بەڵکو گرنگتر لەوانە ئەوەیە کەوا میرزا هەروا بەڕاگوزاریی ڕووداوەکانی تۆمار نەکردووە، هەروا ڕوخساری کۆمەڵگەکەو گۆڕانە ڕوکەشەکانی نەبینیوە، بەڵکو باسە گرنگەکانی ناوهەناوی گۆڕان‌و ناکۆکییەکانی کۆمەڵی کوردەواریی‌و دەزگاکانی کۆمارو ڕەفتاری نائاسایی هەندێ ناوەندی دەسەڵاتی بەسەرکردۆتەوە، ئەو لایەنانەی خستۆتە بەر ڕووناکیی کەمەگەر هەر لێکۆڵەر بایەخەکانیان بزانێت.

لە بڵاوکراوەکانی وەزارەتی ڕۆشنبیری

نرخی (١٠) دینارە